زنجیره کتێبی زانست و مرۆڤ (4)







# ژینگەزانی

لە سایەی قورئان و فەرموودە و زانستدا



محەمەد حەسەن سەرگەینێلی

یەکەم چاپ ٢٠١٥

زنجیرە کتێبی زانست و مرۆڤ

(٤)

# ژینگەزانی لە سایەی قورئان و فەرموودەو زانست دا





ناسنامەی کتێب

نـــــاو : ژینگە زانی لەسایەی قورئان و زانست و فەرموودەدا.

نووسینی: محمد حسن سەرگەینێڵی.

بڵاوکار: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی – هەولێر.

چـــــاپ : یەکەم چاپ.

ساڵی چاپ: ٢٠١٥ز.



کتێبخانەی

**حاجی قادری کۆیی**

دیزاین - چاپکردن - بڵاوکردنەوە

٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨

٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧

عێراق - کوردستان - هەولێر





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن ( ١٣٠ )ی ساڵی ( ٢٠١٥ )ی پێدراوە



07504671394

mdmaktaba@gmail.com

زنجیرە کتێبی زانست و مرۆڤ (٤)

# ژینگەزانی لە سایەی قورئان و فەرموودەو زانست دا

زیاتر لە (٨٠) ئیعجازی ژینگەزانی تێدایە

کتێبەکی ئیعجازی زانستی ئەکادیمیە

محەمەد حەسەن سەرگەینێلی

پێداچوونەوەی : زێوەر أنور

٢٠١٥ز

## پێشـــــــــەكی

﴿ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ الأعراف: ٥٦ دوای تەواو كردنی زنجیرە ئیعجازی (گەردوونناسی) و (زەوی ناسی) و (گەردیلە ناسی) بە پێویستم زانی نوكی قەڵەم بخەمە سەر باسی (ژینگەزانی) لە سایەی قورئان و فەرموودەدا، ئەویش لەبەر چەند هۆكارێك :

١. ژینگەزانی (علـــم البیئـــة) ئیمرۆ لەناوەنـدەكانی خوێنـدن و ڕاگەیاندنـدا جێگایـەكی تایبـەتی بـۆ خـۆی دیـاری كـردووە و زۆر لقـی لێ دەبێتـەوە ، وەكـو پەروەردەی ژینگەیی و جیۆلۆجیای ژینگەو ژینگەی ڕووەكی و ئاژەڵی و هیتر .

٢. پیسبوونی ژینگە كێشەیەكی جیهانییەو مەترسی گەرمبوونی زەوی و كونبـوونی چینی ئۆزۆن و بە بیابابوونی زەوی بۆتە جێگای گرنگی پێدان لەچاخی تـازەدا ، بیری مرۆڤی سەرقاڵ كردووەو نیشانەیەكی ئاخیر زەمانە .

٣. پێویست بـوون بـە ڕۆشـنبیری ژینگەپاراسـتن و پـەروەردەی ژینگـەیی كـە تـاكی كوردی لێی بێ ئاگایە ، كەچی بەرپرسیارییەكی گەورەیە بەسـەر شـانی ئـەوان و مرۆڤایەتی .

٤. لەسەردەمی حیزبی بەعسدا كوردستان بەرەو ڕووی وێرانكردن و كاول كردن دێ و چـەكی كیمیـایی و چـەكی قەدەغـەكراوی تێدا بـەكارهات ، ئەمـەش مەترسـی پیسبوونی ژینگەیی زیاتر كرد لە كوردستان دا.

٥. خەڵكی كوردستان دوای ڕژێمی بەعس بەهۆی كەمی سووتەمەنی و گرانـی ، دارو درەختێكی زۆری بڕی و ئێستاش بەردەوام خەڵكی بەهۆی كەمی سووتەمەنی دار دەبڕن بە تایبەتی لەلادێكان دا.

٦. ڕاو كردنی گیاندارانی كێوی لە چیاكان و ئاوەكانـدا بـێ سنوور بەردەوامـە ، بـێ ئەوەی ڕاو كردن قەدەغە بكرێ و هەوڵبدرێ بۆ پاراستنی سامانی ئاژەڵی كێوی و زیادكردن و پەرەپێدانیان.

٧. سەیرانەکان زۆربوون خەڵکی کەرستەی پیس و نایلۆن و فتو و شتی تر فڕێ دەدەنە ناو خاك و ئاوەوە ، ئەمەش زیاتر ئاو و خاك پیس دەکات .
٨. هۆکارەکانی پیس کردن زۆربوون لە پاشەڕۆ و پەین و دەرمانی قەلاچۆکردنی بژارو دەنگە دەنگ و هاژەی زۆرو ...هتد .
٩. ئیسلام یاسای ژیانە بۆ چالاککردنی تاك و کۆمەڵگا هاتووە ، ڕەحمەتە بۆ جیهان ، بۆیە قورئان و سوننەت بەر لە زانستی نوێ ئاماژەی بە گرنگی و پەروەردەی ژینگەیی کردووەو زەنگی مەترسی پێداوە بۆ پیس کردنی ژینگەو ئاکامە خراپەکانی ، پێمان دەفەرمووێ ﴿ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ﴾ الأعراف: ٥٦، واتە : زەوی پیس و خراپ مەکەن دوای چاککردنی ، واتە خوداوەند زەوی و ئاسمانی بە پاکژی تەسلیم کردوون و هاوسەنگی بۆ داناون ، نەکەن ئێوە ئەو هاوسەنگییە تێك بدەن و ژیان بخەنە مەترسییەوە ، ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ قورئان گەر بیر بکەنەوە !
١٠. ئێستا کۆمپانیاکانی نەوت دۆزینەوە لە کوردستاندا زۆر بووە ، ئەمەش مەترسی گەورە بۆ سەر ژینگە پەیدا دەکەن.

لەبەر ئەم هۆیانەو چەندان هۆی تر بەمەبەستی ڕێنومابوون بۆ ڕۆشنبیری ژینگەیی لە سایەی قورئان و سوننەت و زانستدا پەنامان بردە بەر نووسینی ئەم بابەتە گرنگەو مەترسییەکانی ژینگەمان خستە ڕوو ، وەکو ئەرکێکی ئایینی و نیشتمانی بەو هیوایەین گەلی کوردستان بە حکومەت و جەماوەرەوە بە گرنگی ئاوڕێ لەو مەترسییانە بدەنەوە ، هەوڵ بدەن کوردستان ( کە بەهەشتی ئادەم و نوح بووە) لە زەویدا زیاتر ئاوەدانی بکەنەوە بە باخچەو گوڵ و دارستان ، خاك و ئاوی لە کەرستە زیانبەخشەکان بپارێزن ، هەروەها هەوای کوردستان دووربخەنەوە لە گازە زیانبەخشەکان وەك لێرەدا باسیان دەکەین بۆ پاراستنی خۆمان و گیاندارانمان و باخچەو ڕووەکەکانمان .

هیوادارم ئەم کتێبە ڕێنووبەخشێ بێ بۆ گەلی کوردستانم بە حکومەت و گەلەوە ، هەوڵ بدەین دۆخی هاوسەنگی سروشتی بۆ کوردستان بگێڕینەوە ، چونکە تا هاوسەنگی ژینگە دروست نەبێ هاوسەنگی دەروونی و هزری و جەستەیی بۆ خودی ئێمە دروست نابێت و تەندروستی خۆمان بەرەو ئاقارێکی مەترسیدار دەبەین.

بۆ نووسینی ئەم بابەتەش پەنامان بردە بەر قورئان و سوننەت و چەندان کتێبی ژینگەیی زانستی و لە ئاستێکی بەرزدا خستوومانە بەردەم خوێنەران و مامۆستایان و قوتابیان و نەویندارانی ئیعجازی قورئان و سوننەت ، هیواداریـن توانیبمان خوداو ئێوە ڕازی بکەین و لە ئاستی ئێوەدا بێت و لێمان وەربگرن و دوعای خێرمان بۆ بکەن .

٢٠١٠/٤/١٦ چیوەی سەروو

لە یادی کیمیابارانکردنی بالیسان و ڕۆژی ژینگە لەکوردستان دا

**ئیعجازی (١)**

**ژینگە (البیئە/Ecology) چی یە؟!**

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ البقـــــرة: ٣٠ ، واتە : کاتێ پەروەردگارت ( بەسرووش) بەفریشتەکانی فەرموو : من جێنشینێ لە زەوی دا دروست دەکەم ، وتیان : ئایا کەسێکی تێدا دروست دەکەی کاولکاری و خراپەی تێدا بکات و خوێنی تێدا بڕێژێ ، ئێمە بە سوپاسەوە تۆ پاکژ ڕادەگرین و پیرۆزت ڕادەگرین ، فەرمووی : ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

ئاشکرایە ژینگە (البیئة) لە ئادەمەوە تا ئێستا گرنگترین شت بووە مرۆڤی سەرقاڵ کردووە ، هەتا فریشتەکانیش ، دیارە ژینگە ئەو دەوروبەرەیە کە مرۆڤ تێیدا دەژی و سەرچاوەی ژیانی خۆی و مانەوەی تێدا بەدەست دێنێت ، بەو واتایەی مرۆڤ لەزەویدا گەورەترین هێزە لە گیاندارانداو خوداوەند هەرچی لەزەویدایە لە خزمەت پێویستییەکانی ئەودا دایناوە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی ژیانی ، بەو مەرجەی بەشێوەیەکی باش بەکاریان بێنێت ، هاوسەنگییان تێك نەدات .

﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَـٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَـٰمِكُمْ ﴿٣٣﴾﴾ النازعات: ٣٠ - ٣٣، واتە : پاشان خوا زەوی لە شێوەی هێلکەییدا داڕشت ، ئاو و لەوەڕی لێ دەرهێنا ، چیاکانی لەنگەر پێ گرت بۆ سوودی ئێوەو ئاژەڵەکانتان.

لێرەدا قورئان ئاماژە بە سەرەتای زەوی دەکات و گەلێك زانستی جیۆلۆجی و ژینگەیی تێدا دەخاتە ڕوو ، وەك لە قسەکانی (ئەلك سمث) دا هاتووە ، زەوی لەناو گروپەکەیدا خاوەن شانسە ، ئەو بە مام ناوەند بەدەوری خۆیدا سوڕ دەخوات و شەو و ڕۆژەکانی

کورتن تا مام ناوەندی لەگەرمی دا دروست بکات ، دیسان چڕی زەوی و شوێنی لەخۆرەوە وای لێ کردووە بەرگە هەوایەکەی بپارێزێ و پلەی گەرمی مام ناوەند تر بێ و بوار نەدات لە خۆرەوە تیشکە زیانبەخشەکان توخنی زەوی بکەون ، فشارێکی هەوایی لەباری ڕەخساندووە بۆ پاراستنی ئاو لەزەوی دا لەدۆخی شلەیدا ، بەرگە هەوای لەباری رەخساندووە بۆ پاراستنی ئاو لەزەوی دا لە دۆخی شلەیی دا ، بەرگە هەواو ئاو سەرچاوەی ژیانن لەزەوی دا ، دووره لەهەسارەی تری کۆمەڵەی خۆرماندا ژیانی تر هەبێ بەهۆی زۆری هایدرۆجین لە بەرگە هەوای هەسارەکانی دەرەکی داو زۆر گەرمی هەسارەکانی ناوەوەدا.

دەنووسێ : بەرگە هەوای سەرەتایی زۆر جیابووە لە ئێستا ، ئۆکسجین ئەوەندە زۆر نەبووە ، لەکاتی زۆر بوونی ڕووەکدا بەر لە (٢٠٠٠) ملیۆن ساڵدا ڕووەکەکان ئۆکسجینی زۆریان بەرهەم هێنا ، ئەو ڕووەکانە تیشکی خۆریان قۆرغ کرد بۆ تێك شکاندنی (دووەم ئۆکسیدی کاربوون) و بەرەلاکردنی (ئۆکسجین) [١]، بەم شێوە دەبینین ژینگە یان دەوروبەر سیستەمێکی ئالۆزە ژیانی کۆمەڵگای تێدا دروست دەبێ و بێ وەستان گەشە دەکات ، مرۆڤ و گیاندار و ڕووەك کە لەزەویدا گەشە دەکەن هەموویان دەکەونە بەر کاریگەرییەکانی ژینگەو ئەوانیش کار لە ژینگە دەکەن و کارو کاردانەوە پەیدا دەبێت ، بەمەش چەند یاسایەکی پەیوەندی لە هەردوولا پەیدا دەبێت.

ئەوەی ئەو پەیوەندییانە تێك دەدات و سیستەمی هاوسەنگی لاسەنگ دەکات مرۆڤە وەکو خوا فەرموویەتی ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ ﴾ الروم ٤١ چونکە مرۆڤ چالاکی ئابووری فراوان دەکات و زۆربوونی وزەو پیشەسازی و کشتوکاڵ و کیمیاو بەشەکانی تری ئابوری و زانستی پراکتیکی ، واتە زیادبوونی پێویستیەکانی بۆ مرۆڤ و زیاتر بەکارهێنانی کەرستە سروشتییەکان ، ئەگەر ئەو

---

[١] علم الارض / الك سمث / ت : فارس لطفي الخوري / ل : (١٢-١٤) سەیر بکە.

کەرستانە بە ژیری و هاوسەنگی فۆرغ نەکرێن ناکۆکی ترسناك لەنێوان مرۆڤ و ژینگەدا دروست دەبێت ، بۆیە مرۆڤی سەردەم ئەرکە بەسەریەوە چەند هۆکارو ئامێری زۆر دەخاتە بەرهەم بۆ فۆرغ کردنی کەرستە سروشتییەکان بۆ ئابووری و ژیانی کۆمەڵگا دەبێ هەندەش هەوڵ بدات بۆ دەستەبەرکردنی پاراستنی ژینگە ، تا بتوانین وەچە لەدوای وەچە لەگەڵ ژینگە خۆ ڕابێنین، هەرچەندە زۆر گۆڕانی بەسەردا بێت ، بەو پێ یە زانستی تەکنەلۆجی بەشێکی زۆر ئەرکی پاراستنی ژینگە پارێزی دەکەوێتە سەر ، پاشان زانستی پزیشکی و بایۆلۆجی و کۆمەڵایەتی ، تا ژیان نەکەوێتە مەترسییەوەو وەچەکانی داهاتووش تاوانبارمان نەکەن.

## ژینگە چی یە ؟؟؟

(ام هولی) و هاوڕێکانی دەنوسن : (ڕێکخراوی یونسکۆ)ی سەر بە وڵاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٦٧ دا پێناسەی مامۆستای نەرویجی (س . ویك) بۆ ژینگە هەڵدەبژێرن، کە دەڵێ : (ئەو بەشەی جیهانە مرۆڤ بەکاری دێنێ و فۆرغی دەکات و کاری تێ دەکات و بۆی دەگونجێت) .

(ك . بوجك) دەڵێ : (ژینگە چەند ئاکامێکی لە مێژیینەی پەیوەندی نێوان سروشت و مرۆڤ و پەیوەندی مرۆڤە بە مرۆڤەوە).

(أ . بیلوش) دەڵێ : (ژینگە یەکەیەکی چونیەکە لە جیهانی ماددی و مرۆڤ ، کە لەم ناوەندەدا دەژی و لەڕێگای کارکردن دەیگۆڕێ ، ڕۆژانە بێ وەستان بەتەواوی قۆناغەکانی ژیانیدا گەشەی پێ دەدات[٢])

زانای ئینگلیزی (بیلنگر) لە ساڵی (١٩٧٠)دا وتی : ( ژینگە هەوڵ دانە بۆ حاڵی بوون لە پەیوەندی نێوان ڕووەك و گیاندار و ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژین.

---

[٢] الانسان و البیئة / ام هولي / جي رجیها / جی سلادك / و: عصام عبداللطیف / ل : (١٠) (١١) سەیر بکە

ئەو زانستەی لە ژینگە دەکۆڵێتەوە بە ژینگەزانی (علم البيئة – Ecology) ناسراوە ، ئەو وشەیە لە زمانی عەرەبیدا بە (علم البيئة) مانا کراوە ، ئەم وشەیە زانای ئەڵمانی (هیکل Haeckel) لە ساڵی (١٨٦٦)دا دایهێنا و لە بنەڕەتدا دوو وشەی یۆنانی یە : (oaks) واتە : جێگاو شوێنی حەوانەوە لەگەڵ وشەی (logos) واتە : زانست لێکی دان ، واتە (ئەو زانستەیە پەیوەندی گیانداران بەو ناوەندەوە تێ یدا دەژی لێ ی دەکۆڵێتەوە ، گرنگی بە زیندەوەران و خواردنیان و ڕێگای ژیانیان و بوونیان لە شێوەی چەند مۆڵگەیەکدا ، یان چەند گەل و هۆزێکدا ، پاشان لەو هۆیانەش دەکۆڵێتەوە کە نازیندەکین ، وەکو خاسیەتەکانی (ئاو و هەواو کەش و گەرمی و شێداری و تیشکەکان و گازەکانی ئاو و هەوا)و خاسیەتە کیمیاوییەکان و فیزیاییەکانی زەوی و ئاو و هەوا.

ژینگە (دەوروبەر)ی مرۆڤ ئەو چوارچێوەیە تێیدا دەژی لە خاك و هەوا پێك دێت ، بە پێکهاتەکانیان و توخمەکانیان و زیندەوەرانیانەوە ، بەجۆرەها کەش و هەواو ئاو و باو باران و هێزی کێشکردن و موگناتیسییەوە ... هتد، وە پەیوەندی نێوان ئەو توخمانەوە).

کەواتە : ژینگە بە زمانی هاوچەرخ بریتییە لە تەواوی پێکهاتە سروشتییەکان و هەل و مەرجەکان و ئەو هۆکارانەی زیندەوەران لەناویدا دەژین ، زانایان هاوڕان ژینگە هەمو توخمە سروشتی و زیندەگییەکان دەگرێتەوە لەسەرو ناخی زەویدا ، بە بەرگە هەواو چاوگی سروشتی و وزەو بەرگە هەواو پێکهاتەکانی ناویانەوە ، سەر ڕووی زەوی بە ڕووەك و گیاندارەوە ، مرۆڤ بە کۆمەڵگاکانیەوە هەموو ئەوانە پێك هاتەی ژینگەن[٣].

[٣] التربية و البيئة / د.عادل مشعان ربيع / د.هادي شعبان / ل ٩- ١٠

بێگومـان ئیسلام ، کـه دوا پـەیامی خودایـه بـۆ چاککردنی تـاك و کۆمـەڵگاو ژینگـه هاتووه ، ڕەحمەتە بـۆ مـرۆڤ و گیانـداران و ڕووەك و تەنـەکان لـه وشکانی و دەریـاو هەوادا وەکو خوا فەرموویەتی (وما أرسلناك الا رحمة للعالمين ) (الانبيا ١٠٧)

چۆن ئیسلام گەورەترین پەیامە پێغەمبەرەکەشی سەرداری پێغەمبەرانـه ، وەکـو لـه فەرموودەی (صحیح)دا هاتووه (انا قائد المرسلين ولا فخر وانا خاتم النبيين ولا فخر) (رواه الدارمي اسناده حسن في الجامع الصغير) یـان : (انا سيد ولد ادم يوم القيامة ولا فخر) (رواه مسلم وابو داود)

پاشان گەلەکەشی باشترین گەلە، قورئان فەرموویەتی: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران: ١١٠.

هەموو ئەو ڕاستیانە ئەوە دەخـوازن دەبـێ مـرۆڤ ئـامرازێکی بەسـوودبێ بـۆ ئـاوەدان کردنەوەی ژیان و پێشخستنی ژیان ، ساغی ژینگە لە ملی مرۆڤە بۆ بەرژەوەندی ئەوە ، چونکە هەرچی لەگەردووندایـە لـە خزمـەت ئـەو دایـەو بـۆ سـوودی ئـەوە ، بۆیـە **قورئان بەر لە زانستی نوێ ژینگە بە زەوی و ئاو و هەواو گیانـداران و ڕووەکـەکان و زەوی و پێکهاتەکانیان وەسف دەکات.**

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية: ١٣ واتە : هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بۆمان خستوونەتە ژێردەست .

کەواتـە دەبـێ مـرۆڤ لـە بەرامبـەر ئـەو بـەهرە بـێ شـومارانەدا سوپاسـگوزار بـێ و بیانپارێزێ تا سوودەکان بەردەوام ببن و تێکیان نەدات و نەیانشێوێنێت و جوانی و وردەکاری و هاوسەنگی ژینگە پیس نـەکات وەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ الجاثية

[12] واته: خودا دەریای بۆ ڕام کردووون بە فەرمانی ئەو کەشتی تێدا بڕوات و زێدە چاکەو بەهرەکانی ئەو بەدەست بێنن و سوپاسگوزاری بکەن .

لێرەدا قورئان ئاماژە بە مەترسی پیس بوونی ژینگە دەکات لە ئاسمان و زەویدا لە وشکانی و دەریادا ، مادام مرۆڤ دەستی کاولکاری تێ بخات و بەخراپی مامەڵە لەگەڵ بەهرە خواییەکاندا بکات.

## ئیعجازی ( ٢ - ٣ - ٤ )

بۆ ماوەو ، ژینگەی منداڵدانو ، ژینگەی شارستانی کەسایەتی مرۆڤ دروست دەکەن:

سروشت و کەسایەتی مرۆڤ کار لێکردوی سێ سیستەمی زۆر ئاڵۆزە ، بریتین لە بەرهەمەکانی بۆ ماوە ، کە جینەکانی تۆوی دایك و باوك و ژینگەی شارستانی پێك دێت.

بۆ ماوە (الوراثة) بریتیە لە گوزرەیەکی کیمایی بەناوی جینەکان یان (الامشاج) کە لە تۆوی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەت دوای پیتان دەگوازرێتەوەو کۆرپەلە دروست دەکەن.

جینەکان (الامشاج) چەند گەردێکی پرۆتینن توانای زۆربوونیان هەیە ، تیرەیان (٤ — ٥٠) میلی میکرون دەبێت ، واتە ( ١: ٢٥٠٠٠٠ یان ٢٠٠٠٠) ملم دەبێت ، هەر کرۆمۆسۆمە (الصبغات)یش (١٢٥٠) جین هەڵدەگرێت ، توخمە خانەکان (٢٤) کرۆمۆسۆم هەڵدەگرن ، دوورنیە سپێرم (٣٠٠٠٠) جینیان هەلگرتبێ لە پیاو، گەر لەگەڵ (٣٠٠٠٠) جینی ئافرەت یەکیان گرت لە هێلکۆکەی پیتراودا ، ئەو پێك هاتەیە بۆ هێزی (٣٠٠٠٠) بەرز دەبێتەوە ئەمەش ژمارەیەکی فراوانە[4] .

---

[4] طبیعة الانسان / د. اسلي مونتاکو / ت : احمد حسن الرحیم / ل : ٦٢ بەکورت کردنەوە.

(جینـەكان – genes) یـان مەشـیجەكان سـیفەتی پیشـەیی سـەربەخۆیان نییـە لـە زینگە ، بەڵكو كۆرپەلە كاتێ لە دایـك دەبـێ بـەهۆی بـۆ مـاوەیی جینـی نییـە بـەڵكو بەهۆی كارلێكردنی بۆ ماوەی بایۆلۆجی یە ئەوە لەگەڵ پێك هاتەكانی منداڵدان كە بۆی ئامادە كردووە.

گـەر بڕوانینـە قورئـان بـەر لـە (مەنـدڵ) و زانایـانی خۆرئـاوا ئامـاژەی بـە بـوونی كرۆمۆسـۆمەكان و جینـەكان كـردووە ، تـا فەرهەنگە پزیشكییەكان هـەمان زاراوەی قورئانی بەكاردێنن بۆ كرۆمۆسۆم و جینەكان.

وشـەی كرۆمۆسـۆم لـە قورئانـدا بـە (الصـبغات) و (الامشـاج) ئاماژەیـان كـراوە ﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُۥ عَـٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾ ﴾ یـان ﴿ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ ﴾

زانای گەورە (الرازي) لە (التفسير الكبير)دا دەنووسێ هەندێ گوتویانە ( خوای گەورە جۆرەها سروشت و ڕەوشتی تێكەڵی لە تۆودا دروست كردووە)

قورئـان دەربـارەی ئەنـدازەی جینـی و شـێوەكەی و ڕەنـگ و گەشـەو سروشـت و میزاژەكەی و ئـەو نەخۆشـییە بـۆ مـاوەیی یانـەی هـەڵیگرتون فەرمویـەتی : ﴿ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الجاثية ، واتە : ئێمە كردەوەكانی ئێوە كۆپی دەكەین[٥] .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (تزوجوا في الحجر الصالح فان العرق دساس) (رواه عدي) ، واتە : لە بنەماڵەی پاكدا ژن بخوازن ڕەگەز سیفەتەكان حەشار دەدات .

---

[٥] بناء الكون ومصير الانسان / هشام طالب / ل :٥٤٨ – ٥٤٩ سەیر بكە

تـا (لمبروز) لـه كتێبـی (الانسـان المجـرم)دا بـڕوای وایـه لـەكاتی توێكـاری كردنـی خانەكانی تاوانباران بەڵگەی بـایۆلۆجی دەست كەوتووە كە حاڵەتی تـاوانكردن بـۆ ماوەیی یە .

قورئـانی پـیرۆز فەرموویـەتی ﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ ﴾ نوح واتـە: گـەر تـۆ لێیـان گـەڕێی بەنـدەكانت گـومڕا دەكـەن و منـداڵی تاوانبـارو بـێ باوەڕیـان لێ پاشـاكەوت دەبێـت. هەرچـی ژینگـەی منـداڵدانـە (ئەشـلی مونتاگو) دەنووسێ :-

منداڵدان ئەو ژینگەیەیە كۆرپەلەی گەشە كردوو -٢٥٦- ڕۆژو دانێك لەناویـدا دەژیـێ، لەو ماوەیەدا منداڵ چەند هۆكارێ كاری تێ دەكات ، دەتوانرێ پێشبینی هەنـدێكیان بكرێ و زۆربەیان ناتوانرێ پێشبینی بكرێت[٦].

ئـەو هۆیانـەی لـە ژینگـەی منداڵانـدا كـار لـە كۆرپەلـە دەكـەن ئەوانـەن : هۆكـاری جەسـتەیی، هۆكـاری خـواردن ، داو و دەرمـان ، تـووش هـاتن بـە نەخۆشـی ناچالاكی جەستەیی دایك، هەستیاری دایـك ، تەمـەنی دایـك ، سـك كردنـەكانی دایـك ، دەنگـە دەنگ (ژاوەژاو) [٧].

پێغەمبەر ﷺ بەر لە (ئەشلی مونتاگۆ) و بۆمـاوەزانی نـوێ فەرموویـەتی : (السـعید من سعد في بطن امه ، والشقي من شقي في بطن امه) رواه الطبراني في الصغير ، اسناده صحيح في الجامع الصغير للسيوطي ، واته : بەختـەوەر ئـەو كەسـەیە لـە سكی دایكیدا بەختەوەر بووە ، شووم ئەو كەسەیە لە سكی دایكیدا شووم بووە .

---

[٦] طبيعة الانسان (ل : ٦٤) و (ل : ٤١)

[٧] هەمان سەرچاوە (ل : ٦٦)

**به ویستی خوا ئەم باسانە لە کتێبی ئیعجازی (بۆماوەزانی )دا بەدرێژی باس دەکەم.**

**پاشان (ئەشلی مونتاگۆ) لە باسی ژینگەی شارستانی (المحیط الحضاري)دا دەنووسێ: (چۆن بۆماوەی جیبی و ژینگەی منداڵدا کار لە مرۆڤ دەکات ، ژینگەی شارستانیش کاری تێ دەکات ، مەبەست لە شارستانی (الحضارة) ئەو بەشانەن مرۆڤ دروستی کردوون لە ئامرازو نووسین و دام و دەزگاکان و شتی تر .**

**(سێر جۆن مایرز / ١٨٦٩ – ١٩٥٥) دەنووسێ : (شارستانی ئەو پاشماوەیەیە مرۆڤ بەجێ ی هێشتووە ئێستا کاردەکات بۆ دارشتنی داهاتووەکەی).**

**دەنووسێ : (هەموو رەفتارێکی قسەکەر بریتی یە لە رەفتارێکی شارستانی لەکاتی کرداری مۆرکی کۆمەڵایەتی دا بەدەست هاتووە ... توانای قسە کردن سروشتیە ، بەڵام ئەو زمانەی پێ ی دەدوێین سروشتی نیە و سیفەتێکی بەدەست هاتووی شارستانی یە) (مرۆڤ بەو پێ یەی خاوەنی چەند توانایەکە لە توانایدایە ببێتە ئەندامێکی چالاك لە کۆمەڵگای مرۆیی دا).**

**( مرۆڤ دروست کراوی شێوازی ئەو شارستانییە دیارەیە تێیدا لە دایك بووە ، ئەو ناوەندە گرنگەی مرۆڤ تێیدا دەبێتە شارستانی تەنیا چەند سیستەمێکی هێماییە لەنێوان کار تێکەرو کار تێکراودا ، ئەو هێمایانەش زمانە)**

**قورئان دەربارەی زۆری رازو هێماکانی ناو جینەکان دەفەرمووێ :** ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ٣٤ ﴾ لقمان: ٣٤ **، مرۆڤ بەشێکی کەم نەبێ پەی بەو رازانە نابات و زۆربەیان شاراوەن.**

**دەربارەی کاریگەری شارستانی بۆ دروست کردنی کەسایەتی مرۆڤ ، قورئان فەرموویەتی** ﴿ وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ ﴾

الأعراف : ٥٨ ، واتە : شاری خاوێن ڕووەکانی بە ویستی پەروەردگارەکەی دەڕوێنێ ، ئەو شارەی پیسە تەنیا بەشێکی دەگمەن نەبێ ناڕوێنێت.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : (كل مولود يولد على الفطرة فابواه يهودانه او يمجسانه او ينصرانه) رواه البخاري ، واتە : هەموو منداڵێ لەسەر سروشتی خۆی لەدایك دەبێ ، باوان دەیگۆڕن بە جولەکە ، یان زەردەشتی ، یان مەسیحی و گاور)

بەکورتی بۆماوەو دەوروبەر هەمیشە کار لە یەکتری دەکەن و بەشدارن لە دروستکردنی کەسایەتی و ڕەفتاری مرۆڤدا ، بۆیە پێویستە بۆماوەو ژینگەی باش هەڵبژێرین بۆ دروست کردنی وەچەیێکی باش و ساغ و پێشکەش بە کۆمەڵگای بکەین ، بۆ بنیاتنانێ داهاتوویەکی زێڕین.

**ئیعجازی ( ٥ ) و ( ٦ )**

## پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی ژینگە ، ژینگە وشەیەکی قورئانییە :

قورئان فەرموویەتی : ﴿ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ ﴾ النبأ : ١٢ واتە : لەسەرووی ئێوە حەوت ئاسمانی بەهێزمان دروست کردووە ، چرایەکی درەخشانمان داناوە ، لە هەورە گوشراوەکان ئاوی بە خوڕمان باراندووە ، تا دانەوێڵەو ڕووەکی پێ بڕوێنین ، وە باخچەی چڕو پڕ.

لێرەدا قورئان پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی ژینگە باس دەکات لە (بەرگە هەواو ، تیشك و ئاو و باران و ڕووەکەکان و خاك) دیارە وەکو (عادل مشعان) دەنووسێ : لێرەدا پەیوەندییەکی توند هەیە لەنێوان توخمە سروشتییەکان و زیندەگییەکاندا لەدەورو ناوەوەی زەوی و پێك هاتەکانیدا ، ئەو پەیوەندیە ژینگەییانە پێیان دەگوترێ (سیستەمی ژینگەیی) .

(سیستەمی ژینگەیی) بریتییە لە (ئەو کارلێککردنە ڕێك و بەردەوامەی لەنێوان توخمە زیندەگییەکانی ژینگەو نازیندەگییەکاندا هەیە ئەو هاوسەنگییەی نێوان توخمەکانی ژینگە کە ئەو کارلێککردنە پەیدای دەکات).

هەر (هاوسەنگی ژینگەیی یە) بریتیە لە توانای ژینگەیی سروشتی بۆ بەڕێوەبردنی ژیان لەسەر زەویدا بەبێ ئەوەی هیچ کێشەو مەترسییەك تووشی ژیانی مرۆڤ ببێت .

هاوسەنگی سروشتی ژینگەیی لە گۆی زەویدا تەنیا بەشێکە لە هاوسەنگی وردی بوونەوەر ، واتە : توخمەکان و بەخشراوەکانی ژینگە بوون و ڕێژەیان دەپارێزێت وەکو خودا دروستی کردوون ، بەڵام مرۆڤ لەکارکردنی لە ژینگە گەیشتۆتە ئاستێ زەنگی مەترسی لێ بدات ، لە هەندێ دۆخدا سیستەمی سروشتی ژینگەیی گۆڕان و ناڕێکی بکەوێتێ و هەڕەشە لە ژیان و مانەوەی مرۆڤ بکات لەزەوی دا [٨].

گەر تەماشای قورئانی پیرۆز بکەین دەبینین وشەی (البیئة) وشەیەکی قورئانییەو لەزۆر شوێندا ئاماژەی بۆ کراوە ، وەکو :﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ ﴿٩﴾ ﴾ ، واتە : ئەوانەی لە ماڵدا نیشتەجێ بوون ، ﴿ وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ یونس ٩٣

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا ﴾

لە (مفردات الراغب) و (مجمع البحرین / الطریحي)یدا وشەی (مبأ ) واتە : جێگاو شوێنی حاوانەوە ، (تبوأ) واتە : کردنە جێگای شوێنێ بۆ ژیان و حەوانەوە ، وشەی (البیئة – المحیط) لە فەرهەنگی کوردی بە ژینگەو دەوروبەر مانا کراوە ، وەکو لە (کەمالنامە) و (شیرین)دا هاتووە .

---

[٨] التربیة و البیئة / ل:١١

ئیعجازی ( ٧ )

## سیستەمی ژینگەیی و پێك هاتەكانی :

بێگومـان سیسـتەمی ژینگـەیی (Ecosystem) لەلایـەن شـوێنەوارزانی بـەریتانی (Tensely) لە ساڵی (١٩٣٥)دا پێشنیاز دەكرێـت بـۆ وەسفی پەیوەندییـەكانی نێـوان زینـدەوەران و ژینگـە نازیندەگییەكـەی ، (سیسـتەمی ژینگـەیی) یەكـەی پیشـەیی بنەڕەتی ژینگە زانی یەو بریتی یە لە (كۆمەڵە زیندەوەرێ لە دەڤەرێكدا هەن و كار لەیـەكتری دەكـەن و ئـەو كارلێككردنـە وزەو كەرسـتەكان لـەو سیسـتەمەدا لـەنێوان پێكهاتە زیندەگییەكان و نازیندەگییەكان ئاڵوگۆڕی پێ دەكات .

بـوونی شـێوە ژیانـە جـۆراو جۆرەكـان لـە زەویـدا لەسـەر بـەرگی زینـدەگی (الغـلاف الحيوي – Biosphere) بەنـدە ، كە بەرگێكی دەرەكی یە (خاك) بۆ چەند مەترێك و دەریاكان و ئۆقیانوسەكان و ئاوی سازگارو بەرگە هەوا دەگرێتەوە[٩] .

سیستەمی ژینگەیی دوو بەشە :

١- پێكهاتــە نازینـدەگیــەكان (هۆكــارە سروشــتییەكان) : كۆمەڵــە هۆكــارێكی نازیندەن كار لە زینـدەوەران دەكـەن و جـۆرو شـوێن و بوونیـان و جـۆری پەیوەنـدی نێوان زیندەوەران دیاری دەكات[١٠] .

بەو پێیە هەر زیندەوەر جێگایەكی بۆ خۆی دیاری كردووە بەناوی ژینگە ، بۆ نمونە : شوێنی (كەروێشك) ئەو ناوچانەیە گژوگیای تێدایـە ، ئینجا پێویسـتە جـۆری گـژو گیایەكەش دیاری بكەین ، كە دەیخوات و جۆری خاكی بزانین ... هتـد ، یـان شـوێنی

---

[٩] التربية و البيئة (ل:١٢)

[١٠] ا هەمان سەرضاوة (ل:١٣)

نەهەنگ زەریایەو شوێنی دارخورما ناوچە نیمچە گەرمەکانەو شوێنی گوێز ناوچەی ساردو کوێستانەکانە .

گەر لە قورئانی پیرۆز بڕوانین لە دەیان ئایەتدا ئاماژەی بە پەیوەندی نێوان ژینگەو زیندەوەران کردووە ، هەروەها زیندەوەران لەگەڵ ڕووەك و یەکتریدا ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢) ﴾

واتە : با مرۆڤ سەیری خواردنەکەی بکات ، ئێمە بارانمان بۆ باراندووە چۆن بارینێ ، پاشان زەویمان بۆ کەرت کردووە ، چۆن کەرت کردنێ ، ئینجا تێماندا ڕواندووە دانەوێڵەو ترێ و گژو گیاو زەیتون خورماو باخچەی پڕو میوەو لەوەڕ بۆ سوودی ئێوەو ئاژەڵەکانتان.

لێرەدا قورئان پەیوەندی مرۆڤ بە خۆراك و ڕووەك و زیندەوەرانەوە ئاماژە پێ دەکات ، پاشان پەیوەندی ئەوان بە خاك و ئاو و هەواوە ، دیارە باران پەینی نتریتی لەگەڵدایە ، وشەی (شـــققنا الارض) ئاماژە بە ئاو و کرمی زەوی دەکات ، چۆن زەوی نەرم دەکەن تا هەواو ئاو و تیشك و گەرمی بڕواتە ناو تۆوەکەوە لە خاکدا ، چۆن خاك و ئاو و هەوا دەبنە خۆراکی ڕووەك ، چۆن ڕووەك پەیوەندی بە مرۆڤ و گیاندارانەوە هەیە ... هتد.

## هۆکارە نازیندەگیەکان دەبنە سێ بەشەوە :

١. هۆکاری هەوایی / لەوانە : ڕوناکی و گەرمی و شێداری و با و پەستان و گازەکان .
٢. هۆکارە خاکییەکان / پێك هاتەی خاك و شوێنی و شێ داری و کەرەستەکانی ئەندامی و نا ئەندامی و ناوی دەگرێتەوە ، ئەو هۆکارانە جۆری ئەو گیاندارانە دیاری دەکەن لەناوی دا یان لەسەریدا دەژین.

٣. هۆكاری ئاوی / ئاوی سازگارو سوێر دەگرێتەوە لە ژینگەی ئاویدا ، پێك هاتەی ئاوی دەگرێتەوە لەناوەندی وشكانیدا.

**هۆكارە زیندەگییەكان : ئەوانەش دەبنە سێ بەشەوە :**

١. ئەو گیاندارانە دەگرێتەوە توانای دروست كردنی خۆراكیان هەیە بەخۆیان (Autotrophic) لە ڕێگای ڕۆشنە پێكهاتن و پێك هێنانی كیمیایی ، كە ماددەی زیندەگی لە ماددەی نازیندەگی دەردێنن ، هەموو جۆرە ڕووەك و قەوزە و بەكتریایەكان.
٢. ئەو گیاندارانەن بەخۆیان ناتوانن خۆراك بەدەست بێنن (Heterotrophic) بەڵكو بە ئامادەكراوی دەوروبەریان وەریان دەگرن، ئەو گیاندارانەی ڕاستەوخۆ خۆراك لە ڕووەك وەردەگرن بە گیا خۆرەكان (اكلات الاعشاب Herbivores) دەناسرێن ، ئەوانەی گەندە خۆرن بە گەندە خۆر (carnivores) دەناسرێن ، هەرچی ئەوانەی گۆشت و گیا خۆرن بە (گۆشت و گیا خۆر omnivores) ناو دەبرێن.
٣. ئەو گیاندارانەی شیكەرەوەن (Decomposers) لەناو خاكدا دەژین وەكو كەڕووەكان (فطريات ) و بەكتریا ، ماددەی ئەندامی شی دەكەنەوە بۆ ماددەی سادەی دەگۆڕن و بۆ توخمی سەرەتایی دەگێڕنەوە ، وەكو : نایترۆجین و فۆسفۆرو كالسیۆم و مەگنیسیۆم ، كە ڕووەك بە ئاسانی دەتوانێ بیانمژێ ، تا جارێكی تر بۆ ماددەی ئەندامی ئاڵۆزیان بگێڕێتەوە ، بەم شێوەیە كرداری (سوڕی خۆراك – الغذائي التدوير) بەردەوام دەبێت[11].

قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەو ڕووەك و گیاندارانەی ڕاستەوخۆ خۆراك وەردەگرن فەرموویەتی :

---

[11] هەمان سەرچاوە / ل:١٣- ١٤

﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا ﴾ ، واته : ئەو خوایەی ئاگری لە داری سەوز بۆ دروست کردوون.

٤. (ئاگر) ماتە وزەیە لە هایدرۆجین و کاربۆن ، (الخضر) مەبەست لە کلۆرۆفینە لە درەختی سەوزدا کە خۆراك لە ڕێگای ڕۆشنە پێك هاتن دروست دەکات ، وە (ئاگر) ئەو وزەیەیە (کلۆرۆفیل) لەخۆر وەری دەگرێت.

﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا ﴾ ، واتە : ئینجا هەموو ڕووەکێکمان پێ ڕواندوە، لەوانە ڕواندومانە بە سەوزی .

ئاشکرایە وزە (الطاقـــة) بریتی یە لە توانای کارکردن ، زیندەوەر پێویستی پێ یەتی بۆ زیندە چالاکیەکان ، خۆریش چاوگی وزەیە ، ڕووەکی سەوز کە ماددەی سەوزی تێدایە (کلۆرۆفیل) بە یارمەتی ئاگرو تیشکی خۆر خۆراك دروست دەکات ، بۆیە بە ڕووەك دەوترێ (بەرهەمە زیندەوەر) و بە زیندەوەرانی تر دەگوترێ (کارکەرە زیندەوەر).

وە ئایەتی ﴿ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ﴾ واتە : زیندوو لە مردوو دەردێنێ و مردوو لە زیندوو دەردێنێ و زەوی دوای مردن زیندوو دەکاتەوە ، .

ئەمانە ئاماژەن بۆ ڕووەك و زیندەوەران کە ماددەی ئەندامی لە ماددەی نا ئەندامی دروست دەکەن ، وەکو ڕووەك و قەوزەکان ، پاشان ئەو کەڕو و بەکتریایانەی لەناو خاکدان ئەو ماددەی ئەندامیانە شی دەکەنەوە بۆ ماددەی نازیندەو سادە وەکو فۆسفۆڕو کالسیۆم و هتد ، ڕووەکەکان دەیانمژنەوە دیسان بۆ کەرستەی ئەندامی دەیانگۆڕنەوەو سوڕی خۆراکی بەردەوام دەبێت ، خودا دەفەرمووێت : ( ويحي

الارض بعـد موتهـــا ) يـان ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ (٥٥) ﴾ 

لێرەدا قورئـان ئاماژە دەكات خانـەكانی مـرۆڤ و مـاددە زیندەگیـەكانی سـەرەتا لـە توخمەكانی زەوی دروست بوون كە نازیندەن ، پاشان گەر مردن لاشە ئەندامیەكەیان بۆ توخمەكانی زەوی شی دەبێتەوە ، دوایی زیندوو دەبنەوە .

بێگومان زیندەوەر وزەی لەخۆرو ئەو ماددەیەش كە لەشی پێك دێنێت لەدەوروبەری دەستی دەكەوێت ، چونكە ڕووەك ئاو لە خـۆراك وەردەگـرێ بـەهۆی ڕەگەكانییـەوە ، دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لەهەوا وەردەگرێت ، ئەو ماددانەش كە لە ڕووەكدا دروست دەبن دەچنە لەشی زیندەوەرەوە دوای خواردنی ، دوایی ئەو خۆراكانە دەگەڕێنەوە بۆ زەوی لەكاتی ژیاندا وەكو دەردان و دەرهاویشتن و گەلا وەرین ، یـان لـەكاتی مردنـی زیندەوەرەكەدا ئەم سوڕە بەردەوام دەبێت ، ئەم ئایەتانـەی ئاماژەمـان پێـدان هـەمان زانستی خوایی بۆخەڵكی زاناو لێكۆڵەر بەیان دەكەن و لە سادەترین كەسی دەگەیەنن.

پاشان خوداوەند باسی لە هۆكارە هەواییەكان و هۆكارەكانی خاك و هۆكارەكانی ئاوی كردووە ، كە كار لـە زینـدەوەر دەكـەن : ﴿ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا ﴾ ، واتـە : بامـان نـاردووە بەمتوربەكـەر ، ئینجا بارانمان بۆ ناردن لەئاسمانەوە پێمان نۆشین.

لێرەدا قورئان ئاماژە بە هۆكاری هەوایی دەكات لە ڕوناكی و گەرمی و شێداری و با و پەستان و گازەكان.

ئاماژە بە هۆكـاری ئـاوی سـوێرو شـیرین دەكـات ﴿ وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ﴾

﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ ﴾

**نمونـەی مشـەخۆرەکان وەکـو : مشـە خـۆری (E.histolotica) لـەناو ریخۆڵـەکانی مرۆڤدا ، یان بوونی کرمی بەلهارزیاو کرمی تر لەلەشی مرۆڤدا[١٢].**

**قورئان باس لە بوونی ئەم مشە خۆرانـە دەکات ، بۆیـە فەرموویـەتی گۆشـتی بـەراز مەخۆن ، یان گۆشتی مردارو گەنیوو مەخۆن ، پاکژی ڕەچاو بکەن**

﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ ﴾ المائـدة: ٣، **واتـە : مـردارو خـوێن و گۆشتی بەرازتان لێ حەرام کراوە .**

**بێگومان مردارو گۆشتی گەنیو و خوێن زوو بەجۆرەها میکرۆب پیس دەبێت ، بۆیـە دەچنە لەشی مرۆڤ و نەخۆشی دەکەن ، پاشان گۆشتی بەراز جۆرەها کرمی تێدایـە ، لەوانەش : (پتنیاسولیۆم – کرمی شریتی بەراز Taenia solium) کە درێژی (١٨٠ – ٣٠٠ سم) دەبێت[١٣].**

**ب- ڕاوکردن ( الافتراس - predation ) :**

**ئەو پەیوەندییە یەکێ لە زیندەوەران و گیانداران سوود لە ئـەوەی تـر وەردەگـرێ ، کە لەو قەبارەی بچووکترە بۆدابین کردنی خۆراکەکەی [١٤].**

---

[١٢] التربية و البيئة / ل : ١٥- ١٦

[١٣] بروانة : علم الطفيليات / د.عبداللطيف مولان / ل : ٣٢١.

[١٤] التربية و البيئة / ل : ١٦

قورئان فەرمووویەتی : ﴿ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ ﴿٥١﴾ ﴾ واتە : ئەوانە وەكو كەری كێوی وێڵ وان لەدەست شێر ڕایان كردووە.

ئەو نمونانەمان لە فیلمی ژیانی ئاژەڵاندا لە تەلەفزیۆندا بینیوە ، بەم شێوەیە قورئان هەموو نمونەیەكی تێدایە ، وەكو خوا فەرموویەتی : (ولقد ضربنا للناس في هذا القرآن من كل مثل) (الروم ٥٨).

ج – دژكاری ( **التضاد** – Antagonism )

ئەم جۆرە پەیوەندییە لە نێوان دوو گیاندار ڕوودەدات ، سوودی بۆ یەكێكیان دەبێ و بەزیانی ئەوی تریان تەواو دەبێت ، وەكو یەكێ لە زیندەوەرەكان دژە ژیندەگییەكان بەرهەم دێنێ و ژیانی ئەوەكەی تر سنووری بۆ دادەنێت، یان وەكو گەشەكردنی دارە گەورەكان لە دارستانەكاندا بوار نادەن ڕووناكی خۆر لە درەختە بچووكەكاندا بدات بۆیە تووشی لەناو چوون دەبن.

د- پێشبڕكێ ( Competition ) :

ئەو جۆرە پەیوەندییە پێشبڕكێیە لەنێوان تاكەكانی یەك جۆردا یان دوو جۆردا ڕوودەدات لەسەر كەرستە سروشتییەكان ، كاتێ هەردوولا پێویستییەكانیان وەكو یەكە ، لەو پەیوەندییە یەكێكیان قازانج و ئەوی تریان زیانی لێ دەكەوێت ، یان هەردووكیان زەرەرمەند دەبن بە هاوزیان (المتبـادل التضـار) دەناسرێت[١٥].

بێگومان لە شوێن و دەوروبەرێكدا زۆر كۆمەڵە زیندەوەر دەژین كە پەیوەندی ئاڵوگۆر بەیەكتریەوە بە ستونەوەو بێ یەكتری ناژین ، بۆ نمونە : مەڕو ماڵات لە نزیك سێوەڕەو گورگیش لەدەوری مەڕدا دەژیێت ، كەواتە زیندەوەران پەیوەندی خۆراكیان بەسەریەكەوە هەیە ، وەكو بوونی گەنەو مێشەكەرەو مێشە مایەنەو ترمۆس

---

[١٥] التربية و البيئة / ل : ١٧

به لەشی هەندێ گیاندارانەوە ، وەکو کەرو ئێسترو ماین و مانگاو ، خۆراکەکەی لە خوێنی ئەو گیاندارانە وەردەگرێ کە دەیمژێ ،یان مێشوولەی ئەنۆفیلسی مەلاریا.. هتد..

هەیانە لەو زیندەوەرانە کەلاك خۆرە وەکو : کرم و باز و ڕێوی ، یان کەڕووەکان وەکو : کەڕووی نان بە ژیانێکی کەلاك خۆری دەژین .

هەیانە ڕاوکەرەو نێچیر دەگرێ وەکو گورگ پەلاماری مەڕ دەدات ، پشیلە پەلاماری مشك و چۆلەکە دەدات ، هەڵۆ پەلاماری کەروێشك دەدات ، هەندێك زیندەوەر سوود بەیەکتری دەگەیەنن ، وەکو زیندەوەرە قامچی دارەکان لە ڕێخۆڵەی مێرووەکاندا ئەو ماددەی سلیلۆزی بۆ دروست دەکات و ئەویش خۆراکی دەداتێ ، جار وایە هەندێ زیندەوەر سوود لە هەندێ زیندەوەر وەردەگرن و ئەوی تر زیانی پێ ناگات ، وەکو میکرۆبە بەراییەکان لە ریخۆڵەی مرۆڤدا...

هەموو ئەو دیاردانە هاوسەنگی لە سروشتدا دروست دەکەن، ﴿ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ ﴾ الشورى

## ئیعجازی ( ٨ ) سامانە ژینگەییەکان :

هەموو ئەو سامان و دەرامەتانەی زیندەوەر لە ماددەی ژیانیدا بەکاری دێنێ دەرامەتی هەمان زیندەوەرە ، ئەو دەرامەتانە چەند بڕێ پێك دێنن و بەهۆی چالاکییەکانی ئەو زیندەوەرە جیا جیایانە زیادو کەم دەکات ، ئەو دەرامەتای زیندەوەران و خۆراکەکان هەموو زیندەوەران بەشدارن تێیدا بۆ بنیاتنانی جەستەیان و بنەمای وزەی ئەوانە ، کە بەشداری دەکات لە چالاکی جیا جیای ئەواندا ، ئەو جێگایەش زیندەوەران کاری تێدا دەکەن ، سوڕی ژیانی تێدا تەواو دەکەن ، چونکە ئەو دەرامەتانە بەردەوام بەکاردەهێنرێن زیادوو کەم دەکەن ، بۆیە ئەو دەرامەتانە بەسەر سێ بەشدا دابەش دەبن :

١. دەرامەتە هەمیشەییەکان : ئەو دەرامەتانە هەر چەندە زۆر بەکاردەبرێن تەواو نابن ، وەکو خۆرو ئاو و هەوا.

٢. ئەو دەرامەتانەی نوێ دەبنەوە : ئەو کەرەستانەن بەردەوام نوێ دەبنەوە مەترسی تەواو بوونیان لێ ناکرێ ، بەلاّم پێویستە پارێزگارییان بکرێ ، وەکو : ڕووەکە سروشتیەکان و گیاندارانی وشکانی و ئاوی.

٣. ئەو دەرامەتانەی نوێ نابنەوەو دروست نابنەوە : ئەو ماددانەن عەمبار کراون و تووشی تەواو بوون دەبن ، چونکە ئەوەی بەکار دەبرێ قەرەبوو نابێتەوە ، وەکو کانزا جیاجیاکان و سەرچاوە وزەییەکان وەکو خەڵوزو پەترۆڵ وگازی سروشتی [16].

خوداوەند دەربارەی دەرامەتە هەمیشەییەکان فەرموویەتی :﴿ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾ البقرة: ١٦٤ ، واتە : خودا ئاوی لە ئاسمانەوە باراندووە زەوی دوای مردنی پێ زیندوو دەکاتەوە .

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴾ فصلت: ٣٧ ، واتە : لە نیشانەکانی خوا شەو و ڕۆژو خۆرو مانگە .

قورئان ئاماژە دەکات دەبێ پارێزگاری لەدەرامەتی ڕووەك و کشتوکاڵ بکرێت :
﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ﴾ البقرة: ٢٠٥
واتە : گەر خراپەکار پشتی لە ئایین هەڵگردو ڕۆیشت بەزەویدا وێرانکاری تێدا دەکات و کشتوکاڵ و وەچە لەناو دەبات .

لێرەدا لەناوبردنی کشتوکاڵ و ڕووەکی وەکو لەناوبردنی وەچەی مرۆڤی داناوەو بە خراپەکاری لە قەڵەم داوە.

---

[16] التربیة و البیئة / ل :١٧- ١٨

خودا دەربارەی گەنجینەکانی ئاسمان لە ئاو و هەواو و تیشك و ... هتد ، گەنجینەکانی زەوی لە کانزاکان و ئاو و سوتەمەنییەکان وەکو : نەوت و گازو خەڵوز دەفەرمووێ :

﴿ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ ﴾ ،

واتە : خەزێنەکانی ئاسمانەکان و زەوی بۆ خودایە ، بەڵام دووڕووەکان تێ ناگەن .

وە خودا ڕۆزی دەری گیانداران و ڕووەکەکانە :﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦﴾ ﴾ ، واتە : هەرچی زیندەوەرە لە زەوی خودا ڕۆزی دەریەتی ، خودایە ئاو و هەواو تیشك و خواردن و پێویستییەکانی تری زیندەوەران لە زەویدا دابین دەکات و بۆ بەردەوامی ژیان دەرامەتەکانی پێ بەخشیون .

## ئیعجازی ( ٩ ) (١٠)

## هاوسەنگی لە سروشتدا ، تێکدانی هاوسەنگی سروشتی

﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِي ٱلْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَٱلنَّخْلُ ذَاتُ ٱلْأَكْمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلْحَبُّ ذُو ٱلْعَصْفِ وَٱلرَّيْحَانُ ﴿١٢﴾ ﴾ ، واتە : ئاسمانی بەرزکردۆتەوەو تەرازووی داناوە ، نەکەن زیادەڕەوی لەو تەرازووەدا بکەن ، تەرازوو بە دادگەری بکێشن ، لە تەرازوودا پێوانەی سووك مەکەن ، زەوی بۆ خەڵکی داناوە میوەو خورمای بە شکۆفەی تێدایە ، وە دانەوێڵەی بە کاو ڕێحانە تێدایە .

لێرەدا قورئانی پیرۆز ئاماژە دەکات کاتێ خودای پەروەردگار بوونەوەری داناوە ، یاساو ڕێسای بۆ داناوەو هاوسەنگی تێدا دروست کردووە ، نابێت کەم و زیادی لەو هاوسەنگیەدا بکرێت و سیستەمی سروشت تێك بدرێت ، خودا زەوی بۆ ژیان داناوە ،

هەموو هۆکارەکانی ژیانی تێدا داناوە ، لە ڕووەك و میوە بۆ خۆراك و پاراستنی هاوسەنگی لە زەوی و هەواو خاك دا .

(د.جون ولیام کلوتسی) پسپۆڕ لە بۆماوەو ژینگە زانی دا دەڵێ : ئەو ژیانەی تێیدا دەژین لە وردەکاری و ئاڵۆزی دا گەیشتۆتە ئاستێ ناکرێت بە ڕێکەوت پەیدا بووبێ ، پڕە لە جوانکاری و یاسای ئاڵۆز ، کە پێویستی بە بەڕێوبەرێ دەکات و ناشێ بدرێتە پاڵی چارەنووسێکی کوێر ، بێگومان زانست یارمەتی زیاتری پێشکەش کردین بۆ تێگەیشتن و خەملاندنی دیاردە گەردوونیە ئاڵۆزەکان ، ئەمەش زیاتر بڕوابوونمان بەخوداو بوونی ئەو دەسەلێنێت .

یەکێ لەو ئاڵۆزکارییانە جوانانەی لەم گەردوونەدا هەیە پەیوەندی ناچاری و ڕێکی نێوان شتەکانن لە هەندێ باردا ، لەوانەش پەیوەندی نێوان پەپولەی (یۆکا) و ڕووەکی (یۆکا) دا ، کە ڕووەکێکی زنبقی یە ، گوڵی (یوکا) بۆ خوارەوە شۆڕ دەبێتەوە و ئەندامی مێ یەی لە ئەندامی نێرینە (السداة) نزمترە ، هەرچی کۆسپە (المیسم) ئەو بەشەی گوڵە دەنکە هەڵاڵەکان (حبوب اللقاح) وەردەگرێ و لە شێوەی کاسەکان دایە ، بەڕێگەیەکی وا دانراوە ئەگەری نیە دەنکە هەڵاڵەکانی بکەونە ناوەوە ، پێویستە ئەو دەنکە هەڵاڵانە بەهۆی پەپولەی یۆکا بگوازرێنەوە ، لەدوای خۆرئاوا بووندا ، هەندێ لەو دەنکە هەڵاڵانە لە پۆرگ (المتك) ی گوڵەکانەوە بگوازێتەوە ، کە لەدەمیدا پاراستونی ، ئەو دەمەش بە ڕێگایەکی تایبەتی دروست کراوە بۆ ئەو کردارە ، پاشان پەپولەکە بۆ ڕووەکێکی تری لەو جۆرە دەفرێ ، بەدەزگایەکی تایبەتی پاشکۆی لەشی هێلکۆکەدانی ڕووەکەکە دەدرێ ، لەشێوەی دەرزیلە دەچێ و هێلکۆکەی لێوە دێنە خوارەوە ، ئەو پەپولەیە هێلکۆکە پێ یان پتر دادەنێ و بۆ ژێرەوەی گوڵەکە خۆی دەخزێنێ تا دەگاتە تولێ (القلم) ، لەوێ دا دەنکە هەڵاڵەکان لە شێوەی گرمۆڵەیی لەسەر کۆسپدا بەجێ دێڵێ ، ڕووەکەکە ژمارەیەکی زۆر دەنکەکان بەرهەم دێنێ ، بەشێکی دەکاتە خۆراکی کرمۆڵەکانی پەپولەکە و بەشێکی تریشیان بۆ بەردەوامی سوڕی ژیان هەراش دەبن.

هەمان پەیوەندیش لەنێوان هەنجیرو کۆمەڵە زەردەواڵەیەکی بچوکدا هەیە[١٧]. پاشان ئەم زانایە دەڵێ : خوداوەند هاوسەنگی لە تەواوی دیاردە سروشتیەکاندا زۆر بە وردەکاری دروستی کردووە هەر هەوڵدانێ بۆ دەست کاری کردنی سروشت بەزیانێکی گەورە تەواو دەبێت[١٨].

(جوپ) دەڵێ : (سروشت زیادەڕەوی نازانێ ، هەمیشە راستگۆو مەزن و توندو تیژە و ڕاستی پێکاوە ، هەڵە تەنیا لەلایەن خۆمانەوە ڕوودەدات ، سروشت ملبەملانەی بێ توانایی دەکات ، رازەکانی خۆی تەنیا بۆ ئەو کەسانە ئاشکرا دەکات بەتواناو دڵسۆزو تەقواکارن[١٩].

(گریسی موریسۆن) دیمەنێکی تری ئەو هاوسەنگیە باس دەکات لە زینگەداو دەڵێ : ئەو سیستەمە چەندە جوانە کە جڵەو و هاوسەنگی ڕادەگرێ و هەموو زیندەوەرێ هەرچەندە دڕندەو زەبەلاح و بەزیان بێ بوار نادات دەسەلآت بەسەر جیهاندا بگرێ ، ئەو یاسایەش هەر لە چەرخی گیاندارانی تویکڵداری بەستەڵەکەوە بەردەوامە ، مرۆڤ بە تەنیا ئەو هاوسەنگییەی سروشتی بە گواستنەوەی ڕووەکەکان و گیانداران لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر تێکدا ، بەپەلەش سزای توندی خۆی وەرگرت ، لەو چەند پەرەسەندنانەدا چەند کارەساتێکی ئاژەڵی و مێرویی و ڕووەکی سەری هەڵدا ، ئەم نمونەیەی خوارەوە دەربارەی ئەو جڵەو ڕاگرتنانەی پەیوەندی بە بوونی مرۆڤەوە هەیە لەبەرچاوان و گرنگە ، لە ولآتی (ئوستڕالیا)دا لەو سالآنەی ڕابردوودا جۆرە ڕووەکێکی هەنجیری دڕکاوی (الصبار – catus) ڕوێنرا وەکو پەرژینێکی پارێزەر ، ئەو ڕواندنە بەشێوە یێك بەدوایەوە چوو ، هەندەی ڕووبەری (ئینگلترا)ی داپۆشی ،

---

[١٧] الله یتجلی في عصر العلم / ل : ٤٦- ٤٧

[١٨] هتمان ستارضاوة / ل : ٥٠.

[١٩] الله یتجلی في عصر العلم / ل : ٤٦- ٤٧ ، سوپاس بۆ خوا کردوومانە بە کوردی لە بازاڕدا هەیە.

دژواری بۆ خەڵکی شارو دێ پەیدا کردو کشتوکاڵی زۆری فرتێ خست و بووە ڕێگر لەبەردەم کشتوکاڵدا ، خەڵکی هیچ هۆکارێکیان دەست نەکەوت پێش بەپێوەچون و داگرتنی بگرن، ئوستراڵیا کەوتە ناو مەترسی ڕامالینی سوپایەکی کشتوکاڵی خامۆشەوەو بەبێ پێش پێ گیران بەرەو پێش دەڕوات.

زانایانی مێرووزانی ، کون و قوژبنی جیهان گەڕان تا مێرولەیەکیان دەست کەوت لەسەر ئەو هەنجیرە دڕکاوییە دەژیێ و زوو بلاّودەبێتەوەو تەنیا ئەو دەتوانێ لە (ئوستراڵیا) دا کۆسپ بخاتە بەر دەمییەوە ، زۆری نەبرد بەسەر ئەو هەنجیرە دڕکاوییەدا سەرکەوت ! بەشێکی کەم نەبێ لەو هەنجیرە دڕکاوییانە نەبێ نەماوە ، کە تا سەر بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی ئەو هەنجیرانە بەرەو ڕوو بینەوە ، بەو شێوەیە جڵەوگیری و هاوسەنگی هەمیشە دابین و بەردەوامە.

بۆ (مێشولەی مەلاریا) دەسەلاّتی بەسەر دنیادا نەگرت تا ئاستێ باب و باپیرانمان لەگەڵیاندا بمرن ، یان بەرگرییان لەدژدا پەیدا بکەن؟

نمونەی تر : مێشولەی زەردەتایە (الحمى الصفرا ) کە لەیەکێ لە وەرزەکاندا چووە پێش گەیشتە (نیوّرك) ، دیسان لە بەستەڵەکدا مێشوولە زۆرە ، بۆچی مێشولەی (تسی تسی) گەشەی نەکرد تا لەناوچەی تری جگە لە ناوچە گەرمەکەیدا بژیت و ڕەگەزی مرۆڤایەتی فرتێ بخات ؟

نەوەندە بەسە مرۆڤ یادی ئەو پەتاو تاعون و میکرۆبە کوشندانە بکاتەوە ، کە تا ئیمڕۆش مرۆڤ هۆکاری خۆپاراستنی لەدژدا نیە ، دیسان نەزانینی تەواویشی بە بنەماکانی پاراستنی تەندروستی لەیاد نەکات ، تا بزانێ مانەوەی مرۆڤ لەگەڵ ئەوەشدا سەرسوڕهێنەرە!

ماسییەکان و مێرووەکان لە ژیاندا دەمێننەوە کاتێك یاسای ڕێککەوتی بەسەریاندا دەڕوات ، هەزاران ئەو گەرایانەی دایدەنێن بەشێکیان لەمردن ڕادەکەن ، کە لە هەموو لایەکەوە مردنیان بۆ لەکەمیندایە و خۆپاراستنی لێ ناکرێت .

ئەو راستییانە نامۆن لە سروشتداو شایانی باس کردنن ، گەر چەند بەلگەیەکی یەکلاکەرەوەش نەبن وەکو پێویست بوون بەسەر بوونی چاودێری خودایی ، بەلام مرۆڤ و گیاندارانی نەرمۆلە (الـــرخوة) لە ژیاندا مانەوە ، بەلام مرۆڤ پتر پێویستی بە ڕیزبەندی خۆپاراستن هەیەو پێشی دراوە !

مێروەکان وەکو مرۆڤ (سی)یان نیە ، بەلام لە ڕێگای بۆڕیچکەکان هەناسە دەدەن ، کاتێك مێرووەکان گەورە دەبن و گەشە دەکەن ئەو بۆڕیچکانە ناتوانن زیاد لەو قەبارەیە هەناسە دابین بکەن ، دیسان هەرگیز مێروولەیێکت بەرچاو ناکەوێ لەچەند ئینجێ درێژتر بێ ، بالی مێرووله کەمێك نەبێ درێژ نابن ، لە سایەی دەزگای پێکهاتنی مێرووەکان و ڕێگای هەناسەدانیان مێروولەی گەورە دروست نابێت ، ئەو سنوور دانانە پێشی بە گەشەکردنی مێرووەکان گرتووە تا دەسەلات بەسەر جیهاندا نەگرن ، گەر ئەو جلەو و هاوسەنگی یە نەبوایە مرۆڤ لەسەر زەوی نەدەما .

دەربارەی ڕێکخستنەکانی تری سەرسوڕهێنەری فیزیۆلۆجی گیانداران شتێکی کەم نەبێ باس نەکراوە ، ئەگەر ئەو ڕێکخستنە نەبوایە گیان و ڕووەك لەبووندا ڕەش دەبوونەوە ، بەلام ئەو ڕاستییانە گەیشتۆتە بایەخێکی ئەوەندە مەزن پێویستە باسیان بکرێت ، لەو دواییەدا جیهان گەیشتە ئەو حەقیقەتە بلێ : لێرەدا چەند ماددەیەك هەیە بەناوی (ڤیتامینەکان) نەبوونی ئەو ڤیتامینانە نەخۆشییەکانی (بلاجرا) و (بەری بەری) و (ئەسکەرپوت) و نەخۆشییەکانی (بەدخۆراکی) پەیدا دەکەن ، گومانی تێدانیە ملیۆنەها سالە مرۆڤ دەژیێ و پەی بەو ماددانە نەبردووە کە بۆ مانەوەی ژیانی پێویستن. کاتێك گەشتیاران سەفەری دەریایی درێژخایەنیان ئەنجام دەدا و خۆراکی تەواویان نەبوو تووشی نەخۆشی ئەسکەرپوت (ئێسکە نەرمە) دەبوون ، بینرا ئاوی لیمۆ چارەسەریەتی ...".[٢٠]

---

[٢٠] العلم يدعوا للايمان / كريسى موريسون / ت: الاستاذ محمود صالح الفلكى / ل:١٥٩- ١٦٢.

سروشت ملكەچی كۆمەڵە یاساو پەیوەندییەكی ئاڵۆزە لە كۆتایی دا سەردەكێشێ بۆ بوونی هاوسەنگی لە نێوان تەواوی توخمە ژینگەییەكان و ئەو توخمانە زۆر بەوردی پێكەوە بەستراونەوەو بە تۆكمەیی ئەركی خۆیان ڕادەپەڕێنن.

بێگومان خوداوەند لەزیندەوەران و بونەوەردا كۆمەڵە یاسەیێكی هەیە نەگۆڕن و لەگەڵ چاخە جۆراوجۆرەكاندا وەكو خۆیان دەمێننەوە ﴿ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلًاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾ یاساكانی خوا چەمكێكی فراوان و گشت لاگرەوەیە و بۆ هەر شتێ بوونی هەیە ، لەگەردیلەیێكەوە بیگری تاهەسارەكان و سەروترو هەموویان بەپێ ی چەند یاساو ڕێسایەكی دیاریكراو بەڕێوەدەچن ، دۆزرانەوەی ئەو یاسایانەش –السنن- لەلایەن زانایانەوە زۆریان بەناوی ئەو زانایانەوە كراون كە دۆزیویانەتەوە ، وەكو (یاساكانی مندالْ لە بۆماوەزانیدا) یاساكانی (ئۆم) لە كارەبادا ، یان ناوی تریان لێ نراوەو وەكو (یاساكانی هێزی كێشكردنی گشتی) لەگەردووناسیدا كە (نیوتن) دۆزیبەوە و تیۆری ڕێژەیی (ئەنشتاین) ، لێرەدا لەناو بازنەی هاوسەنگی گشتیدا هاوسەنگی ژینگەیی هەیە كە لە نێوان بەرهەم هێنان و بەكاربردن و شی كرانەوەدایە لە سیستەمی ژینگەیی دیاری كراودا ، ئەو كەرستانەی ڕووەكیان لێ پێك دێ لەگەڵەوە دەمژرێن تا ئەو ئاژەڵانە بیخۆن ، كە مرۆڤ دەیانخوات.

﴿ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٣﴾ ﴾

كاتێ ئەو زیندەوەرە دەمرێ جارێكی تر بۆ خاك دەگەڕێتەوە ، پەیوەندی تۆكمەی نێوان توخمەكانی ژینگەو تیشكی خۆرو ڕووەك و گیانداران و مرۆڤ و هەندێ لە پێكهاتە گازییەكان لە هاوسەنگییەكی بەردەوامدایە .

﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٢﴾ ﴾

لێرەدا ئاماژە بەهەندێ لەسورە کیمیاییە زەمینی یە ژیانییەکان دەکەین ، کە زیندەگین و دەچنە ناو پێك هاتەکانی ژیان و سروشتەوەو بە سیستەمێکی داخراودا بۆ شێوەی سەرەتای خۆیان دەگەڕێننەوە ، وەکو لەم ئایەتەی رابردوو ئاماژەی پێیان کرد.

وەکو سوڕی ئاو و کاربۆن و نایترۆجین و فۆسفۆرو کبریت و ئاسن و توخمەکان و کانزاکانی تر لە سوڕێکی داخراودا ، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ ﴾ بەڕاستی هەر خوایە سوڕی دەست پێ کردن و گەڕانەوەی لەدەست دایە .

**ئیعجازی ( ١١ ) سووڕی ئاو لە سروشت دا :**

﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴾ ، واتە : سوێند بە ئاسمانی گێڕەرەوە (واتە : هەڵم لە شێوەی باراندا دەگێڕێتەوە ، لە کتێبی گەردووناسی و زەوی ناسیدا ئاماژەم بەگرنگی ئەو سورە داخراوە کرد ، کە ژیانی لەسەر دامەزراوە و زۆربەی زەوی و لەشی گیانداران و ڕووەکی پێك هێناوە (٤/٣)ی زەوی ئاوە .

نووسەرانی کتێبی (البيئـــــة و التربيـــــة)دا دەنووسن : ئاو ڕێژەی گەورەی زەوی پێك دێنێ و لە شێوەی ئۆقیانوس و دەریاو دەریاچەو ڕووبارو ئاوی ژێر زەویدا هەیە ، یان لە شێوەی بەستەڵەکدا و ڕێژەی (١,٥) بلیۆن کم$^3$ دەبێت ، ئاوی سوێر ڕێژەکەی (٩٥-٩٧ ٪) و ئاوی سازگارو شیرین تەنیا بە ڕێژەی (٣-٥٪) هەیە .

ئاوی سازگار لە کەمیدایە لێرەدا بەردەوام بەهۆی زۆربوونی دانیشتوان زۆرتر بەکارهێنانی لەبواری کشتوکاڵی و پیشەسازی دا ئاوەکە پتر بەکاردێت، ئاو توخمێکی گرنگی ژیانە لەزەویدا ، مرۆڤ و گیانداران و ڕووەك بۆ بەردەوامی ژیان پشتی پێ دەبەستن ، ئاو لە شێوەی هەڵمدا یان ئاوی شلدا هەیە لە دەریا و دەریاچە و ڕووبار و ئۆقیانووسەکاندا ، یان لە شێوەی بەستەڵەکدا هەیە لە جەمسەرەکاندا ، لەناوی دەریایی و ئۆقیانوسیدا (٨٧٥ کم$^3$ ی ئاو دەبێ بە هەڵم و (٧٧٥ کم$^3$ )ی لە شێوەی

باراندا دێتەوە خوارو ئەوەی تر لە هەوادا لە شێوەی هەڵمی پەرشدا دەمێنێتەوە ، (١٦٠ کم$^3$ ) لە وشکانی دا ڕۆژانە دەبێ بە هەڵم و هەمان بڕ بەسەر وشکانی و ڕووبارەکان و دەریاچەکان و ئۆقیانووسەکاندا دابەش دەبێت[٢١] .

قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتدا ئاماژە بە گرنگی ئاو بۆ ژیان و زەوی دەکات و فەرموویەتی : (وجعلنا من الماء كل شيء حي) (الانبياء/٣٠) ، واتە : هەموو شتێکی زیندوومان لە ئاو دروست کردووە .

واتە ژیانی سەرەتایی لە ئاو دروست بووەو زۆربەی لەشی گیانداران و ڕووەکیش لەئاو پێك دێت ، بۆ نمونە (ئۆپارین) دەڵێ : ژیانی زیندوو سەرەتا لە ئاودا دروست بووە ، هەم ئایەتەکە ئاماژە دەکات بە گرنگی ئاو لە ژیاندا: ﴿ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْيِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ﴾ ، واتە : خودا باران لە ئاسمانەوە دەبارێنێ و زەوی دوای مردنی زیندوو دەکاتەوە .

پرۆفیسۆر (فرانك ئالن / پسپۆڕی سروشتی بایۆلۆجی) لە ئەمریکاوە دەنووسێ : (بەرگێکی گازی دەوری زەوی داوە ئەو گازانەی لەخۆ گرتووە بۆ ژیان پێویستن و (٥٠٠) میل بەرزترن ، چڕی ئەو بەرگە هەوایە لە ئاستێ دایە ملیۆنەها شوهب ڕۆژانە بەردومانمان دەکەن بە خێرایی (٣٠) میل/چ و ناگەن بە زەوی ، بەرگە هەوا لە زەوی پلەی گەرمی لە ئاستێکی لەباردا دەپارێزێت ، هەڵمی ئاو لە ئۆقیانووسەکانەوە بۆ شوێنە دوورەکانی ناو کیشوەرەکان هەڵدەگرێت ، لەوێ هەڵمەکە چڕ دەبێتەوەو دەبێ بە باران و زەوی دوای مردن زیندوو دەکاتەوە ، باران سەرچاوەی ئاوی سازگارە ، گەر باران نەبوایە زەوی دەبوو بە دەشتێکی ڕەق و ڕووت و بێ ژیان ، بەو شێوەیە دەبینین هەواو ئۆقیانووسەکانی سەر زەوی هاوسەنگی لە سروشتدا ڕادەگرن .

---

[٢١] التربية و البيئة / ل:٢١

ئاو چوار خاسیەتی هەیە ، ژیان لە ئۆقیانووسەکان و دەریاچەکان و ڕووبارەکاندا دەپارێزرێن ، بە تایبەتی لە زستانی ساردو سڕو درێژ خایەندا ، ئاو بڕێکی زۆر لە کاتی نزمی پلەی گەرمیدا هەڵدەمژێ ، ئەو پەڕی چڕی ئاو (٤ س°) سەهۆڵ و شەختە لە دەریاچەکان سەرئاو دەکەوێ ، چونکە چڕی لە ئاو کەمترەو سەر ئاو دەکەوێ ، بەمەش دەرفەتی ژیان پتر دەکات بۆ ئەو گیاندارانەی لەناوی ناوچە ساردەکاندا دەژین، کاتێ ئاو دەیبەستێ و شەختە دەکات بڕێکی زۆر گەرمی فڕێ دەدات و ژیانی ناو دەریاکان چەپاڵە دەدات.

زەوی وشکانی ژینگەیەکی لەبارە بۆ زۆر لە زیندەوەران ، (خاك) ئەو توخمانەی تێدایە ڕووەك هەڵیان دەمژێ و جۆرەها خۆراك دروست دەکەن گیانداران پێویستیان پێ یان هەیە ، زۆر کانزا لە نزیك ڕووی زەویدا هەیە ژیانی ڕەخساندووە بۆ شارستانی ئێستاو دروست بوونی زۆرێ لە پیشەسازیەکان و تەکنەلۆژیاو هونەرەکان ، ئەمەش ئاسانکارییەکە لەلایەن خوای کارزان و شارەزاوە ، ڕێتێ چوونییە ڕێکەوتێکی هەڕەمەکی بێت[٣٢].

خودا فەرموویەتی : ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴾ ، واتە : لە ئاسمانەوە ئاوی پاکژمان بۆ باراندوون .

بێگومان باران سازگارەو پالأوتەیەو دلۆپێنراوە لە ڕێگای بەهەڵم کردنەوەو ، خاوێنە بۆ خواردنەوەو دوورە لە پیسی و میکرۆبەکان .

خودا دەربارەی ئاوی ژێر زەوی فەرموویەتی ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ ﴾ ، واتە : ئاومان بە ئەندازە لە ئاسمانەوە باراندووەو لەناو زەویدا جێگرمان کردووە .

---

[٣٢] الله يتجلى في عصر العلم / ل:٦-٧

لێرەدا قورئان دەری دەخات ئاو بە ئەندازە دەبێ بە هەڵم و بەئەندازە دەبێ بەباران و دەبارێت ، ئاوی ژێر زەوی سەرچاوەکەی لە بارانەوەیە .

ئـاوی ژێـر زەوی لـەناو کۆگـاو عـەمباری قـوڵ و جیاجیـادان لـەناخی زەوی داو لەچینەکانی ژێرەوەدا کە بەناو تاوێرەکان و لم و چەودا چووەتە خوارەوە و ڕۆچووە ، هەندێ لە دەوڵەتانی جیهان ئاوی ژێرزەوی سەرچاوەی ئـاوی خواردنەوەیانـە و بـۆ ڕووەك و گیاندارانیش بەکاری دێنن.

ڕووەك و گیانداران و مرۆڤ ئاو بەکاردێنن ، ئاو لە (٦٠ — ٧٠ ٪)ی لەشـی مـرۆڤ پێـك دێنێت ، زۆر نابات ئەو ئاوە لە شێوەی هەڵمدا دەگەڕێتەوە وەکو لـە دۆخـی ئـارەق و دەردان و هەناسـە و هـەڵمی کارگـەکان ، یـان لـە شـێوەی ئـاوی شـلدا هەیـە ، کـە لـە کاروباری ماڵەوەو پیشەسازیدا لەدەست دەڕوات.

هەموو ئەو کردارانە پشت بـەو کـەش و هەوایـە جیاجیاکـان دەبەسـتن لـە گـەرمی و پەستانی هەواو باو کرداری ڕۆیشتن و دزەکردنی ئاو بۆ ناو خاك ، یـان ڕۆیشـتنی بـۆ ناو ڕووبارەکان و دەریاکان ، بەکورتی کرداری سوڕی ئـاو بـەو هاوکێشـە دەپێورێـت : (هەڵم بوون + ئارەقەکردن = چڕبوونەوە[٣٣]).

---

[٣٣] التربية و البيئة / ل : ٢١- ٢٢

**ئیعجازی ( ١٢ ) سووڕە گازییەکان لەوانەش سووڕی کاربۆن ( carbon ) :**

﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا ﴾ ، واتە : ئەو خوایەی لە داری سەوز ئاگری بۆ دروست کردوون لە کاتێکدا ئێوە دای دەگیرسێنن –ئاگر بریتی یە لە وزەیەکی ڕووناکی- .

بێگومان داری سەوز (کلۆرۆفیل) وزەی خۆر وەردەگرێ لەکرداره ڕۆشنه پێکهاتنـدا ، کاربۆن ماتەوزەییێکە لەدرەخت و گیاندارانـدا ، لە درەختەکانـدا دوای وشك بـوون دەسووتێ ، زۆرێ لە کاربۆن بۆ خەڵووزو نەوت دەگۆڕێت.

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ ، واتـە : ئایـا ئـەو دارەی ئێـوە دایدەگیرسـێنن ئێـوە درەختەکەتان دروست کردووە یان ئێمە دروستمان کردووە؟

نمونەیەکی سەیر ئەوەیە باب و باپیرانمان لە ڕێگای بەرد ئەستێ (الزنـاد) و ئاسـنیان لێکداوە قاوەیان پێ ئاگرداوە بۆ مەبەستی ئاگرکردنەوە . (قاوە) : ماددەیێکـە لـەناو درەختی وشك و گەندەڵدا پەیدا دەبێت و زوو گـڕ دەگرێـت . پاشـان کـرداری ڕۆشـنە پێك هاتن و وەرگرتنی وزەو گەرمی لەخۆر بریتییە لە : سووتاندن ، لەمرۆڤدا کاتێ مرۆڤ لە ڕێگای هەناسەدان ئۆکسجین وەردەگرێ بـۆ ئۆکسـاندنی خـۆراك بریتییـە لـە سووتاندن ، گەر نـایترۆجین لـە هـەوادا نەبوایـە ئۆکسـجین هـەموو خانـەکانی لەشـی گیانداران و مرۆڤی دەسووتاند!

گەر گەرمی و ئۆکسجین و ئاو نەبوایە هەور و باران و بامان دەست نەدەکەوت و ژیان مسۆگەر نـەدەبوو لەزەویـدا ، کاتێـك ئۆکسـجین هەڵدەمـژین لەگـەڵ خوێنـدا بـەرەو ئەندامەکانی لەش دەڕوات بۆ کرداری ئۆکساندن ، لـەکاتی دانـەوەی هەناسـەدا دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەداتەوەو بۆ ناو هەوا دەڕوات.

وەكو لە كتێبی (التربیة و البیئة) دا باسكراوە (كاربۆن سوڕی تەواوی هەیە و بەهەمان ئەو خێراییەی لەناو ژینگەدا نامێنێ جارەكی تر دەگەڕێتەوە ، گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن (٠٣٪)ی هەوا پێك دێنێ ، گەر لەو ئەندازمیە زیاتر بكات ، كێشەی ژینگەیی و تەندروستی دێنێتە ئاراوە .

ئەو گازە بە سووڕێكی داخراودا ڕەت دەبێت ، لەو ماوەیەدا زۆر زیندەوەر بەكاری دێنن و لە زۆر كارلێككردندا بەكار دێت ، پاشان زۆر نابات بۆ بەرگە هەوا دەگەڕێتەوە .

سووتاندنی سووتەمەنی (الوقود) و دارستانەكان و كرداری هەناسەدان و وەرگرتنی مرۆڤ و سووتاندنی نەوت (پەترۆڵ) و خەڵوزو شیبونەوەی كەرەستە ئەندامییەكان ، هەموو ئەوانە (دووەم ئۆكسیدی كاربۆن) دەدەنەوە ، زۆری پێ ناچێ لە ڕێگای (ترشە بارانەوە) دەگەڕێتەوە ، یان لە ڕێگای مژرانیەوە لە ڕێگای ڕووبەرە ئاوییەكانەوەو لەگەڵ هەڵمی ئاو یەكتر دەگرێ ، تەنۆلكەكانی (جیری) پێك دێنێ ، لە قوڵایی زەریاكان و دەریاكاندا دەنیشێت ، هەرچی ڕووەكی ئاوی و وشكانییە توخمەكی سەرەكی یە لە سوڕی كاربۆندا ، لەرێگای ڕۆشنە پێكهاتنەوە ئەو ڕووەكانە (دووەم ئۆكسیدی كاربۆن) هەڵدەمژن بۆ پێك هێنانی زنجیرەی (كاربۆن)ی و (كاربۆهیدرات) كە بۆ ئەو گیاندارانەی بەكاری دێنن دەگوازرێتەوە پاشان بەرەو مرۆڤ.

جگە لەو بڕە كاربۆنەی وەكو چاوگێكی وزە بەكاردێ و ئەو كاربۆنەی بۆ هەواو خاك دەگەڕێتەوە ، بەهەناسەدانی مرۆڤ و گیانداران ، یان بەهۆی سووتان ، یان بەهۆی شیبوونەوەی لاشەی مردووان ، یان فڕێدانی پاشەڕۆكیان ، كە زیندەوەرانی تایبەتی لەسروشتدا بۆ توخمی سەرەتایی دەگێڕنەوە ، یان بۆ بەرگە هەوا دەگەڕێتەوە و سوڕەكە دەوام پێ دەدات ، دووبارە بەشێكی گەورەی كاربۆن بۆ ماددەی عەمباركراو دەگۆڕێ وەكو (خەڵوز)و (نەوت) و بەعەمباركراوی لەناخی زەویدا دەمێنێتەوە ،

دوای ئەوەی مرۆڤ دەریدێنێ بۆ بەکارهێنانی دەگێڕێتەوە ، جگە لە بوونی ئەو بڕەی لە بەردە کلسی یەکاندا هەیە[24] .

زانایان دەریان خستووە یەك خانەی سەوز (الاخضر) گەر بدرێتە بەرهەتاو لەیەك خولەکدا (٢٠) ماددەی ئەندامی دروست دەکات ، سەرباری هەندێ ماددەی کانزایی و ئۆرگانی ، زۆربەی ئەو هەوایەی وەری دەگرێ کاربۆنە ، کە لە پێکهاتنی ڕووەکدا بەشداری دەکات ، پێکهاتەی ڕووەك وەکو مرۆڤ پێ ی وایە لەخاکەوە نیە ، بەڵکو لەو کارگە مەزنەوەیە خودا لەگەڵا سەوزەکاندا دایناوە ، وەکو خوا فەرموویەتی : ﴿ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا ﴾ خوا ئاماژە دەکات گەر گەڵای سەوز نەبوایە ڕووەك نەدەبوو [25] ، چونکە گەڵا سەوزەکان لە کارگەکانیاندا ماددەی ئەندامی دروست دەکەن بۆ گەشەکردنی ڕووەك و پێ هەڵاچوونی .

بێگومان کاربۆن بەشێوەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لەهەوادا هەیە و ڕووەك لەکاتی ڕۆشنەپێك هاتندا وەری دەگرێ زیندە پێك هاتەکان پەیدا دەبن ، مرۆڤ و گیانداران ئەو زیندە پێکهاتانە دەخۆن بۆ چالاکییەکان ، بەو شێوەیە دارو درەختەکان و گژو گیایەکان هاوسەنگی هەوا ڕادەگرن چونکە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژن و ئۆکسجین بەرەڵا دەکەن ، کە توخمێکی گرنگە لە ژیانی گیانداراندا.

بەو شێوەیە چۆن ڕووەك بۆ خۆراك گرنگە بۆ ڕاگرتنی ڕێژەی کاربۆن و ئۆکسجینیش گرنگەو بەسنوورێکی نەگۆڕ ئەو دووگازە دەپارێزن لە هەوادا ، ڕووەکەکان لەکاتی ڕۆشنە پێك هاتندا بڕێکی زۆر دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژن و ڕێژەیێکی زۆر

---

[24] التربية والبيئة / ل : ٢٢- ٢٣

[25] آيات الله في الافاق / د.محمد راتب النابلسي/ ل :٢٢٨

ئۆکسجین دەدەنەوە ، بە پێچەوانەوەی مرۆڤ و گیانداران ، بەمەش جێگای ئەو ناتەواوییە دەگرێتەوە لەکرداری هەناسەو سووتاندا بەکارهاتووە .

خودای پەروەردگار دەربارەی ئەم ڕاستییە مەزن و سەرسوڕهێنەرانە دەفەرمووێ :

﴿ وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ ﴾ ، واتە : سوێند بە بەرەبەیان کاتێ هەناسە دەدات.

وەکو (هارون یحیی) و (عبدالرحمن سعد صبي الدین) ئاماژەیان پێداوە ، خودا لەم ئایەتەدا سوێندێکی مەزن دەخوات بەسپێدە ، کاتێ هەناسە دەدات ، کات گرنگی خۆر لە بەیانیدا مرۆڤ دوای پشوودان و خەوتن دەست بە هەناسەدان دەکاتەوە ، ئاشکرایە هەناسە (التنفس) کە خودا سوێندی پێ خواردووە لەبەرەبەیاندا گرنگترین کرداری زیندەگییە گیانداران پێوەی هەڵدەستن ، لەکاتی هەناسەی مرۆڤ و گیاندارانـدا ئۆکسجین هەڵدەمژن بۆ ناو سییەکان و لەو ڕێگایەوە ئۆکساندنی خۆراك و سوتاندنی لەخوێندا دێتە دی و وزە بەخانەو شانەکانی لەش دەدات ، گەر لە چەند خولەکێ ئەم کردارە بوەستێ بێگومان مرۆڤ و گیانداران دەمرن ، هەر لە بەرەبەیانـدا کردارێکی زۆر ئالۆز ڕوودەدات ئەویش هەناسەدانی ڕوەکەکانە لەکاتی دەرکەوتنی خۆردا ، ڕووەك بەکرداری ڕۆشنەپێکهاتن دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی ژەهراوی و کوشندە هەڵدەمژن و ئۆکسجین بەرەڵا دەکەن .

(٣٠٪)ی ئۆکسجینی هەوا ڕووەك بەرهەمی دێنێت و (٧٠٪) تر ڕووەك و زیندەوەرە تاکخانەکانی ناو دەریاکان و زەریان بەرهەم دێنن ، ئەو کردارە بە چاو نابینرێ ، چونکە ئەو میکانیزمە ئەلکترۆنەکان و گەردیلەکان و گەردەکان بەکاردێنێ ، لەگەڵ ئەوەشدا ئاکامی ئەو کرداری ڕۆشنە پێك هاتنە دەبینین ، ئێمە توانای مژینی ئۆکسجین و بەدەستهێنانی خۆراکمان هەیە ، کە ژیانمان دەپارێزن ، ملیۆنەها ملیۆن تاقیگە لەڕووەکە سەوزەکاندا (الشجر الاخضر) بەو کردارە کیمیاییە هەڵدەستن و ئۆکسجین و ئەو خۆراکە بەرهەم دێنن ، کە وزەیان لێ وەردەگرین.

لێرەدا قورئـان ئامـاژە بـە کـرداری ڕۆشـنەپێك هـاتن دەکـات لەبەرەبەیانـدا لەگـەڵ دەرکەوتنی خۆر لە ئاسۆدا ، گەر ئەو کردارە بوەستێ ژیان فڕی تێ دەکەوێت[٣٦] .

بێگومان گەورەترین کارگەکانی دەستی مرۆڤ ناتوانێ خۆی لەقەرەی ئەو کردارانە بدات لەیەك گەڵای سەوزدا ڕوودەدات ، گەر ئەو مادده سەوزەیە (کلۆرۆفیل)بەر خۆر بکەوێ گەردەکانی کلۆرۆفیلەکە بۆ کورەیێکی گەرمی سەخت دەگۆڕێن ، گەردەکانی ئاوی ناو گەڵاکە ورد دەکەن و بۆ ئۆکسجین و هایدرۆجین بەوزەو گەرمی یەك دەبێ بۆ ئاو گەرم کردنەکە بگاتە (٢٥٠٠°)س ، کەواتە : گەر مرۆڤ و گیانداران و ڕووەك بەردەوام ئۆکسجین هەڵدەمژن چۆن ئەو ڕێژەیە بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە (٢١٪)ی ئۆکسجین لە هەوادا؟

هەندێ داتا دەڵێن : کۆی مادده سەوزەکان (الاخضر) لەزەویدا (١٠٠) بلیۆن تەن کاربۆن لەگەڵ (٢٠) بلیۆن تەن هایدرۆجین بۆ خۆراك دەگۆڕن ، دیسان بۆ (١٠٠) بلیۆن تەن ئۆکسجین ، بۆ ئەوەی هەوا لە ڕاست ڕێژەی ئۆکسجین و ئازۆت و گازی کاربۆن.

سەلێندراوە ئەو وزەیەی ڕۆشنە پێکهاتن ئەنجامی دەدات لە شیکردنەوەی کلۆرۆفیلی (الاخضر – الیخضور) دا (١٠) ئەوەندەی ئەو وزەیە دەبێ مرۆڤ ساڵێ لە جیهاندا بەکاری دێنێت ، یەك گەڵا لە کاتژمێرێکدا (١)گم خۆراك دروست دەکات ، لەشەودا ئەو خۆراکە بۆ (شەکر)ی دەگۆڕێ و دەیکاتە خۆراك بۆ ڕووەك ، یان لە شێوەی (نیشاستە) دا کۆی دەکاتەوە وەکو سپێر لە ڕووەکدا ، وشەی (الاخضر) لە قورئاندا مەبەست لە کلۆرۆفیلە (الیخضور) کاریگەرییەکی مەزنە لە ڕووەکەکاندا [٣٧] .

---

[٣٦] آیات الاعجاز العلمي / عبدالرحمن سعد صبي الدین / ل: ٤١–٤٢ بەکورتکردنەوە

[٣٧] آیات الله في الافاق / ل:٢٣١- ٢٣٢ .

بێگومان هەموو کردارێکی زیندەگی لە وزەی خۆر وەردەگیرێ ، ڕووەکە سەوزەکان لە ڕێگای ڕۆشنە پێکهاتنەوە وزەی خۆر بۆ وزەی کیمیایی ماتە وزە (الکامنە) دەگۆڕن و بۆ گیاندارانی تری دەگۆڕن بە خۆراك[28].

قورئان ئاماژە بە ماتـە وزە دەکات کاتێ دەفـەرمووێ : ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا ﴾ - بێگومان کرداری ڕۆشنە پێـك هـاتن خـۆراك بـۆ مـرۆڤ و گیانداران دروست دەکات ، ئۆکسجین لەکاتی هەناسە وەرگرتندا خواردنی ناو خانەکان دەسـووتێنێ و دەیئۆکسـێنێ و زینـدەوەران بـۆ کـرداری جوڵـەو خواردەمـەنی و پـێ گەیشتن و چالاکی تر سوودی لێ دەبینن.

## ئیعجازی ( ١٣ ) سووڕی نایترۆجین لە سروشتدا :

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ (الواقعة: ٦٨-٧٠) ، واتـە : ئایـا ئـەو ئـاوەی دەبیـنن دەیخۆنەوە ، ئایا ئێوە لە هەوری بە باران و بروسکە باراندوتانە یان ئێمە دەیبارێنین ، ئەگەر بمانەوێ ئاوی باران ترش و تفت دەکەین ئەی بۆ سوپاسگوزاری خوا ناکەن ؟

لێرەدا قورئانی مەزن چەند ئیعجازێکی زانستی مـەزن ، وەکو گـەورەترین بـەهرەی خوا بۆ مرۆڤایەتی دەخاتەڕوو ، بۆ ئەوەی خودا بناسن و بە بەهرەو چاکەکانی بزانن و سوپاسگوزاری بکەن :

١. لێرەدا قورئان دەری دەخات ئاوی باران ئاوێکی سازگارە ، خوداوەنـد دەیـدڵۆپێنێ لە ڕێگای بەهەڵم کردنداو خوێ بەجێ دەمێنێت لەدەریاو ئۆقیانووسەکان دا.

---

[28] مبادیء علی البینة / بریح کوبال / ان . بهاردواج / ت: د:ریزان محمد صالح / السید بشیر علي بشیر نعمة / ل: ٥٠/ ط ١٩٩٠.

٢. سووڕی ئاو گرنگترین سووڕە ، نەك هەر بۆ ژیان پێویستە ، بەڵكو لە پێكهێنان و پیشەی سیستەمەكانی ژینگەشدا چالاكی هەیە ، ئاو لەگەڵ وزەدا دەستی تێوەردانی هەیە ، جۆرەكانی ژینگەیی و سروشتی و كیمیایی لێوە دروست دەبێت، سوڕی تەواوی توخمەكانی تر پشت بە ئاو دەبەستێ ، چونكە ناوەندێكی توێنەرەوەیە بۆ مژینیان ، دیسان (H) بۆ كەمە دابەش بوونی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن (الاختزال) لە ڕۆشنە پێك هاتندا ، دیسان سوڕی ئاو پێك هاتە جیاوازەكانی ژینگە ڕێك دەخات لە (ئاو ، بەرگە هەوا ، خاكی زیندووی زەوی ) لەیەك یەكەدا[٢٩].

٣. ئاماژە بە نایترۆجین و سوڕەكەی و گۆڕانی بۆ نیترات دەكات لە كاتی باران و بروسكەدا ، كە كردارێكی كەهرۆ كیمایی یە . (احاجا) مەبەست لە (نیترات)ە ، خودا وەكو پەیین بەڕێژەیەكی دیاریكراو لە بارانی دا دادەنێت تا ڕووەك سوودی لێ ببینن و ئاوی سازگاری باران ترش نەكات و ژیان نەخاتە مەترسییەوە .

(المزن) وشەیێكی زانستیە (الركام المزنی cb) زۆر هەورێكی بەكەڵەكەو خێرا گەشە دەكات و لوتكەكانی دەیبەستێ و بۆ هەورێكی بە بروسكە دەگۆڕێ و تەزرەو باران و بروسكە پەیدا دەكات لوتكەكەی دەگاتە (١٤كم) ، وەكو لە (گەردوونناسی) دا باسمان كرد ، ئەم نتریتە لە كرداری بروسكەدا ڕوودەدات .

(بریج كوبال) دەنوسێ : (نیترات یان جێگیر كردنی نایترۆجینی (تثبیت النایتروجین – Nitrogen fixation) لەو كردارەدا نایترۆجین گازی بۆ چەند نتراتێ دەگۆڕێ و بە ڕێژەییەكی كەم لەكاتی بروسكەدا لەناوەندێكی كەهرۆ كیمیاییدا ڕوودەدات ، بەزۆری لەناوچەكانی (هێڵی یەكسان) هەیە ، كەبروسكەو گەردەلولی گرمەی هەوری هەیە ، بڕێكی زۆر لە نایترۆجین بۆ نیترات دەگۆڕێت و بڕەكەی (٣٥ملگم) نایترۆجینە

---

[٢٩] مبادیء علم البیئة / ل : ٦٣

، م ٢٠ ساڵ-١) داو بەو شێوەیە تێکەڵ بە خاك دەبێ لەناو خاکداو بەرپرسە لە جێگیرکردنی نایترۆجینیدا.

سەلمێندراوە جێگیرکردنی زیندەگی (٧٠٠) ملگم N م -٢ لە ساڵێ دا تێکەڵ بەخاك دەکات ، لە هەندێ خاکدا چەند قات دەبێ ، ئەو کرداره وزەیێ بەرهەم دێنێ (٢٠) کیلۆ تا وزە (السعرة) دەبێ بۆ هەر گەردێکی نایترۆجینی و لەلایەن زیندەوەرانی جێگیرکەری نایترۆجینەوە بەکاردێت[30].

کەواتە خودا لەو نایەتەدا سەرنجمان بۆ نتریت ڕادەکێشێ ، کە پەینێکی گرنگەو ڕووەك پێویستی پێ دەبێ بۆ دروست کردنی خۆراك و تامێکی ترشی هەیە .

وە خودا ڕوو لە مرۆڤی ژیرو زاناو ڕۆشن بیر دەکات و دەفەرمووێ : ﴿ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ ، واتە : ئایا ئەو تۆوەتان بینیوە کە ئێوە دەیچێنن ئایا ئێوە دەیڕوێنن یان ئێمە دەیڕوێنین ؟ گەر بمانەوێ ئەو ڕووەکە سیس دەکەین و وردی دەکەین و ئێوە پەشیمان دەبنەوە .

(تفکهون) زۆر مانای هەیە وەکو (پەشیمان بوونەوە) واقوڕمان ، یان لە (فاكهة) هاتووە وەکو (الراغب ) لە (مفردات) ئاماژەی بۆ کردووە ، بەو پێیە ڕواندنی ڕووەك ئەوەندە ئاسان نییە ، بەڵکو تەنیا لە دەسەڵاتی خوای زاناو داناو کردگاردایە ، ئەو خاکی دروست کردووە ، ئەو ئاو و بارانی بەنیتراتی بۆ دەبارێنێ ، ئەو بەکتریای نایترۆجینی بۆ دەنێرێت ، ئەو گەرمی و هەواو ڕوناکی و ئاوی پێ دەدات ، ئەو خاکی بۆ نەرم دەکات لە ڕێگای ئاو و باران و کرمی زەوی (گڵ خۆرکە)دا.

کرمی زەوی (گڵ خۆرکە) کرمێکی درێژە لەژێر خاکدایە (٢٠٠) ئالقە دەبێت ، لەیەك دێبەر زەویدا (٥٠) هەزار کرمی تێدایە ، ئەم کرمانە هەم خاك نەرم دەکەن و هەم

---

[30] مبادیء علم البیئة / ل : ٦٨- ٦٩.

پاشەڕۆك فڕێ دەدەن و بەهەموو لایێکی زەویدا بلاّوی دەکەنەوە ، لەهەر دێبەرێك زەویدا سالآنە (١٨) تەن زبلّ فڕێ دەدەن ، بەو شێوەیە وەکو گاسنێکی سروشتی لەزەویدا کاردەکەن بۆ بە پیت کردنی زەوی و ئاسان کردنی باگۆڕکێ تێ یدا !

ئایا ئەم کارانە بەمرۆڤ ئەنجام دەدرێن ؟؟ نایترۆجین (Ns) لەتوخمە بنچینەییە جیاکەرەوەکانی پرۆتینەکان دادەنرێ و ڕووەك نایترۆجین لەخاك وەردەگرێ بەتایبەتی خوێیەکانی (nos) و (ئامۆنیۆم +NH) بۆ دروست کردنی خانەکانی گەشە ، کاتێ ڕووەکەکە مرد ئەو خانانە دەڕزن و شی دەبنەوە بۆ خاك دەگەڕێنەوە .

پاشان بروسکەی هەور ئۆکسجین و نایترۆجین لە هەوادا یەك پێ دەگرێ و ئۆکسیدی نایترۆجینی (NO٢ – NO٣) پێك دێنن و لە باراندا دەتوێنەوەو نایترۆن (HNO٢) و ترشی نایترێکی سوك (HNO٣) دروست دەکەن و دەچنە ناو خاکەوەو دەبنە پەیین بۆ ڕووەکەکان.

نایترۆجین لە هەوادا جێگیرەو (٧٩٪)ی هەوا پێك دێنێت و بەشداری لەپێك هاتەکانی زۆرێ لە ماددە دەکات ، کە لە پێکهێنانی ژیاندا بنەمان ، ڕووەك وەك باسکرا ڕاستەوخۆ سوود لەو نایدرۆجینە وەرناگرێ ، بەلکو بروسکەو چالاکی بورکانی یان بەکتریای ناو خاك بۆ نتریتی دەگۆڕن ، نایترۆجین لەزۆر شێوە ڕووەکە بالأکان سوودی لێ وەردەگرن وەکو (نترات و نتریت و ئامۆنیا) کاتێ مرۆڤ ئەو ماددە زیندەگیانە دەخوات ، یان گیانداران بۆیان دەگوازرێتەوە ، دوای مردنی ئەو گیاندارانە بەکتریاو کەڕووەکان ئەو لاشانە دووبارە شی دەکەنەوەو نایترۆجینی ئەندامی بۆ شێوەی نا ئەندامی دەگۆڕن ، کە بە شێوەی سەرەکی ئامۆنیایەو پاشان بەکتریایەکە بۆ (نتریت NO٢) و (NO٣) دەگۆڕن ، دوای ئەوە یان ڕەگەکان دەیمژن یان دووبارە بۆ گازی هایدرۆجین دەگەڕێتەوە بۆ ناو هەوا .

قورئان ئاماژە بۆ ئەو گۆڕانانە دەکات لەماددەی زیندەوە بۆ نازیندە یان بە پێچەوانەوە : ﴿ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا

﴿ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴾ [الروم] واتە : زیندە لە مردوو دەردێنێ و مردوو لە زیندە دەردێنێ و زەوی دوای مردن زیندوو دەکاتەوە ، ئایا ئەمانە موعجیزەی بێ وێنە نین بۆ قورئان؟

**ئیعجازی (١٤) ترشە باران** (الحموضـــي المطـر):

﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ⑩ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ⑪ ﴾ [الدخان : ١٠ - ١١] ، واتە : چاوەڕێ بکە ئاسمان بەدوکەڵێکی ئاشکرادێ ، خەڵکی دادەپۆشێ ئەمەش سزایەکی بەچێژە.

بێگومان پیس بوونی ئاسمان بە دووکەڵی ئامێرەکانی تەکنەلۆژیاو پەترۆڵ و خەڵوز یەکێکە لە کێشەکانی دەوڵەتە پیشەسازییەکان و نیشانەیەکی قیامەتە ! لێرەدا قورئان پێشبینی هاتنی ئەم دیاردەیە دەکات.

دیسان قورئان ئاماژە دەکات بە جەنگی کەنداو کاتێ بەفەرمانی (صدام حسێن) زیاتر لە (٧٠٠) بیرە نەوتی کوێتی تەقێنراوە ، لە کوردستان بە چاوی خۆمان دەمانبینی چۆن ڕەشاو و نەوت لەگەڵ باراندا دەباری .

هەمیسان قورئان ئاماژە بۆ کیمیا بارانی هەڵەبجەو بالیسان و ناوچەکانی تر دەکات ، دوکەڵی ژەهراوی ئەو ناوچانەی گرتەوە،کە لەلایەن ڕژێمی(صدام)ەوە جێ بەجێ کرا.

ئەم دووکەڵە ئاماژەیە بۆ تەقینەوەی ناوکی کاتێ ئەمریکا هێرۆشیمای یابانی پێ بۆردومان کرد لە ساڵی (١٩٤٥)دا ، دیسان ئاماژە بۆ جەنگی مەسیحی دەجاڵ و تەقینەوەی ناوکی دەکات لەو جەنگەدا.

هەموو ئەوانە بەرگە هەوایان پیس کردووە بە دووکەڵ و کاری کردۆتە سەر پیس بوونی ڕووبارەکان و دەریاچەکان و کەم بوونەوەی سامانی ماسی .

(خیر شاهین) دەنووسێ : ولاَتە تەکنەلۆجیەکان تووشی کێشەی بارانی ترش بوون ، کە لە سوتەمەنی وەکو پەترۆڵ و خەڵوزەوە پەیدا دەبێ ، ئەو گازانەی پەیدا دەبن لەئاودا دەتوێنەوەو لەگەڵ باراندا دەبارن و رێژەی ترشی ئاو زیاتر دەبێ و کاری خراپ دەکاتە سەر دارستانەکان و بیابانەکان و سەرچاوە ئاوییەکان .

ترشی باران کاریگەری سەلبی دەبێ بۆ سەر مرۆڤ ، لەگەڵ باراندا دەبارێ لەگەڵ هەندێ کانزای ژەهراوی کارلێك دەکات و ئەو کانزایانە بەرەڵا دەکات ، لەوانەش کانزای (جیوە) و (ئەلەمنیۆم) ، بۆ نمونە : لە (سوید) لە (١٠٪)ی گۆمەکانی بە جیوە پیس بوون بەهۆی بارانی ترش و ماسییەکانی بەکەڵکی خواردن نایەن،دیسان بارانی ترش لەگەڵ مس یەك دەگرێ،کە لە بۆری ئاودا بەکاردێ‌و ئەو ئاوەژەهراوی دەکات [٣١].

(لـــو نشـــاء جعلنـــاه اجاجـــا افـــلا تشـــكرون) !!

**ئیعجازی ( ١٥ )  سوری ئۆکسجین لە هەوادا :**

وەکو باسکرا قورئان لە زۆر ئایەتدا بۆ بەردەوامی ژیان ئاماژە بە کرداری هەناسەو ئۆکسجین دەکات ، وەکو: ﴿ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ۝١٨ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴾ التكوير ، واتە : سوێند بە سپێدە کاتێ هەناسەی دەدا ، ئەو قورئانە فەرمایشتی پەیامبەرێکی بەرێزە.

﴿ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ الأنعام ، واتە : کێ خوا بیەوێ گومڕای بکات سنگی تەنگ دەکات وەکو کەسێ بە ئاسماندا بەرز بێتەوە .

[٣١]علوم الارض والبيئة / خير شواهين / ل : ١٦٨- ١٦٩.

لێرەدا قورئان ئاماژە بە بوونی ئۆکسجین دەکات بۆ هەناسەدان ، ئاماژە دەکات تا بەرز بینەوە بۆ ئاسمان پاڵەپەستۆی هەوا کەم دەبێتەوە .

ئۆکسجین بەبڕیکی زۆر لە هەوادا هەیە بەرێـژەی (٢١٪) ، دیسان بەیەك گرتوویی هەیە وەکو ئۆکسیدەکان و کاربۆنەکان لە تاوێرەکاندا ، هەروەها لە ئاودا (بە تواوەیی) هەیە ، ڕووەکەکان لە شی کردنەوەی ڕووناکی ئاودا لە کرداری ڕۆشنە پێکهاتندا ئۆکسجین بەڕەڵا دەکەن ، دیسان ئۆکسجین دووبارە لە کرداری هەناسەی تەواوی گیانداراندا بەکار دەبرێ ، هەروەها لەئۆکسید کردنی کەرستە ئەندامییەکاندا.

دۆخێکی تری ئۆکسجین هەیە کە (ئۆزۆن)ە چینی (ستراتوسفیر)ی دەرەوەیە ، ئەرکێکی گەورەی لەسەرە ، ئەویش پاراستنی ژیانە لە تیشکە ئایۆنە شەپۆل کورتەکانی وەك (سەرووی بنەوشەیی)[٣٢].

قورئان دەربارەی چینی ئۆزۆن فەرموویەتی : ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ﴾ ، واتە : سەرەوەی زەویان کردووە بەسەقفێکی پارێزراو .

ئەو ئۆکسجینەی هەڵی دەمژین لە دوو گەردیلەی ئۆکسجین پێك دێ ، بێ تام و ڕەنگ و بۆنە ، لەکاتی بروسکەدا گەردەکانی ئۆکسجین بۆ جۆرە ئۆکسجینێکی تری چالاکتر دەگۆڕێن بەناوی (ئۆزۆن) زۆرجار دوای بروسکە بۆنێکی تیژ دێ ئەوە بۆنی ئەو ئۆزۆنەیە ، گەردەکەی لە (٣) گەردیلە نەك لە (٢) گەردیلە پێك بێت[٣٣].

ئەمانە هەموویان بەرهەمی بروسکەن بۆیە خوا فەرموویەتی : ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾ واتە : یەکێ لە بەڵگەکەکانی خوا ئەوە بروسکەتان پیشان دەدات کەترس و تەمای تێدایە.

---

[٣٢] مبادیء علم البیئة / ل: ٦٦-٦٧.

[٣٣] کنوز العلم / ولیم فرجارا / ت : د.سید رمضان هدارة / ل :. ٢٦٢

**ئیعجازی ( ١٦ )      سووڕی ( گۆگرد ) لەسروشت دا :**

زۆر لەسـەلەف ئایـەتی﴿ فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ﴾ ---
وشەی (الحجارة) واتە : بەرد ، بە گۆگرد مانا دەکەن.

خودا لێرەدا ئاماژە دەکات سووتەمەنی دۆزەخ مرۆڤ و بەردە .

(ابن مسعود) و (ابن عباس) و (ابو جعفر محمد بن علي) سەلامی خوایان لێ بێ (الحجارة) بە گۆگرد (کبریت) مانا دەکەن ، (ابن کثیر) لە (١ج /تفسـیر القـران العظیـم) دا باسی کردووە .

(بریج کوبال) دەنووسێ : (سوڕی گۆگرد –کبریت- زۆر لە سوڕی نـایترۆجین نزیکەو لـە قۆناغـەکانی ($SO_2$) ی ئۆکسـید کـراو و ($H_2S$) و کەمـە دابـەش بـوون پێـك دێ ، ڕووەکیش لەشێوەی گـۆگردات بـەکاری دێنێـت ، تـەنیا لـەماوەی مانەومیـدا لەهـەوادا نایترۆجین جیاوازە ، ئـەو تەمـەنی کورتـەو عـەمباری ئـەو خاکەو وردە وردە ئامـادە دەبێ بۆ چالاکی لە خاکدا ، ئەمەش بەهۆی (بەکتریای گـۆگرد) ڕوودەدات و دەتـوانێ تـوخمی گـۆگرد بـەکار بێنـێ ، بـەهۆی سـووتاندنی سـووتەمەنی بـەردین بڕێکـی تـر ئاوێتەی هەوا دەبێت ، دوایی (دووەم ئۆکسیدی گۆگرد) و (گۆگردی هایـدرۆجین) لـە شێوەی کبریتات (ترشی کبریتیك) لەگەڵ باراندا بۆ خاك دەگەڕێتەوە ، لێرەدا چـەند جۆرە قەوزەیێکی (الاشنات) دیاریکراو هەیـە توانـای بـەکارهێنانی (دوانـە ئۆکسـیدی گۆگرد)یان هەیە.

گۆگرد بە شێوەی یەکگرتوو لەگەڵ ئەتەمەکانی زینـدەوەران لە شێوەی پرۆتینەکان دا هەیە ، شیبوونەوەی پرۆتینەکان گۆگرد بەرەڵا دەکات[٣٤]. بێگومان هەموو ئەو ترشانە

---

[٣٤]مبادیء علم البیئة / ل : ٧٢.

له ژێر ئایەتی﴿ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ دا کورت دەبنەوە .

بێگومان گۆگرد لە بواری پیشەسازیدا زۆر سوودی لێ دەبینرێ وەکو : ترشی گۆگردیك و باڕووت و کاغەزو پەیین ... ، ئەو توخمە کانزاییێکی زەردەو ژمارە ئەتۆمییەکەی ژمارە (١٦)یە.

**ئیعجازی ( ١٦ ) : فسفۆڕ لە سروشتدا :**

﴿ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ﴾ -

واتە : نمونەی ئەو وەکو بەردێکە خاکی لەسەرە ، ڕێژ بارانێ دەکەوێتە سەری و بەڕووتی دەهێڵێتەوە .

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات باران ماددەی ترشی تێدایەو بەخورزمەو کرداری ڕووتانەوە (التعرية) لە زەوی و شاخ و تاوێرەکاندا پەیدا دەکات .

(بریج کوبال) دەنووسێ : سووڕی فۆسفۆڕ تا ڕاددەیێ ڕێژەیی یە ، بەلام زۆر گرنگە ، چونکە بەشێوەییەکی سەرەکی هەلگری وزەیە بە شێوەی (ATP) ، زانراوە ئێستا هەندێ کێشەی ژینگەیی پەیدا دەکات ، فۆسفۆڕ لە ڕێگای تاوێری فسفۆڕییەوە دەگاتە ڕووەك بەهۆی کرداری ڕووتانەوەی لەسەرەخۆ .

فۆسفات بە لەشی ڕووەکدا دەڕوات بە زنجیرەی خۆراکی دا گوزەر دەکات ، کرداری شیبوونەوەی ماددەی ئەندامی لە خاکدا فۆسفۆڕ ئازاد دەکات و پاشان بەکاری دەهێنێتەوە ، فۆسفۆڕ دۆخی گازی نیە لە هەوادا لە شێوەی گەردی ڕەقدا هەیە ، فۆسفۆڕی تواوە بۆ قولایی ئۆقیانووسەکان دەڕوات و دەتوێتەوەو لەدەست دەڕوات ، گەڕانەوەشی بۆسەر زەوی کردارێکی نەزانراوە ، وتراوە هەندێ فۆسفۆڕ لە ڕێگای پاشەڕۆی باڵندەو ماسییەکان دەگەڕێنەوە بۆ زەوی ، زۆر بەکارهێنانی پەیینی

فۆسفات و پاكژ كەرەوەكان بەرپرسە لە كرداری زوو لە دەستدانی فۆسفات بۆ زەریاكان و ئاوی تری شیرین[35].

## ئیعجازی (١٧) سوورەكانی تری توخمەكان:

لێرەدا زۆر توخمی تری جۆراو جۆر هەیە هەمان ڕێگاكانی سوورەكانی تریان هەیەو ئەو توخمانە بەهەمان سووڕدا ڕەت دەبن ، بەلام بە بڕێكی كەم ئەو توخمانە لە كۆگای تاوێرەكانەوە لە ڕێگای كرداری ڕووتانەوە (التعریە) ئامادە دەبن بۆ زیندەوەران ، تۆزو خۆلی پەرش بەهۆی (با)وە هەلدەگیرێ و لەگەل ئاوی باران بۆ زەوی دەگەڕێتەوە ، ئەو تۆزو خۆلەش خۆراكێكی باشن بۆ ڕووەكەكان ، بڕێ لەو توخمانە بەهۆی گوزەر كردنیان بۆ دەریاچەكان و ئۆقیانوسەكان بزر دەبن[36].

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی: ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ ﴾ ، واتە : بامان ناردووە بەمتوربەكەر ، ئینجا لە ئاسمانەوە بارانمان بۆ باراندون و پێمان نۆشین.

بێگومان (با) زۆرێ لە ڕووەكەكان متوربە دەكات ، پاشان هەورەكان متوربە دەكات و باران دەبارێت ، كە هەم ئاوەو هەم نترێت و توخمی تری تێدایە بۆ خۆراكدان بە ڕووەكەكان: ﴿ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٥﴾ ﴾

بێگومان باو هەوا هەلم هەلدەگرێ و هەورەكان دەگوازێتەوە لە ئۆقیانوسەكانەوە بۆ ناو كیشوەرەكان و لەوێ ئەو هەلمە چڕ دەبێتەوەو دەبێ بە باران و زەوی زیندوو

---

[35] مبادیء علم البیئة / ل : ٧٣- ٧٤.

[36] مبادیء علم البیئة / ل : ٧٤.

دەکاتەوە ، باران چاوگی ئاوی شیرینە و ترشی نیتریت و توخمی تری تێدایە کەتۆزو خۆڵ هەڵی گرتووە لە هەوادا ، گەر باران نەبوایە زەوی دەبوو بە دەشتێکی ڕەق و ڕووت و بێ ژیان.

(فۆسفۆر) بنیات نەری گەردەکانی ژیانە لە (DNA) و (RNA) و بەشداری دەکات لە پێك هێنانی ئێسقان و ددانەکان و لەسروشتدا لە شێوەی فۆسفات و ئاوێتەی تردا هەیە ، هۆکاری هەوایی وەکو باران و با ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن بۆ گەیاندنی بە ڕووبارەکان و دەریاکان و ڕووەکی دەریایی هەڵی دەمژن و ئەو باڵندانەی لەسەر ئەو ڕووەکانە دەژین دەیگوازنەوە ، ئەو توخمە لە پاشەڕۆکی مرۆڤ و ئاژەڵاندا هەیەو وەکو پەیینێك (السماد) بەکاردێ بۆ کشتوکاڵ .

قورئان ئاماژە دەکات بە مردنی مرۆڤ و گیانداران و ڕووەکەکان کە توخمەکانیان تێکەڵ بەخاك دەبێتەوە هەروەکو چۆن سەرەتا لەو توخمانە دروست بوون:

﴿ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا ﴾ ، واتە : ئایا باوەڕت بەو خوایە نیە لەخاك دروستی کردوویت : ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٢٨) ﴾

البقرة: ٢٨ لێرەدا قورئان ئاماژە بە سوڕی بەردەوامی ژیانی مرۆڤ و گیانداران دەکات ، سەرەتا لە خاك دروست بوون دەبنەوە بە خاك و جارەکی تریش دروست دەبنەوە .

پاشان ئاماژە بە ڕووەك دەکات چۆن دەبێتەوە خاك و تێکەڵ بە خاك دەبێتەوەو لەماددەی زیندەوە دەگۆڕێتەوە بە ماددەی نازیندەو پەیین بۆ ڕووەکەکانی تر :

﴿ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَامًا ﴾

٢١ واتە : پاشان ڕووەکەکە سیس دەبێ و بەزەرهەڵگەڕاوی دەبینی ، پاشان دەبێ بە پووش و پەلاش.

بێگومان فسفۆر سوورێکی نیشتەنی یە (الرســــوبیة) و گرنگترینی سوورەکانە لەو نێوانەداو لە توخمە چالاکەکانی کرداری زیندەگی زیندەوەرانە وەکو باسکرا ، قورئان لەو چەند ئایەتانە ئاماژە بەو و توخمەکانی تر دەکات ، کە بەشدارن لە پێك هێنانی خانەو گۆشت و ئێسقانی مرۆڤ و پەیکەری ڕووەکەکانداو خانەو لەشی زیندەوەران دا

# بەشی سێیەم

# ( وشکانی و ئاوی ) وەکو ژینگە

ئیعجازی ( ١٨ — ١٩ ) دەوروبەری وشکانی و ئاوی

ئیعجازی ( ٢٠ ) بیابانەکان.

ئیعجازی ( ٢١ ) ناوچە گیاییەکان.

ئیعجازی ( ٢٢ ) ناوچە دارستانییەکان.

ئیعجازی ( ٢٣ ) ناوچە جەمسەری یەکان.

ئیعجازی ( ٢٤ ) ناوچەی ئاوی شیرینی و دەریاو زەریایەکان :

قورئـان بـەر لـە ژینگـە زانـی نـوێ دەوروبـەری کـردووە بـە دوو بەشـی سـەرەکییەوە (شوێنەواری ئاوی ) و (شوێنـەواری وشکانی ) ، لـە چـەندان ئایەتـدا ئامـاژەی بـەودوو ژینگەیە کردووە و هەر جارەش چەندان گەوهـەری زانستی نـوێ هـەڵ دەرێـژێ ، تـا ئەوانەی بینان و وێڵی گەوهەرن و بـەدوای ڕاوکردنیـان دا دەگـەڕێن بیـان دۆزنـەوە ، لەوانە :

﴿ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ﴾ ، واتـە : حەرامـە لەسـەرتان ڕاوکردنی گیاندارانی وشکانی تا لە ئیحرامدا بن.

لێـرەدا قورئـان ئامـاژە دەکـات بـە بـوونی گیانـدارانی کێـوی و وشـکانی ، کـە لـەکاتی ئیحرامـدا نـابێ ڕاو بکـرێن ، ئەمـەش وانەیەکـە فێـری دەست پێـوە گرتنـی سـامانی گیاندارانی کێویمان دەکات بەپێ ی پێویست نەبێت و دەبێ حکومەت ئـەو سیسـتەمە ڕێك بخات ، بەڕاستی کوردستان تووشی گرفتی کەمی گیانـدارانی کێوی بووە لە مامزو شێرو پڵنگ و بزنە کێـوی و کەروشـێك و سمـۆرەو دەڵـەك و کـەو و سوێسکەو داڵ و کونـدە پـەپۆو سـی و قـورینگ و ... هتـد ، ئەمانـەش مەترسـی بـۆ تێـك چـوونی هاوسەنگی دەوروبەر دروست دەکات ، چونکە زیندەوەران کاتێك لە شوێنێکدا دەژین ، کارلێکتری دەکەن و کاریش دەکەنە ئەو دەوروبەرەی لەناویدا دەژین .

دیسان نەهێشتنی دارستانەکان لە چیاکان زۆر گرفتـی مەترسـیداری ژینگـەیی پەیـدا کردووە ، چونکە هاوسەنگی ئەوا تێك دەچێ و تۆزو خۆڵ زۆر دەبێ و خـاکی زینـدوو ڕادەماڵرێ و فێنکی نامێنێت و جوانی سروشت تێك دەچێ ... هتد .

(لورنس کولتون ووکر) پسپۆڕ لە دارستانزانی و ڕووەکزانی و فسیۆلۆجیا لە ئەمریکا دەنووسێ ، مرۆڤ پارەیێکی زۆر خەرج دەکات بۆ دروست کردنی بەنداو و بەربەسـتی گەورە بۆ کەم کردنەوەی لافاوەکان ، بەلاَم ئەو بەنداوانە تەنیا چارەسەرێکی کاتین و تـاوێرو بەنـداوی کۆنکریـت نـاتوانن بەرگـەی لافـاوە سـەختەکان بگـرن ، بـەڵکو دارو درەخت ڕواندنەوە لە زەویدا چارەسەرو بەربەستی ڕاستەقینەن بـۆ کـەم کردنـەوەو

بەرایی گرتن لە لافاوەکان ، ئەمە کارێکی سروشتی یە خۆی بە خۆنەویستی بەو ئەرکە هەڵدەستێ ، ساڵی تێناپەڕێ ئەو خاکەی ماددەکانی لەناو چوون و بە پیتی نەماوە گژوگیای چڕوپڕو درەخت و دارەکانی تێدا دەڕوێنەوە ، هەموویان کاردەکەن بۆ گێڕانەوەی بەپیتی زەوییەکە[٣٧].

﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾﴾

، واتە : خودا چی لە وشکانی و دەریادا ڕوودەدات ئاگای لێ یەتی ، هەر گەڵایێ دەکەوێتە خوار دەیزانێت ، بەو پێیە سیستەمی ژینگەیی و گۆڕانەکانی لەژێر چاودێری خوادایە ، تا ئاگای لێ یە گەڵایێ بەردەبێتەوەو کەوتنی ئەو گەڵایەش بە فەرمانی ئەوەو بێ سوود نیە .

بۆ نمونە (لورنس کولتون ووکر) دەڵێ : لە دۆڵی کۆنیکتیت بینرا داری مۆردی سوور بە یارمەتی کرمێکی زەوی بەناوی (گڵ خۆرکە – الخـــرطون) ڕێژەی کالسیۆم لە زەویدا پتر بکات ، گەڵاکانی مۆردی سوور بەسەر دەشتایی دارستانەکەدا دەکەون و بەمەش کرمی زەوی پەلاماریان دەدەن ، چونکە کالسیۆمیان زۆرە ، ئەو کرمانە گەڵاکان دەخۆن و هەرسی دەکەن و بەشێوەیێکی ئاسانتر ئەو توخمە دەدەن بە زەوی تا سوودی لێ وەربگرێت ، سوودی داری مۆرد هەر بۆ خۆراك نییە ، بەڵکو تەواوی سیفەتە سروشتییەکانی خاك چاك دەکات وەکو کونیلەکانی و زوو ئاو ڕۆیشتن بەناویداو توانای ئاو گلدانەوە ، هەموو ئەو سیفەتانە پەیوەندییەکانی گەورەیان هەیە بە سوود وەرگرتن لە لافاو و دەسەڵات بەسەرداگرتنیان[٣٨]، وەکو (لورنس) باس

---

[٣٧] الله يتجلى في عصر العلم / ل : ٦٣.

[٣٨] الله يتجلى في عصر العلم / ل : ٦٢ .

دەكات ( هەموو ئەو كارانە لەژێر چاودێری كردگاردا بەڕێوە دەچن و بە پیتی بۆ خاك دەگێڕێتەوە .

كەواتە كەوتنی یەك گەڵای دار بە سوود و بەپیتی زەوی تەواو دەبێت .

پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بەر لە (لورنس) باسی گرنگی مۆرد دەكات و فەرموویەتی : (النـــار في رأسـه اللهصوب سـدرة قطع من) / ابـــوداود رواه صحيح، واتە : كێ دارێكی مۆرد ببڕێ خودا سەری دەخاتە ئاگرەوە ، بێگومان هەر كەسێكی دارێك ببڕێ بۆ وشك بوون بەر ئەو سزایە دەكەوێت .

كوردستان لە زۆر داری بەردارو پیرۆز بێ بەش بووە ، بەهۆی نەبوونی سوتەمەنی و گوێ نەدانی حكومەت بە پاراستنی دارو درەخت و ژینگە ، لەوانە دارەبەن و دار بەڕوو و دار مازوو و دارگێوژ و دار كرۆسك و گردیل ... هتد ، ئەم بڕینانە زەبرێكی گەورەی لە كوردستانداو تووشی پیس بوونی ژینگەی كرد ، ئەو كوردستانەی لانەی ژیان بووە ، وەكو لە كتێبی گەردووناسی و زەوی ناسم كردووە .

﴿ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ﴾

لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ بوومەلەرزەو گەردەلول و بورکان و کارەساتی سروشتی تر دەكات ، بۆ تێك دانی ژینگەو ئەو دەوروبەری تێدا ڕوودەدەن ، ئەم دیاردانە دەستی مرۆڤ دروستیان دەكات بەهۆی خراپكاری و تێكدانی هاوسەنگی ژینگەو سروشت.

﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ ﴾ لێرەدا خوداوەند ئاماژە بە تواناكانی مرۆڤ دەكات، كە دەتوانێ ڕاو بكات و كۆچ بكات و ژینگە بگۆڕێ و لە وشكانی و دەریادا بسوڕێتەوەو هەر شوێنێ مەبەستی بێ ئاوەدانی بكاتەوەو ڕۆزی خۆی لێ وەدەست بێنێت.

﴿ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ وشكانی خانه خوێ و زێدی زۆرێ له زیندەوەرانه ، ئەو نیشتەجێ یەش بریتییه له هەواو خاك ، كه زۆر زیندەوەری تێدا دەژیت ، سەیری قورئان بكه ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾ ، واته : خودایه له وشكانی و دەریادا دەتان ڕووێنێ.

لێرەدا قورئان (فی) بەكاردێنێ نەك (علی) نافەرموێ لەسەر وشكانی و دەریا ، بەڵكو دەفەرمووێ لەناو وشكانی و دەریادا ، چونكه مرۆڤ لەناو هەوادا دەژیێ و وەكو ئۆقیانوسێ ئاوه بۆ زیندەوەرانی وشكانی ، مانەوەی ئەو زیندەوەرانەش لەسەر چەند هۆیێكی دەوروبەری بەنده وەكو هەواو خۆراك و ئاو و گەرمی و تیشك و هتد .

﴿ يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾ دانكه خەرتەڵه ، كه تۆوێكی زۆر وردە ، لەناو تاوێرەكاندا بێ یان هەوا بیبات به ئاسماندا یان له زەویدا بێ لەخوا بزر نابێت.

﴿ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ۝٦ ﴾ ئاماژەیه بۆ ئەو كانانەی لەژێر خاكدا هەنه ، (ما) له ڕێزماندا بۆ (العاقل) و (غیر العاقل) ە.

ژینگه بیابانەكان و دارستانیەكان :

بیابانەكان بەشێكی وشكانین و بەناوچه كەم بارانەكان دەناسرێن ، چونكه كەمتر له (٢٥ سم) له ساڵێكدا بارانیان لێ دەبارێت پلەی گەرمییان زۆرەو وەرزی گەرمییان پترە ، بۆیه گیانداران و ڕووەكەكانیان دەبێ خۆیان لەگەڵ ئاو و هەواو خاكی ئەوێدا بسازێنن ، سووڕی ژیانی ڕووەكەكانیان كورتەو قەبارەو گەڵایان بچووكه ، وەكو گەڵای سوێرییەكان (cacti) به زۆری گیاندارانی ئەوێ وردیلەن تا توانای بەرگری و خۆ

حەشاردانیان هەبێ وەکو (گۆڕهەڵکەنەکان) ، هەرچی باڵندەکان و شیردەرەکانن کەمتر لە بیاباندا دەژین ، چونکە ئاویان کەمەو سەوزاییان دەگمەنەو زۆر گەرمن .

خوای گەورە لەسەر زمانی ئیبراهیم (علیه السلام) کە لە دۆڵنارانی ناوچەی کوردستان و بیتوێن و خۆشناوەتی کۆچ دەکات بۆ حیجازو لەناوچەیەکی فێنك و کوێستانی و شاخاوییەوە بەرەو ئەو بیابانە چۆڵ و بێ ئاو و سەوزایی و گەرمە ، فەرمووی: ﴿ رَبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ ﴾ واتە : پەروەردگارمان من وەچەی خۆم لە دۆڵێکی ڕووتی بێ ڕووەك و کشتوکاڵ نیشتەجێ کردووە .

لە سێ تابلۆ دێرینەکانی نوحدا (علیه السلام) هاتووە کە لە ساڵی (١٩٢٠) لە کوردستاندا دۆزرانەوەو (تەقی عابد)ی شوێنەوارزان لە ڕۆژنامەی (العرب) دا (٢٨-٢٩-١٩٩٠/٣٠)دا بڵاوی کردنەوە کاتێ خێزانی ابراهیم (علیه السلام) لەوێ لەو دەشتایی چۆڵە بەجێ دەهێڵرێن بەکوردی قسەی لەگەڵدا دەکات و دەڵێ : (صەفا مەڕوە) ، لەو قسانەدا هاتووە ابراهیم (علیه السلام) دەڵێ : مـن (جافم) تـۆ (هەورامی) وەکو لە زەوی ناسیدا باسکراوە .

لەوێ دا خودا وەکو موعجیزەیێ بە خێزانی ئیبراهیم و ئیسماعیل (سەلامی خوایان لەسەر) زمزمیان لەژێردا دەتەقێنێتەوە ، (زمزم) وشەیەکی کوردییە ، واتە : (ژەم ژەم) ، واتە : چـۆڕ چـۆڕ ، وەکو چۆن ئاوی بۆ مەریەم و مەسیح تەقاندەوە ﴿ فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا ﴿٢٤﴾ ﴾

**دیسان قورئان ئاماژە بە ناوچەکانی دارستانەکان دەکات:**

﴿ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ ﴾

، واتە : زەویمان درێژ کردۆتەوەو لەزەویدا چیاکانمان لەناودا داناوە هەموو شتێکی هاوسەنگکراومان تێدا ڕواندووە.

لێرەدا قورئان ئاماژە بە چاودێری خودایی دەکات لەناوچە دارستەکاندا ، کە خودا بە هاوسەنگی دارو درەختی تێدا دروست کردوون و بەهاوسەنگی ماددەکانی زەوی هەڵدەمژن و دەیکەنە خۆراکی پێویست بۆ خۆیان و گیانداران و مرۆڤ.

(لورنس) دەڵێ : (لە دارستانە تازەکاندا کە مرۆڤ دەستکاری نەکردوون درەختەکان زۆر دەبن ، بەدرێژایی وەچەکان بەدوای یەکدا دێن ، تا ئارام دەگرن ، چەند جۆرە درەختێکی تایبەتی سەهەڵدەدەن و زۆر دەبن ، تا خوا حەزدەکات ، مەگەر مرۆڤ دەستکاریان بکات ، یان ئاگر کەوتنەوەو بروسکە لەناویان ببات ، دەستکاری مرۆڤ لە دارستانی سروشتیدا بە پیتی یەکەی ئاهێڵێ و هەمواری لەدەست دەدات بۆ گەشەی ڕووەکەکان ، ئەو کاتە درەختەکان و خاکەکەش لەدەست دەدەین و ئاکامەکەی زۆربوونی لافاوەکان دەبێت[39].

گەر تەگبیرو ڕێسای خوا لەو جیهانەدا تەنیا لە دروست کردنی دۆڵە بەپیتەکاندا بایە ، کە بەهۆی ڕووتاندنەوە (التعرية) دەیگوازێتەوە لە قوڕو لیتەو نیشتەنی یەکان و لەسەر چیاکانەوە رایماڵن ، ئەو کردارە لە لایەن پسپۆڕانی فسیۆلۆجی ڕووەك و جیۆلۆجیاوە ئاسان دەبوو ، بەڵام تاوەکو مرۆڤ جوانی و قەشەنگی ئەو جیهانەو شکۆی کارزان و هەڵسوڕێنەرەکەی بزانێ بە دوایدا ، پێویستە ئەوەی لە دارستانەکاندا ڕوودەدات بیزانێ ، ئەو کاتە دەبینێ ئەوەی بە سروشتی دەزانی تەنیا ئیعجازێکی

---

[39] الله يتجلى في عصر العلم / ل:٦٢.

خوایی مەزنە لەسەرووی ئاستی مرۆڤایەتی یەوە ،هزرەکان لەپەی پێ بردنی دەتاسێن و ڕێگایان بەدەستەوە نامێنێ ، تەنیا بڕوا کردن نەبێ بە شکۆو توانای ئەو[٤٠].

ناوچە دارستانەکانی هێڵی یەکسان کە باراناوین یان ناوچە دارستانەکانی نیمچە هێڵی یەکسانی بەدرێژایی ساڵ بارانیان لێ دەبارێت ، بە تایبەتی لە زستانداو بڕی بارانی ساڵانەیان (٢٠٠سم) دەبێت ، پلەی گەرمییان بەرزە ، لەو ناوچانەدا دارەکان لێك هاڵاون و بوار نادەن باران و با خاکی ئەوێ تووشی ڕامالین بکات ، بەزۆری لەو ناوچانە حەزازییەکان و سەرخەسی یەکان و باڵندەو مێروو مەیمون و ..هتد ، دەژین.

(ماهر احمد صوفي . د) لە کتێبی (الموسوعة الكونية الكبرى/ ج٩-١٠) ی تەرخان کردووە بۆ ئیعجازی چیاکان و بیابانەکان و دارستانەکان و زۆر زانستی گرنگی تێدا خستونە ڕوو.

باس دەکات بیابانەکان جۆراو جۆرن لەشێوەو قەبارەو ڕەنگ و ڕووبەرو ژیاندا ، بۆ نمونە : بیابانی ڕەنگاو ڕەنگی (بیتر دزرت) لە (ئەریزۆنای ئەمریکا) ڕووبەرەکەی هەندەی ولایەتی (کونیستك) دەبێ ، واتە : (٥٠٠٩) میل دووجایە ، یان (بیابانی گەورە) ڕووبەری هەرە بەرزی باکوری (ئەفریقیا) پێك دێنێ و هەندەی تەواوی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێت ، هەندێ بیابان لەئاستی ڕووی دەریادان و هەندێکیان لەسەر تەپۆلکەی بەرزن ، هەندێ دەشتایی لول پێچن ، بەرزو نزمییان هەیە کۆمەڵە چیایێ دەیبڕن و بەچەند بەشێکی دا دابەش دەکەن ، ڕووەکەکانی ئەو دەشتایی و بیابانە جیاوازن ، (سوبیر – الصبار) یان هەنجیری دڕکاوی لە زۆربەی بیابانەکانی (مەکسیك) و ئەمریکای باشوری خۆرئاوادا هەیە .

دیسان لە بیابانی ئەفریقیاو بیابانی گەورەی دوورگەی ئوستڕالیادا هەیە ، ئەو بیابانانە گیاندارانیشیان وەکو یەك نین ، ئیمڕۆ واقمان وڕدەمێنێ لە بوونی وشتری

---

[٤٠] الله يتجلى في عصر العلم / ل:٦٠.

ئاواره (الشارد) له بیابانی (موجافی) له (کالیفۆرنیادا) وشتر له بیابانی گەورەو بیابانی عەرەبی وەکو کاروان و ڕەوێ هەیە ، وشتر مرخ (النعامە) له بیابانی ئەفریقیاو بیابانی ئەمریکای باشوردا هەیە.

پاشان بیابانی جەمسەری هەیە ، کە ئاوێکی بەستەڵەکی زۆری لێیە ، بەڵام گیانداران ناتوانن ئاوی بەستوو بخۆنەوە و ڕووەکەکان ناتوانن بە ڕەگەکانیان ئاو بخۆنەوە.

کەناری ئۆقیانوس و دەریاچە سوێرەکان دیمەنێکی تری بیابانەکانە کە بارانی زۆری لێ دەبارێ و هەڵکشانی ئاوی زۆر دەگرێتەوە ، بەڵام سوێراوە .

بیابانەکان بە گشتی دوو جۆرن : بیابانی گەرم (Hot Deserts) و بیابانی سارد (Cold deserts) ، نمونەی بیابانی گەرم بیابانی گەورەو بیابانی عەرەبی یە ، کە هاوینی گڕاوییەو زستانی گەرمە ، نمونەی بیابانی ساردو حەوزی گەورەیە لە ئەمریکاو بیابانی گوبی یە لە ئاسیادا بە باکوری دەریاچەی (قەزوین) دا درێژ دەبێتەوە ، پلەی گەرمی نزمییان (٥) سەدی و پلەی بەرزی گەرمییان (٣٠) سەدی دەبێت و هەندێ کەم و زیاد دەکات .

دیسان بیابانەکان دەتوانرێ لەڕووی بڕی بارانی ساڵانەوە بکەین بە سێ گروپەوە :

١. بیابانی وشك و برینگ (شدید الجفاف) :

ئەو ناوچانەن ساڵێ یان پتر بەسەریاندا ڕەت دەبێ باران نابینن، وەکو ناوچەکانی ناوەڕاستی بیبانی گەورەو چارێکە بە تالأیی یەکەی نیمچە دوورگەی عەرەبی و بیابانی (ئەتاکاما)ی ئەمریکای باشورو (تاکلاما) لە ناوەڕاستی ئاسیادا ، ڕووبەری ئەو بیابانە (٥,٨٥٠,٠٠٠) کم$^2$ ، واتە : (٤,٤ ٪)ی پانتایی وشکانی یە .

٢. بیابانی وشك (الجفاف) :

ئەو ناوچانەن بارانیان کەم و نارێکە ساڵانە (١٢٥) ملم دەبێ ، ئەو بیابانە (٢١,٥٠٠,٠٠٠) کم$^2$ دەبێ ، واتە : (١٦,١٪)ی وشکانی.

٣. بیبابانی نیمچە وشك :

ناوەڕاستی بارانی ساڵانەی (١٥٢ -٢٥٠) ملم دەبێ ، ئەو دەشتاییە (٢١,٠٠٠,٠٠٠) کم$^2$ دەگرێتەوە ، وە (٥١,٨ ٪) پانتایی و وشکانی ، بەو پێ یە پانتایی گشتی بیابان لە جیهاندا (٤٨,٣٥٠,٠٠٠) کم$^2$ ، واتە : (٣٦,٣٪)ی وشکانییە ، بیابان نزیکەی (١٠٠٠) جۆر میوەی لێ دەڕوێ ، لەوانە دارخورماییەکان .

هەرچی دارستانەکانن (الغابات) : ﴿ أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا ۗ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾

باخچەکان و دارستانەکان وەکو باسکرا دیمەنێکی تری ژینگەن ، بڕوا وایە دارستانی سەرەتایی لە زەلکاوەکان دا بەر لە (٣٦٥) ملیۆن ساڵ دروست بووبێ ، واتە دوای چاخی (دیفونی).

پێناسەی گشتی دارستانەکان (الغابات) بریتی یە لەو : ڕووبەرە زەوییەی بەدارو درەختەکان داپۆشراوەو زۆربەیان دارو درەختن و درەختی تری بچووکی وەکو قەوزەو درەختیلەو گوڵ و گیای وشکانی تریش دەگرێتەوە سەرباری باڵندەکان و مێروومکان و گیاندارانی تر ، کە جێ و ڕێ لەناو دارستانەکەدا دابین دەکەن ، جگە لەمەش ملیۆنەها زیندەوەری تری تێدا دەژی ، کە بەچاو نابینرێن ، ئاو و هەوا و خاك و چاوگە ئاوییەکان جۆری ڕووەکەکان و گیانداران دیاری دەکات ، کە دەتوانن لەدارستانەکەدا بژین ، ئەو زیندەوەرانەو ژینگەکەیان پێکەوە سیستەمی ژینگەیی پێك دێنن بەر لەوەی مرۆڤ دەست بە بڕین و کاول کردنی دارستانەکان بکات بۆ کشتوکاڵ و ئاوەدانکردنەوە لە (٦٠٪)ی جیهانی پاندا داپۆشی بوو ، کەچی ئێستا تەنیا (٣٠٪) جیهانی گرتۆتەوە .

بێگومان دارستانەکان کە قورئان بە ﴿ وَحَدَائِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ ﴾ ناوی یان دەبات گرنگیەکی زۆری بۆ ژیان هەیە ، لە بەهای ئابوری و ژینگەیی و سەیرانی و

دەرمانی و پیشەسازی ، قورئان فەرموویەتی﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ ﴾ . مەبەست لە (كريم) نرخ و بەهای ڕووەکەکانە .

خوداوەند لە چەندان ئایەتدا ئاماژە بە سوودەکانی دارستان دەکات﴿ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ ﴿٦٠﴾ ﴾ ، واتە:بارانمان لە ئاسمانەوە باراندووە باخچە جوان و ڕازاوەکانمان پێڕوواندووە .

لێرەدا قورئان ئاماژە بە سوودی جوانی سروشتی دارستانەکان دەکات بۆ پشوودان و سەیران و حەسانەوەو سێبەر .

جاران مرۆڤ ژیانی لەسەر دارو درەختی دارستانەکان و ڕاوکردنی گیاندارانی دارستان بووە، دوای پێش کەوتنی شارستانی یەکان مرۆڤ ڕوی لە شارو دێیەکان کردووە ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ﴾

ئاماژە بە سووتەمەنی دارو درەخت دەکات ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ يس ٨٠ ، دارو درەخت دوای وشك بوون یان كردنیان بە خەڵوز بۆ سووتەمەنی سوودیان لێ وەردەگیرێت.

(نوح) (علیە السلام) لە کوردستاندا لەژێر سروشتی خوادا کەشتی لە تەختەو بزمار دروست دەکات :﴿ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا ﴾

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (كان زكريا نجارا) رواه مسلم ، واتە : زەکەریا دارتاش بووە) .

لەم چاخەشدا دارستان تەختەی پیشەسازی ئامادە دەکات ، وەکو داری چنارو گوێزو ئەبلكاش و داری ساج و داری کاژ (سنەوبەر) و تەختەی بالسا ... هتد ، دیسان بۆ

کەلوپەلی ناو ماڵ بەکاردێ وەکو : بۆفیەو دۆڵاب و کتێبخانەو مێزو کورسی و قەنەفەو دەیان کەلوپەلی تر ، لە زۆرێ لە وڵاتانی جیهانداو ماددەی سەرەکی سووتەمەنی و خۆ گەرم کردنەوەو چێشت لێنانە .

لە گەڵای دار زۆر بەرهەمی لێ دەردێنرێ وەکو وەکو (سیلوفان) و (پلاستیك) و جۆرەها ڕیشاڵ وەکو (رایون) و (ئەسیتان) .

لاستیك و تربنتین لەدارستان دروست دەکرێ ، سەرباری جۆرەها چەوری و جەو و کەتیرەو جوانی و مۆم ... پێچەوانەی خەڵوزی بەردین و نەوت و کانزاکان دارستانەکان نوێ دەبنەوەو دانیشتووان بەردەوام دەتوانن سوودیان لێ ببینن.

دیسان دارستان سوودی ژینگەیی زۆری هەیە و ژینگەو سامانەکانی بەجۆرەها ڕێگە دەپارێزرێن ، بۆ نمونە : برێکی زۆر ئاوی باران هەڵدەمژن ، بەمەش ڕێگا لە لێشاوی خێرایی ئاو دەگرن ، کە دەبێتە هۆی ڕووتاندنەوەی خاك و لافاو ، سەرباری ئەوەش ئەو ئاوەی گلی داوەتەوە بە خاکدا دزە دەکات و دەبێتە ئاوی ژێر زەوی ، ئاوی ژێر زەوی سەرچاوەی ئاوی پاکژو سازگارەو ئاو دەداتە ڕووبار و دەریا و بیرەکان.

ڕووەکە دارستانییەکان و ڕووەك دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژن و ئۆکسجین دەدەنەوە ، هەموو مرۆڤ و گیانداران پێویستییان بە ئۆکسجین هەیە ، گەر دارو درەختەکان نوێی نەکەنەوە و بەردەوام دروستی نەکەن ژیان دەوەستێ ، کەڵەکەبوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە هەوادا گۆڕانێکی گەورە لە کەشی جیهاندا پەیدا دەکات .

قورئان ئاماژە بۆ ئەو سەوزاییە دەکات (الاخضر) کە بە کلۆرۆفیل ناسراوە و وزەی خۆر دەمژێ و کرداری ڕۆشنە پێکهاتن ئەنجام دەدات پەیدات دەکات: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا ﴾ ،
واتە : بەبارانمان هەموو ڕووەکێ ڕواند ، پێمان ڕواند لەوانە درەختی سەوز .

مەبەست لە (خضر) كلۆرۆفیلە ، كە چەند پلاستیدێكی سەوزن (البلاستیدات الخضراء) و لە بۆیەی كلۆرۆفیل و كارتینویدات و كاروتین و زانپوفیل پێك دێ ، بەلاّم چونكە زۆربەی بۆیەی قەوزە ڕەنگی سەوز وەردەگرێ ، ئەوان بەرپرسن لە ڕۆشنەپێكهاتن و دروست كردنی چەوری و نیشاستە. پاشان گەر دارستانەكان نەمێنن سامانێكی زۆر ئاژەڵی لەدەست دەدەین كە ژینگەیان ئەوێیە .

**سوودی سێ یەمی دارستان بۆ سەیران و گەشت و گوزارە :**

لە هەندێ ولاّتدا بەشێكی دارستانەكان بۆ سەیران و گەشت و گوزار سوودی لێ دەبینرێ و خەڵكی دەچنە ژێر دارەكان لەوێ كات بەسەر دەبەن ، بەتایبەتی لەكاتی پشوودان و بۆنەو یادەكان ، یان وەرزشی تێدا دەكەن و لەو كەش و هەوا فێنكەدا ، لەو دیمەنە جوانەدا كاتێكی خۆش و ئارام بەسەر دەبەن.

لەڕووی ئاو و هەواو خاك و شێ داری دەتوانرێ دارستانەكان بكرێن بە (٤) بەشەوە : (دارستانی باكور ، دارستانی ناوچە فێنكەكان ، دارستانی دەریای سپی ناوەڕاست ، دارستانی هێڵی یەكسانی باراناوی) ، هەندێ لە ژینگەزانەكان باس لە بوونی دارستانی وەرزی خولگەیی و دارستانی ناوچەی سافان و دارستانە چیاییەكان دەكەن ، كە جۆرێكی تر لە دارستانەكان پێك دێنن.

دارستانی باكوری : لەناوچە فرە ساردەكاندا هەیە ، ڕووبەرێكی فراوانی ئەوروپاو ئاسیا و ئەمریكای باكور دەگرێتەوە ، قەدپاڵ و لێژایی چیاكانی ئەو دەڤەرانەدا دەگرێت ، هەرچی دارستانی ناوچە فێنكەكانە ، هاوینیان گەرمەو زستانیان ساردەو بڕە بارانەكی ساڵانەی تێدا دەبارێت ، لەو ناوچانە لە پایزدا خەزەڵوەرێن هەیە وەكو خۆر هەلاّتی ئاسیا ، ئەو ناوچانە سامانی ئاژەڵییان زۆرە لەوانە شیر دەرەكان لە ڕێوی و دەڵەك و ژوشك و سمۆرەو مشك ، زۆربەی شیردەرەوە وردەكان زستان لەدۆخی سڕیدا بەسەر دەبەن ، لەدارستانە فێنكە هەمیشە سەوزەكاندا ، وەكو خۆرئاوای ئەمریكای

باکوور و خۆرئاوای چیلی و دەتسمانیاو نیوزلەندا ، ئەو ناوچانە بارانی زۆر گەم دەیانگرێتەوە بەهۆی بای خۆرئاوایی شێدار.

دارستانی دەریای سپی ناوەڕاست زستانی گەرم و شێدارە ، هاوینی گەرم و وشکە ، دارەکانی پان و گەورەو هەمیشە سەوزن وەکو : بەڕووە هەمیشە سەوزەکان ، ئەو ناوچەیە مێروو و جۆرەها مارو مارمێلکەی لێیە .

دارستان جۆرەها زیندەوەرو ڕووەکی تێدا دەژیێ ، هەر لەو دارستانانەی گەلأیان دەکەوێ و خەزەڵ وەرێنیان هەیە نزیکەی (٥٠٠) جۆر زیندەوەر هەیە ، نمونەی بەرزی دارستانە ناودارەکان ، دارستانی بەڕازیلە نزیکەی (٨٠٠٠) جۆر دارو درەختی تێدایە ، نمونەی دووەم نیمچە دوورگەی (مەلایو) یە لە باشوری خۆرهەلأتی ئاسیادا لە هەموو جیهان گەرمی و شێ ی پترەو دارو داری چڕ پڕترە ، دوور لە دورگەی مەلایو کۆمەڵە دورگەیێ هەیەو ئەندەنۆسیایان پێك هێناوە ، لەو دارستانەدا گۆڕانی وەرزی کەمە بۆیە بەدرێژایی ساڵ درەختەکان گەشە دەکەن [1].

خوای گەورە فەرموویەتی﴿كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾﴾ الشعراء ، واتە : زۆر جۆری بەنرخمان لەڕوەکەکاندا تێدا ڕواندووە .

**ناوچە گیاییەکان** ( Erass land ) :

ئەو ناوچانەن دەکەونە نێوان هێڵی یەکسان و ناوچە ناوەندییەکان و فێنکەکانەوە ، ئەو ناوچانە بارانیان پچڕ پچڕەو دەگاتە (٢٥-٧٥)سم لە ساڵێ داو پلەی گەرمییان لە زستاندا (٣٢°)س و لە هاویندا (٣٨°)س .

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (آيات الله في الجبال والصحاری والغابات / د : ماهر احمد صوفي) و (زەوی ناسی / نوسەر/ بەشی بیابانەکان) .

ئەو ناوچانە گژوگیای کورت و درێژیان هەیە و لەوەڕگای باش بۆ ئاژەڵ و گامێش و قرتێنەر و گیاندارانی ترە .

(( **ناوچەی تایگا** ))

دەکەونە بەشی جەمسەری زەوی لە سیبریاو باکوری ئەمریکای باکور ، زستانی ئەو ناوچەیە فرە ساردو درێژەو هاوینیان کەمە ، ئەو ناوچانە جۆرێ درەختی زاڵیان هەیە، لەوانە کاژ یان سنەوبەر ، گیاندارانی ئەو ناوچە فرەساردانە وەکو : ورچ و گورگ و گاکێوی و سمۆرە ، ئەمانە کەوڵی ئەستور دایپۆشیون تا لەسەرما بیانپارێزن.

(( **ناوچەی تەندرا** -tundra– ))

دەکەوێتە ناوچەی جەمسەری ، بەدرێژایی زستان تاریکستانە ، بە هاوین ڕوناکییەکی کزی هەیە ، هەمیشە ئەو ناوچانە سەهۆڵ بەندان و بەستەڵەکە و پلەی گەرمی یان بۆ ژێر سفر دادەبەزێت، لەو ناوچانە حەزازییەکان و قەوزە زۆرە ، باڵندەکانیشیان لە زستاندا بۆ ناوچە گەرمەکان کۆچ دەکەن.

(( **ناوچە بەستەڵەکی جەمسەری** ))

ئەو ناوچەیە جەمسەری زەوییە ، کە شەختەو سەهۆڵبەندانی هەمیشەیی دایپۆشیوە، گیاندارانی بەزۆری گۆلکی دەریا (الفقمة) و پەنگوین (بەتریق) و لەسەر زیندەوەرانی دەریایی دەژین و گوزەرانیان لەگیاندارانی تر جیایە .

(( **ژینگەی کوردستان** ))

کوردستان : ئەو ناوچە جوگرافییەیە کورد تێیدا دەژین و دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای کیشوەری ئاسیاوە ، هەر چوار پارچەی کوردستان زیاتر لە (٥٠٠) هەزار کم$^3$ یە .

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ ﴿٣٥﴾ ﴾ ، (ابن كثير) له (البداية والنهاية / ج١) دا باس دەكات : (ابن عباس) و (ابی بن كعب) و (سفيان بن عيينه) و (ابو حنيفه) و هی تر بڕوایان وایه ئەم (الجنة) لەسەر زەوی بووه ، چونكه خوا ئادەمی له زەوی دروست كردووه ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ ، پاشان (الجنه) به مانای باخچەش دێ ﴿ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ﴾ ، (الهبوط) واته : دابەزین ، هەر له ئاسمانەوه نییه ئەوەتا خوا به گەلی جولەكه دەفەرمووێ : ﴿ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا ﴿٦١﴾ ﴾

له (الجامع الصغير للسيوطي) دا هاتووه (الجنة بالمشرق) رواه الفردوسی ، بەو پێیه ئەو باخچەیه له كوردستانه له عێراقدا . پاشان له (الكتاب المقدس / سفر التكوين ١٥/٩/٢)دا باس دەكات باخچەی ئادەم لەناو چوار ڕووباردا بووه (فيشون ، جيحون ، حيدداقل ، فورات)

له زانایانی خۆرئاوادا (ه.ا. رایت) له كتێبی (اثار عصر الجليدي البلاستوسيني في كردستان) كه پسپۆڕی جیۆلۆجیاو ژینگەیه له زانكۆی مەنسوتای ئەمریكی ، باس دەكات چەرخی پلاستوینی كه گۆڕانی ئاو و هەوای تێدا دروست بووەو ژیانی مرۆڤی تێدا به دەركەوتووه ، ئەم شوێنەوارانه له كوردستاندا بینراون وەكو له چیای هەڵگوردو ڕوباری ڕواندزو جیلوداغ دا.

له (معجم البحرين / فخردين الطريحي/ ل :٢٣٤) دا هاتووه ( دەربارەی بەهەشتی ئادەم له پێشەوا جەعفەری سادق (عليه السلام) پرسیار كرا : ئایا له باخچەی دونیا بووه ، یان

لـه باخچـەکانی بەهەشـت ؟ فـەرمووی لـە باخچـەکانی دونیـا بـووە ، خـۆرو مـانگی بەسـەردا هـەلاتووە ، گـەر لـە بەهەشـتی ئـاخیرەت بوایـە شـەیتانی نەدەچـووە نـاو و ئادەمی لێ دەرنەدەکرا.

زۆر لە زانایانی گەورەی خۆرئاوا ، کوردستان و عێراق بە لانکەی شارستانی دەزانـن ، بڕوانە (قصة الحضارة و ل ديورانت) لە بەرگی (١)دا عێراق و دۆڵی دوزێ بـە لانکـەی یەکەمی شارستانی دادەنێت.

(س.ن کریمر) کتێبـی دەنوسـێ بـەناوی (هنابـدء التـأریخ – History Begins at summer – London ١٩٥٩) (د.بلیـو . ای ویگـرام / ادگـار ، تـی ، ای ، ویگـرام) کتێبی لەسەر کوردسـتان دەنووسن و ناویان ناوە (مهد البشرية) ، بەو پێیە کوردسـتان لانکەی شارستانی یەکەمە ، دیسان لەساڵی (١٩٢٠)دا ئینگلیز لە کوردستان سێ تـابلۆی دێرینی نوحیان (علية السلام) دوزییەوە ، کەسروشی نوحی تێدایە بە کوردی سۆرانی وشەکان بە کوردی بزماری نوسراون ، دوای ئەوەی (هاید پارك) بلاوی کردەوە ، (تقی عابـد) ی شـوێنەوارزان دوای لێکۆڵینـەوەو هـەڵهێنانی ئـەو وشـانە ڕاشکاوانە لـە سـێ بەشی ڕۆژنامـەی (العـرب ٢٨-٢٩-٣٠/١٩٩٠) دا ئـەم ڕاسـتییانەی وەکـو بەڵگـە نەوێسـتی بەجیهان ڕاگەیاند،ئەم تابلۆیانە سروشی نوحە بە کوردی بزماری سۆرانی نووسراوە .

(ئادەم) لە (دار السلام) بووە لە (ڕواندز) ، نوح لە کوردستان بـووە ، وەکـو بـە دەقـی قورئان هاتووە : (هود٤٤) ، واتە : کەشتی نوح لەسەر کێوی جودی نیشتەوە ، (نـوح) ناوی (کوردە) بووە ، واتە : کوڕی دەیەمی ئادەم .

(د: زغلول النجار)ی زەوی ناس لە (الارض في القرآن الكريم) و (مدخل الى دراسة الاعجـاز العلمي) دا (ل:٢٥٠) دا ئاماژە دەکات : (توێژینەوەکانی مارتین ڕووی لە سـاڵی ١٩٩٤ داو چارڵس ویلس لە ساڵی (١٩٨٠) داو جون مونتوگومری لە حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا ئەوەی سەلماند شوێنەواری کەشتی نوح لەسەر جودییە (cudi) لە دووری (٢٥٠) میل لە باشوری خۆرئـاوای چیـای ئـارارات ، دوای ئـەوەی شـوانێکی کورد بـەناوی (ڕەشـید

سەرحان) لە ساڵی (١٩٤٨)دا پاشماوەی کەشتی یەکە دەدۆزێتەوە ، بەو پێیە دروست بوونی ژیان و دروست بوونەوەی لە کوردستاندا بووە .

(هـ . ا رایت) دەربارەی کوردستان و ژینگەکەی دەنووسێ : چیاکانی کوردستان بەشێ لە کەوانێکی چیایی پێك دێنێ ، بە چیاکانی (تۆرۆس – زاگرۆس) دەست پێ دەکات بە باشووری تورکیادا درێژ دەبێتەوە ، باکووری عێراق و باشووری خۆرئاوای ئێران ، ئەو کەوانە چیاییە هەردوو تەپۆلکەی ئێران و ئەنادۆڵ دەبڕێ لەشێوی نێوان دۆزێیەکەدا ، بەرزایی لوتکەی چیاکانی کوردستان لەناو ئەو بازنەیەدا لەو بەشەی لەناوچەی (جیلوداغ) دا درێژ بۆتەوە لە باشووری تورکیادا ، تا ناوچەی چیای هەڵگورد ، کە پانتایی (٢٥٠) کلم و بەرزایی (٣٠٠٠-٤٠٠٠) م دەبێت ، بەڵام تا بەرەو باشووری خۆرهەڵات برۆین لوتکەکانی نزم دەبنەوە و بەرزایی یان دەگاتە (٢٢٠٠ – ٢٨٠٠)م ، بەڵام لە (زەردەکۆ) لە باشوری ئێراندا بۆ (٤٠٠٠) م بەرز دەبنەوە ...

ئاو و هەوای کوردستان بارانی زستانەی زۆرەو هاوینی وشکە، هۆی باران بارینی بۆ تێك چونی گەردەلولی دەگەڕێتەوە ، کە لە دەریای سپی ناوەڕاستەوە دێت ، بەشی تر بۆ سووری با دەگەڕێتەوە کە لە دەریای سپی لە دەوری دژە گەردەلولەکاندا ، لەزستاندا لەسەر نیمچە دورگەی عەرەبیدا لەنگەر دەگرێت ، لەگەڵ بەرزایی و بڵندایی دا بارانی ناوچەکە پتر دەبێ ، برەکەی لە گردە دەرەکییەکاندا دەگاتە (٣٠٠ ملم) و لە بەرزایی یەکاندا ساڵانە دەگاتە (١٠٠٠) ملم ، وەك لە چیاو بەرزاییەکانی جیلوداغ و هەڵگورد ..

ڕووەکە سروشتییەکانی کوردستان بە وردی کاردانەوەی ئاو و هەوای کوردستانە ، هێلی گەشەی درەختەکانی خوارو بە شێوەیەکی گشتی بەبەرزایی (٧٠٠) (١٠٠٠) م دا دیاری دەکرێن لەسەر ئەو گردە دەرەکی یانەی بە درێژایی زنجیرە چیاکان درێژ دەبنەوە ، ئەو هێڵە بە زۆری هێڵی بارانی (٥٠٠) ملم دەگرێت ، دارستانەکان دار بەڕووەکان (oak) دایاندەگرن ، کە بەهۆی داربڕەکان و شوانەکان دەگۆڕێن بۆ چەند

دارۆچکەیێك ، دیسان دەتوانرێ دارچنارەكان (العرعر) لەبەشی ژووروودا بدۆزرێنەوە ، دارەبان (القیقب) و گوێزو گێوژو چەقاڵە (اللوز) دەبینرێت .

بناوەكان (ash – دردار) لەناو دارگوێزەكاندا لەبەرزایی مامناوەندا هەیە ، هەروەها دار فستق و زەیتون لە هەندێ وشكایی یەكاندا هەیە .

هێڵی دارو درەختە بالاّ بەرزەكان لە بەرزایی (٢٠٠٠)م دا دەردەكەون ، دوور نییە بەرزی گەرمی ئەو بەرزایی یانەی دیاری كردبێ (گەرمی كانونی یەكەم = ١٠°م) لە باشوری خۆرهەلاّت بەدرێژایی زنجیرە چیاكانی ئێرانی بەرزاییان بۆ (٣٠٠٠م) كەمتر دا دەبەزێت ، دارستانەكان لەو ناوەدا ڕووبەرێكی بەرەو ناوەوە دادەپۆش و بەهێڵی گەشەی دارەكانی ناوخۆدا (الداخلی) كۆتایی دێت ، ئەو ناوچانەی بارانیان دەگاتە (٥٠٠) ملم بەرزایی یان لە نێوان (١٣٠٠ – ١٥٠٠)م دایە .

ئاسەوارەكانی بەستەڵەكی پلاستوسینی لە سێ ناوچەدا بە تایبەتی لێكۆڵینەوەی لەسەركراوە لە عێراقدا ، ناوچەی (هەلگورد) و (دۆڵی بۆڵە) و (رواندز) و دەوروبەری ناوچەی جیلوداغ لە كوردستانی توركیادا ، بەرزایی زنجیرە چیاكانی لە نزیك هەلگوردا لە نێوان (٣٠٠٠ – ٣٥٠٠)م دایە ، ئەو ناوچانە فراوانترین چاخی بەستەڵەكی پلاستوسینی گرتوینەوە و لەسەر قەدپاڵەكانی باكوری چیاكان پێك هاتووە و بەسەر (الخوارنق) دا خلۆربۆتەوە بەلای باشوردا بەرەو دۆڵی زێ ی گەورە بۆ بەرزایی یەكی نشێو (١١٠٠)م دەبێت ، بەشە بەرزەكانی دۆڵە فراوانەكان بە تاوێرەكانی پاشماوەكانی ڕوبارەكانی بەستەڵەكی داپۆشراوە ، بە دژواری لە كەڵەكەكانی تر جیا دەكرێنەوە ، بەلاّم ئەو هەندێ دەریاچەو شێوەی بچوكی لەگەڵدایە ، هەندێ كەڵەكە بەرد هەیە لەبەرزایی (١٥٠٠ م)دا لەسەر قەدپاڵەكانی ئاڕاستەی ڕووی باكوری زنجیرە لقی یەكان.

ڕوباری رواندز لقێكی گرنگی ڕوباری زێ ی گەورەیە ، برێ چەو و لمی پاشماوە بەهۆی توانەوەی ئاوی ژێرەوەی سەهۆڵ بەندانی پلاستوسینی یەكە لە چەند تەلانێكدایە بە ئەستورایی (٤٠-٦٠)م دەبێ لەسەرووی ئاستی ڕوباری هەنوكەییدا ، لەگەڵ بوونی

چەند کەڵەکێکی تازە لەسەر هەندێ زنجیرە چیادا ، کە ڕوباری ڕواندز دەیانبڕێ ، بەلأم ئەو تەلأن و ڕێڕەوانە (المدرجات) هیچ کەڵەکە بەستەڵەك و ڕەنوێکی جیایان ناکەوێتە پێشەوە دوور نیە ئاماژە بۆ مێژووی پێشکەوتنی بەستەڵەکی دوایی بکات .

پەیوەندییەکە بەهۆی بوونی نیشتەنییەکان (الرسوبات) ئاڵۆزبووە ، کە بوونیان بۆ ڕمان و ڕوتانەوەی خاکەوە بووە لەناوچەکانی چاوگەی ڕووبارەکانەوە ، ئەو تەلانانە خۆشیان چەند نیشتەنییەکن ، لە تاوێری هاڕاوی کەڵەکە کراو پێك دێت ، تێکەڵ بەخۆڵ بوون و چینەکی تری ئەستور تاوێری کەڵەکەکراو (colluviums) دایپۆشیون ، ئەو چینە دوا قۆناغی بەستەڵەك و دوا بەدوای چەرخی بەستەڵەك پێکدێنێت ، ڕووداوەکانی چاخی پلاستوسینی زوو لەو دەڤەرەدا پارچەو ماوە بەرزەکان کە لە تاوێری بریشەی کلسی پێك دێن و ئەشکەوتەکانی موسیترییە ئاماژە بۆ هەبوونی یان دەکەن ، دەکەونە قەدپاڵەکانی گردەکانەوە ، دیسانەوە پاشماوەکانی لی و چەوی و چینە وردەکانی لیتەی دەریا چەیی و کلسی سەر بەرزایی یەکانی (٢٥٠م) سەر ڕوباری ڕواندز ئاماژە بۆ ئەوەی دەکات .

پاشماوەو نیشتەنییەکانی بەستەڵەکی پلاستوسینی لەو ناوچانەی دەکەونە باکوری جیلوداغەوە لە باشوری خۆرهەلأتی تورکیاوە هەیە ، بەدرێژایی ڕوباری زێ ی گەورە لە بەرزایی (١٥٠٠م) دا ، کە بریتین لە پاشماوەکانی بەستەڵەکی لە باکووری جیلوداغدا و زنجیرە چیاکانی لق و پۆپی باکوری و خۆرئاوای ئەوێوە پێك هاتون ، نزمترین شوێنی پلاستوسینی کە لەوێدا دۆزرابێتەوە دەکەوێتە بەرزایی (١٨٠٠م) ، بەلأم تاکە ناوچەی لێکۆڵەران سەردانیان کردبێ ئەو دەڤەرەیە دەکەوێتە بەشی باکوری ئەو ناوچەیەی توشی دا ڕوخان و ڕوتانەوەی بەستەڵەکی بووبێ ، باران بارین لەوێدا کەمترە لەناوچە سەرەکییەکانی جیلوداغ و قەدپاڵە دەرەکییەکانیان. هەرچەندە بەستەڵەکی نوێ ی هەمیشەیی لەناوچەی هەلگوردنیە ، بەلأم چەند پاشماوەیێکی بچوك لەلایەن (بوبك Bobok)ەوە دیاری کران لەسەر هەندێ کەڵەکەی جیلوداغدا.

هێڵی بەفری هاوچەرخ لەناوچە سێیەکاندا لە بەرزایی (٢١٠٠م) دا لە جیلوداغدا و لە بەرزایی (١٥٠٠م) دا لە هەلگورددا ئاماژە بەنزم بوونەوەی هێڵی بەفری لە چاخی پلاستوسینی دا بۆ نزم بونەوەی پلەی گەرمی بگێڕدرێتەوە ، ئەوکاتە دەبێ پلەی گەرمی لەو چاخەدا (١٢°)س دابەزی بێت و لە تێکڕای ئێستای کەمتر بوو بێت.

(ه.أ.رایت) دەنووسێ : کوردستان ناوچەیێکی چیانشینە دەوڵەتی عێراق و تورکیاو ئێران بەیەك دەگەیێنێ ، کۆمەڵە چیایێکی بەرزو هەورازو سەختەو بەشێکە لە کەوانەی چیای گەورەی تۆرۆس و زاگرۆس ، کە بەرزایی یان (٣٠٠٠ — ٤٠٠٠)م دەبێ لە ئاستی ڕوی دەریاوە ، لەخۆر هەڵاتەوە لەدەریای سپی ناوەڕاستەوە بەرەو باشوری خۆرهەڵاتی درێژدەبێتەوە تا کەنداوی عەرەبی ، چەند دەشتایی یەك لە نێوان ئەو دوو ڕووبارەدا ئەو درێژ بوونەوە فراوانەی لە هەردوو گردۆلکەی ئێرانی و ئەنادۆڵی جیاکردۆتەوە ، ئەو چیایانە باشوری خۆرئاوای ئاسیا بەجیۆلۆجی و فیزیو گرافیاو ئاو و هەواو شارستانی دا دەبڕێ ، ئەمەش خزمەتێکی زۆری کردووە ، چونکە بەربەستێکی کاریگەر بووە لە بەرامبەر تێکەڵ بوونی شارستانی نێوان وڵاتی دۆڵی دوزێ و دەڤەرەکانی ناوەوەی ئەو دو گردۆلکەیە ، دیسان ئەو چیایانە یارمەتی خەڵکی مەرِدارو گەشتیاری داوە ، کە دانیشتووی خاکە نشێوەکان بوون و هاوینان چوونە ئەوێ ، وە شوێنەکی بێ ترس و بیمی بۆ کوردەکان دابین کردووە ، کە لەو دەڤەرەدا ژیاون ، بەڵگەکان دەرکەوتون کە گردەکان و قەدپاڵەکانی چیاکانی کوردستان چەند ناوچەیێکی بنەڕەتی دەست پێ کردنی ژیانی لادێ نشینی و ئاژەڵداری و کشتوکاڵی بوون ...

دەنووسێ : (بوبك — ١٩٤٠) ئاماژەی بەبوونی شوێنەواری بەستەڵەکی پلاستوسینی فراوان کردووە لە جیلوداغدا لە کوردستانی تورکیادا ، دیسان دی مورگن /٩٢ . ١٩٠٩ ،

کەسێکی تر بوو ئامازەی بە پاشماوەی بەستەڵەك کرد لە چیاکانی زاگرۆسدا لە کوردستانی ئێراندا ، لەوانە لە لوڕستان[42].

بەکورتی : کوردستان (کە دەکەوێتە بازنەی پانی نێوان (٣٢,٤٥ — ٣٧,٢٢) و بازنەی درێژی (٤١,٢٣) و (٤٥,١٩)ەوە لە خۆرهەڵاتی گۆی زەوییەوە ، لانکەی یەکەمی ژیانەو دووبارە بوونەوەی ژیانیش لەسەر دەستی نوح هەر لە کوردستان بووە ، چونکە کوردستان خۆشترین شوێنە لە جیهانداو قودسییەتێکی تایبەتی خۆی هەیەو خودا بە پیرۆز ناوی بردووە ﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ ﴿ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾

وە کوردستان بەهەشتی سەر زەوییەو هەر چوار وەرزەکانی تێدا دەبینرێ و شوێنێکی ستراتیژییە ، چونکە خۆرهەڵات و خۆرئاوا پێکەوە دەبەستێەوە لە جیهانداو پڕە لە خەزێنەی سروشتی لە نەوت و زێڕو یۆرانیۆم و ماددەی بەنرخی تر ، کوردستان لە سەر ئۆقیانوسێ نەوتە ، بەشێکی گەورەی یەدەگی نەوتی جیهانی هەڵگرتووە ، بۆیە ئەمریکاو وڵاتە دراوسێکان چاویان تێ بڕیوە ، پاشان خاوەنی ئاوی شیرینە ، کەزێڕی سپی یە و لە پێشەوەی نەوتدا دادەنرێت ، کوێستانی ڕووی زەمینەو ژینگەیێکی تایبەتی خۆی هەیە لە جیهاندا ، کوردستان بەشێکی زۆری چیایە و بەشێکی زۆری زوورگە وەك نەینەواو کەرکوك ، کە سامانی نەوتی زۆریان تێدایەو بۆ چاندنی گەنم و جۆ بە پیتن ، لەوەڕیان زۆرە ، بۆیە بۆ بەخێوکردنی ماڵات بەخێوکردن گرنگن ، چیاکانی کوردستان خاوەنی بەفروبارانی زۆرن دەبنە چاوگی ئاوی سەرزەوی و ژێرزەوی ، شوێنەکی هاوینە هەواری و کوێستانین و لەوەڕیان زۆرە بۆ ئاژەڵ

---

[42] اثار العصر الجليدى البلاستوبينى في كردستان / بروفيسور هـ.أ.رايت / ت: فواد حمه خورشيد / ل : ١٢- ١٧ بەکورت کردنەوە.

بەخێوکردن و کانزای سروشتی یان زۆرەو بۆ بەروبومی کشتوکاڵی گرنگن و بە پیتن و دەشتاییشی زۆرە بۆ کشتوکاڵ کردن و ئاژەڵداری .

**(( ژینگەی دەریایی )) ئاوی شیرین و سوێر :**

قورئانی پیرۆز لەدەیان ئایەتدا ئاماژەی بە ژینگەی دەریایی و گرنگی یەکەی کردووە بۆ سەر ژیان و گیانداران و ڕووەك مرۆڤ و هەر جارەش دەیان ئیعجازی تێدا دەخوێنینەوە ، بڕوانە : وشەی (البحر) لە (المعجم المفهرس الألفاظ القران الكريم) محمد فواد عبدالباقي) ﴿ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ ﴾

واتە : گەر دەریامان بۆ شەق کردن و ئێوەمان ڕزگار کردو بنەماڵەی فیرعەونمان نقوم کردن ..

ئەم موعجیزەیە (حەزرەتی موسا) بە شێوەی (سایکۆکینیزیا) ڕوویداو بەهاڵەی گیانیی موگناتیسی دەریای بەرزکردەوە تا میللەتی ئیسرائیلی پێدا ڕەت بوون و کاتێ پەڕینەوە دەریاکەی بردەوە دۆخی ئاسایی خۆی و فیرعەون و بنەماڵەکەی خنکان.

﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ۝٦ ﴾ التكوير: ٦ ﴿ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ۝٦ ﴾ الطور: ٦

لێرەدا ئاماژە بە بورکانە دەریاییەکان دەکات وەکو لە کتێبی زەوی ناسیدا باسکراوە .

﴿ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِى تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ۝١٦٤ ﴾ البقرة: ١٦٤ ، واتە : ئەو کەشتی یەی بە دەریادا دەڕوات بۆ ئەو شتانەی سوود بە خەڵکی دەدات .

لێرەدا قورئان ئاماژە بە یاسای دۆزینەوەی بەلەم و پاپۆڕو کەشتی دەکات بۆ ڕۆیشتن بەسەرئاودا بۆ دەرهێنانی سامانە ئاوییەکان بۆ سوودگەیاندنی خەڵکی ، ئاماژە دەکات دەریاکان هۆکارێکن بۆ گەیاندنی کیشوەرەکان بە یەکتری ، ئاماژە بە یاسای پاڵنان بۆ سەرێ دەدات ، ئەو یاسایە دەڵێ : (هەر تەنێ نقومی ئاو ببێ لە ژێرەوە بۆ سەرەوە پاڵنانێکی ستوونی دەست پێ دەکات یەکسانە بەو کێشەی ئەو ئاوەی تەنەکە لای

بردووه) ، گەر شتێکی گران دەخەیە ناو ئاوەوە دەبینی نیوەی کێشەکەی بزر بوودو هێزێ بەرەو سەرێ پاڵی دەدات ، گەر ئەو هێزە نەبوایە ماسی و نەهەنگەکان و گیاندارانی دەریایی نەیان دەتوانی مەلە بکەن و پاپۆڕو کەشتی یەکان نەیان دەتوانی بەسەر دەریادا بڕۆن[43] .

وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَـٰرَ

واتە : کەشتی بۆ ڕام کردوون تا لە دەریادا بە فەرمان و یاسای ئەو بڕوات و ڕووبارەکانی بۆ ڕام کردوون .

واتە : خودایە دەریای بۆ ڕام کردوون تا گۆشتی ناسکی لێ بخۆن ، لێرەدا قورئان ئاماژە بە گرنگی ڕاو دەکات ، ئاماژە بە گرنگی گشتی دەریایی دەکات لە سودی گۆشتی ماسی و نەهەنگەکان بۆ لەشی ئادەمیزاد

لە گۆڤاری (العربی)ی کوەیتی دا هاتووە : (ڕاوکردن و پەروەردەکردنی گیاندارانی ئاوی بە ڕۆڵێکی یەك لا کراوە هەڵدەستێ بۆ کۆمەکی خۆراکی و ئاسایشی خۆراکی و بەدەست هێنانی داهات ، (٤٢) ملیۆن کەس ڕاستەوخۆ وەکو ڕاوچی و پەروەردەکەری ماسی کاردەکەن ، سەدان ملیۆن کەس لە کارگەکانی پەیوەند بەمەوە ئیش دەکەن ، بەیانەکانی (فاو) باس دەکات لە بەرامبەر هەر تاکێکدا کە لەناو دەریادا سێ کەس لە کەنار کار دەکەن ، ئەمەش هەلی کارکردن زیاتر دەکات ، دیسان ماسی پرۆتینی سەرەکی ئاژەڵ بۆ زیاتر لە (٢٠٠) ملیۆن کەس دابین دەکات ، (٩٠٪)ی ئەوانە سەر بە وڵاتە هەژارەکانن ، دیسان خۆراکی دەریایی لە هەمو بازاڕێ زیاتر کراوەیەو لەسەرووی بازاڕی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانەوە ، ماسی ژەمە خۆراکی زیاتر لە (٢,٨)

[43] ایات في الافاق / النابلسی .

ملیار مرۆڤە ، (٥٠٪)ی ئەوانە خەڵکی ڕەش و ڕووتی وڵاتە هەرە هەژارەکانن ، لەوانە : باشوری ئاسیاو ئەفریقیا[11].

﴿ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾ ﴾ لێرەدا قورئان کەشتی یەکان لەدەریادا بە چیا دەچوێنێ ، ئەمەش پێشبینی دەکات بۆ داهێنانی پاپۆڕو کەشتی گەورەو چەند قات ، کە وەکو شارێك و زنجیرە چیایێ لە دەریادا دەردەکەون.

وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا واتە : خشڵ لە دەریا دەردێنن تا ژنان بە خۆوەی بکەن .

لێرەدا ئاماژە بە دەرهێنانی مرواری و مەرجان و ماددەی بە نرخی تر دەکات لە دەریا بۆ خشڵ و جوانکارییەکان و بازاڕێکی گەورە بۆ خەڵکی هەژار دەکاتەوە بۆ دابین کردنی ژیان و گوزەرانیان.

﴿ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْبَحْرَانِ هَـٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَـٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ، واتە : ئەو دوو دەریایانە یەکسان نین ، ئەمە سازگارو شیرینە بۆ خواردنەوە سازگارە ، ئەمەی تریشیان سوێرو تفتە.

لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ ژینگەی ئاوی سوێرو ئاوی سازگار دەکات ، ڕووبارەکان شیرینن و ئۆقیانوس و دەریاکان سوێرن و تێکەڵ بەیەکتری نابن ، پاشان دەریاکان ڕێگایەکی پەیوەندین بۆ گواستنەوەی کاڵا و بازرگانی نێو دەوڵەتی و گواستنەوەی سووتەمەنی و چەك و ئامێرو کەلو پەلی ترو خۆراك ، ﴿ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ ﴾

---

[11] مجلة العربي / عدد : ٦٠٢ / كانون الثاني / ٢٠٠٩ / ل : ١٥٩.

ئێستا کەشتی هەیە توانای هەڵگرتنی (ملیۆن تەن) نەوتی هەیە ، (٧٠٠) هەزار تەن و (٨٠٠) هەزار تەنمان بەر لە چەند ساڵێ بیستبوو ، یان (٨٠٠) هەزار تەن و نیوێك ، بەڵام نوێترینیان زیاتر لە ملیۆنێك تەن هەڵدەگرێ لە ئۆقیانوس و دەریاکاندا، وەکو شارێکە بەسەر ئاودا دەڕوات ! ئەمەش لە سایەی چی یە ؟ لەسایەی ئەو یاسایە پاڵنەرەیە بەرەو سەرەوە پاڵی دەدات و بە فەرمانی یاسای خوا (امر الله) کار دەکات ، یەکەم کەس (ئەرخەمیدس) دۆزییەوە ، خوای گەورە لە زۆر ئایەتدا ئاماژەی بەو یاسایە کردووە [1]. وەکو ڕابردوو باسکران.

(الصوفي احمد اهر م. د) لە ( على الحيـــاة نشـأة في الله آيـــات والانهـــار والمحيطـــات البحـــار وفي الانســـان وظهور الارض)

ئەم ژمارەیەی تەرخان کردووە بۆ دەریازانی زۆر ڕاستی دربارەی دەریاکان باس کردووەو بەزۆری لە ڕازە شاراوەکانی ئەم جیهانە فراوانەی ئاشنا کردووین ، کە قورئان بەر لە زانستی نوێی دەریازانی ئاماژەی بۆ کردوون ، بە ویستی خوا ئێمەش کتێبەکی تایبەتمان دەربارەی جیهانی دەریا دەبێ لە داهاتوودا ، زۆرێکیشمان لە کتێبی زەوی ناسیدا باس کردووە .

ئاو (٤/٣) ی زەوی پێك دێنێت ، (ژینگە زانان) دەڵێن : (تا ئێستا (٣٨٠٠٠) جۆر گیانداری دەریایی دۆزراونەوەو بەردەوامیش دۆزینەوە بەردەوامە ، بێگومان ئەو جیهانە فراوان و بێ شومارە ، هەر کام جیهانانە لە ناوەندێکی ژینگەیی دەریایی سنوردار دەژین ، زیندەوەرانی دەریای سپی ناوەڕاست جیاوازن لە زیندەوەرانی ئۆقیانوسی ئەتڵەسی ، بەربەستێکی ئاوی لە جۆری سێ یەم لێکیان جیا دەکاتەوە و بوار نادات ئاو و ژیانی ژینگەیی ودەریایی و ئۆقیانوسی تێکەڵ بەیەکتری ببن ،وەکو

---

[1] ايات الله في الافاق / ل : ١٨٨ . د.محمد راتب النابلسي.

خـــــــوا فەرمووویـــــــــــەتی﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ ﴾ [٤٦]

ئاوی سەر زەوی سەدان دەریاو پێنج ئۆقیانووس پێك دێنێت ، لەناو ئۆقیانووسەكاندا زنجیرە چیاو بورکان و دۆڵ و چاڵ و هەوراز هەیە ، ئۆقیانووسی هێمن (الهادي) فراوانترین و قوڵترین ئۆقیانووسە ، بەتەنیا لە هەر (٧) كیشوەرەكان گەورەترە ، ئۆقیانوسی (هینـدی) بچوكترینیانە ، ئۆقیانووسی بەستەڵەكی باكوور دەوری جەمسەری باكووری داوە لە گۆی زەوی ، ئۆقیانووسی بەستەڵەكی باشوور دەوری جەمسەری باشوری داوە لە گۆی زەوی ، ئۆقیانووسی بەستەڵەكی شێوەی پیتی (S) هەڵكەوتووە دەكەوێتە نێوان هەردوو كیشوەری ئەمەریكا و ئەوروپاوە[٤٧].

قورئـان ئامـاژە بـە قـوڵایی و تاریكـایی دەریاكـان و ئۆقیانووسـە قوڵـەكان دەكـات ﴿ أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ ﴾ ، واتـە : وەكـو تاریكاییـەكانی نـاو دەریایـەكی قووڵـە ، شەپۆل لەسەر شەپۆل دایپۆشیوە .

بێگومـان ڕونـاكی خـۆر ناگاتـە قـوڵایی (٧٠٠)م لـە ژێـر ڕووی دەریـادا ، بـەڵام لێـرەدا تاریكـایی هەیـە لـە دەریـادا لـە قـوڵایی (٥٠٠)م دا چـاوی مـرۆڤ ڕەش و سـپی لێـك جیاناكاتەوە ، لە دەریاكاندا كەش زۆر سارده و پلەی گەرمی لە قوڵایی (١٠٠٠)م دا ناگاتە (٦°)س و لە قوڵایی (٢٠٠٠)م پلەی گەرمی (٢-٣°)س زیـاتر نییـە ، لـە هەنـدێ قوڵاییدا پلەی گەرمی لە ژێر سفردایە ، بەڵام ئاوەكە بـەهۆی خـوێ وە نایبەستێت ،

---

[٤٦] ایات الله في البحار والمحيطاط والانهار / د.ماهر احمد الصوفي / ل:١٦٦.

[٤٧] هەمان سەرچاوە / ل: ١٩٣.

لەدەریا قوڵەکاندا بەهۆی نەمانی ڕوناکی تەنیا هەندێ فەوزەو گیانداری شێوە سەیر نەبێت ناژیێت.

دیسان قورئان ئامـاژە بـۆ شـەپۆلەکانی دەریـا دەکـات ، کـە هەمیشـە بـە یـەك ئاسـتدا دەڕۆن و باو سوڕی زەوی پەیدا دەکەن ، کاتێ ئاوەکان بەیـەکتری دەگـەن و گـەرمی و خوێ جیادەبنەوە ئەوکاتە تەزو شەپۆل پەیدا دەکەن ، ناودارترینیان شەپۆلی (گۆلف ستریم)ە.

لەکـەناری ئۆقیانووسـدا بـەرزو نزمـی دەکـەن ، ئەمـەش جوڵـەی هەڵکشـان و داکشـان (المدو الجزر)ە لە هێزی کێشکردنی خـۆرو مانگـەوە دروست دەبـن و لـە کـەنارەکانی ئـەوروپای خۆرئـاوادا هەڵکشـان و داکشـان (٦) کاتـژمێرو (١٢) خولـەك دەخایـەنێت ، ڕۆژانە دووجار ڕوودەدەن ، بەلام کاتی ئەم دوو جوڵەیە ڕۆژانە نزیکەی کات ژمێـرێ لا دەدەن .

ڕووی دەریــا (بــا) بەســەری دا هەڵــدەکات و شــەپۆل پەیــدا دەکــەن ، جــار هەیــە بوومەلەرزەو بورکان شەپۆلی دژوار پەیدا دەکەن بەناوی (تسونامی) ، بەزۆری لە ئۆقیانوسی هێمندا پەیدا دەبێت [48].

## بورکانی دەریا و ئۆقیانووسەکان

(د.ایمن الاسكندرانی) دەنووسێ : چۆن بورکان لە وشکانی دا ڕوودەدات بەڕێژەییەکی گـەورەتر لـە دەریاکـان و ئۆقیانووسـەکاندا ڕوودەدات ، (بازنـەی ئـاگرین — الحلقة النارية) ڕێژەیەکی گەورەی ئۆقیانووسی هێمن داگیر دەکات ، بورکانی ئاوی و دەریایی دروست دەکات [49].

---

[48] آيات الله في البحار والمحيطات والانهار / ل: ١٩٣ — ١٩٦ بەکورتکردنەوە.

[49] الزلازل والبراكين / د.ايمن الاسكندرانی / ل: ٥٥.

تسونامی ئەندەنوسیا (٢٠٠٤ ز) ، کە تەلەفزیۆنەکان پیشانیاندا (٩) پلەی ڕێختەر بو (١٦٠) هەزار کەسی لە ولاّتدا کوشت [٥٠].

قورئـان فەرموویـەتی :﴿ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ۝٦ ﴾ دەریـای داگیرسـاو ئۆقیانووسـی هێمنـە ، کـە ئالقـەی ئـاگرین دەوری داوە و هەمیشـە بورکـانی تێـدا دەتەقێتـەوە ، وەك لـە کتێبـی (زەوی ناسـی)دا باسـکرا ، زاناکـان بـاس لـە باڵنـدەو گیاندارێکی زۆر دەکەن لە خشۆکەکان و وشکاوییەکان (البرمائیات) لە دەوری ئاوەکاندا دەژین.

زاناکـان دەڵێن : (٣٥٠٠) جـۆر شـیردەر ناسـراوە (٥٥٠٠) جـۆر خشـۆك و وشـکاوی بـە (البرمائیات) ناسـراوە ، ماسـی یـەکان (١٨٠٠٠) جـۆری هەیـە ، ژمـارەی مێرووەکـان لـە جۆردا لـە ملیـۆن تێپـەڕیوە ، هەرچـی باڵندەیـە (١٨٠٠ – ٢٦٠٠) ڕەگـەز هەیـە ، هـەر ڕەگەزەو چەندان جۆرە ، هەندێ پێیان وایە (٨٥٩٠) جۆرە [٥١].

نمونـەی ئەوانـەی لـە دەوری دەریاکـانن وەکـو پـەنگوین و ماسـی خۆرەیـە ، دیسـان شیرناوەکان هەیە ڕوبارو دەریاچەو گۆماو و زەلکاوەکان دەگرێتـەوە ، ئـەو شـوێنانەی گەڵێ لە زیندەوەری زەریایی و وشکانیش تێیاندا دەژین ، نمونە ماسی (سەلەمون)ە کە لە ئۆقیانووسدا دەژین و دەتوانن لە ئاوی شیرینیشدا خۆبگونجێنن ، یان نیمچە سوێر ، دیسان زیندەوەرە دەریاییەکان ئاوی خۆیان بەجێ دێڵن و بۆ ئەو ئاوانە کۆچ دەکەن شـیرین بـن ، یـان لێ یانـەوە نزیـك بـێ یـان لـە وشـکانیدا ، نمونـە : حەزازییـەکان و گیانداره وشکاوییەکان (البرمائیات) ە ، واتـە : ئـەو گیاندارانـەی لـە هـەردوو شـوێنندا دەژین وەکو : تیمساح و بۆق و مارو قرژاڵ .

---

[٥٠] هەمان سەرچاوە/ ل : ٦٥.

[٥١] شيء عن الطيور / شقيق مهدي.

﴿ مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخۡرُجُ مِنۡهُمَا ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡمُنشَـَٔاتُ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الرحمن: ١٩ - ٢٤ **شایانی باسە چۆن گیاندارانی دەریایی لە ئاودا ئەو گیاندارانەش لە ناو شەپۆلی ئاوی دا مەلە دەكەن ، ئاو لە (H٢O) پێك دێت و لە هایدرۆجین و ئۆكسجینی تواوە پێك دێ ، بەهەمان شێوەش مرۆڤ لە ناو هەوای گازی دا دەژیت ، كە بریتی یە لە شەپۆلی گاز وەكو پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی .**

**(ابن عباس) گێڕاویەوە : (لە پێغەمبەر (ﷺ)م پرسی ئەم ئاسمانە چییە ؟ فەرمووی : هذا موج مكفوف عنكم) رواه ابن ابي حاتم. واتە: ئەمە شەپۆلێكە لەبەرچاوی ئێوە شاردراوەتەوە .**

**كەواتە بێگومان هەوا بریتی یە لە شەپۆلێكی نادیار لە دۆخی گازی داو دەوری زەوی داوە ، تەواوی پێك هاتە گەردوونیەكان بریتین لە كۆمەڵێك شەپۆل و لەرەلەر.**

# بەشی چوارەم

# سەرچاوە سروشتییەکان

ئیعجازی ( ٢٥ )    سەرچاوەکانی ژینگەو چۆنیەتی بەکارهێنانیان

ئیعجازی ( ٢٦ )    تیشکی خۆر

ئیعجازی ( ٢٧ )    خاك و گڵ

ئیعجازی ( ٢٨ )    ئاو

ئیعجازی ( ٣٠ )    سامانی کانزایی

ئیعجازی ( ٣١ )    ڕووەکەکان

ئیعجازی ( ٣٢ )    گیاندران

﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ ﴾ النبأ

**لێرەدا قورئانی مەزن ئاماژە بە هەموو سەرچاوەکانی ژینگەو چۆنیەتی بەکارهێنانیان دەکات ، کە ئیمڕۆ لە زانستە ژینگەییەکاندا باسکراون ، وەك لەسەرەوە وەکو خاك ئاماژەمان پێیانداوەو تەواوکەری یەکترین .**

١- ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ ﴾ النبأ **لێرەدا خوا فەرموویەتی : ئایا زەویمان بۆ نەکردوون بە لانکەو شوێنەکی گونجاو بۆ ژیان ، کە هەموو هۆکارەکانی ژیانی تێدا دانراوە ، لەئاو و هەواو خاك و ڕووەك و گیاندارو سامانی سامانی کانزایی و تیشك و گەرمی و هێزی کێشکردن و کەشی لە بار.** ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ ﴾ النبأ **چیاکانمان نەکردوون بەمێخ ؟ چیاکان چەندیان لەسەرەوەیە دوو هەندە لەژێر زەویدا چەقیون و زەوییان قاییم و توند کردووە ، چیاکان پەیوەندییان بە ئاو و هەواوە هەیە ، سەرچاوەی ڕووبارەکانن و ، سەرچاوەی زۆرێ لە دارستانەکان و ڕووەکانن و دلگیری بە سروشت دەدەن . (بڕوانە کتێبی زەوی ناسی).**

٢- ﴿ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾ ﴾ النبأ **واتە : ئێوەمان بەنێرو مێ دروست کردووە ؟ گەر نێرو مێ نەبوایە لەنێوان مرۆڤ و گیانداران و ڕووەکدا زۆربون نەدەبوو ژیان کۆتایی دەهات.**

٣- ﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ ﴾ النبأ **وە خەومان بۆ کردوون بە پشوودان و حەسانەوە ، خەو بۆ گیانداران و مایەی حەسانەوەیە تا زۆرێ لە گیانداران بەدرێژایی زستان لە سڕ بوون و خەوتندانە .**

وەکو لە کتێبی (خەوننامەی کوردی لەژێر ڕۆشنایی شەرع و زانستدا) باسم کردووە نووستن مرۆڤ دەخاتە نەست و و دنیای میتافیزیکییەوە ، لەش و دەروون پشوودەدەن و کەرەستەی کیمیایی دروست دەبن بۆ بنیاتنانەوەی شانەکانی لەش و پێکهاتنی پرۆتینەکان و کرداری زیندەگی تر ، گەر مرۆڤ ماوەیێ نەخەوێ تووشی زەین کوێری و وڕێنە و شەکەتی دێت.

٤- ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ ﴾ ، واتە : شەومان بۆ کردووە بە پۆشاک ، شەو کاتی حەسانەوەیە ، کرداری شەو و ڕۆژ بەردەوام بەهۆی گۆیی زەوی و سوڕی تەوەرەیی زەوی بەدەوری خۆیدا ڕوودەدات ، زۆر لە گیانداران لەشەودا شەوگەڕن و خۆراک پەیدا دەکەن ، زۆرێک دەچنەوە لانەکانیان دەخەون و پشوو دەدەن .

٥- ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ ﴾ واتە : ڕۆژمان بۆ کردووە بە بژێوی مرۆڤ و گیانداران بە ڕۆژ کاردەکەن بۆ بەدەست هێنانی بژێوی ژیانیان ، ڕووەک لە ڕۆژدا کرداری ڕۆشنە پێك هاتن بۆ بژێوی ئەنجام دەدات .

٦- ﴿ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ ﴾ واتە : حەوت چینی بەهێز لە سەرسەرمان دروست کردون ، خولگەکانی ئەلکترۆن (٧) دانەیە ، زەوی حەوت چینە لە توێکڵ ، حەوت بەرگە هەوا دەری داوە ، (٧) دۆزەخ و (٧) گۆی بەهەشتی دەوری داوە ، وەك لە زەوی ناسی دا باسمان کرد ، ڕوناکی بینراو (شەبەنگ) حەوت ڕەنگە دەوری زەوی داوە ، زەوی (٧) بەرگە هەوای هەیە : بەرگە هەوای خوارەوە (ترۆسفیر) ەو سەرو ترینیان (ئیکسۆسفیر)ە و حەوت کیشوەرەو حەوت ئۆقیانووسە ، وەکو لە کتێبی زەویناسی و گەردووناسی دا باسمان کردووە.

٧- ﴿ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ ﴾ ، واتە : دامانناوە چرایێکی درەخشان ، خۆر سەرچاوەی گەرمی و وزەی زەوییە بۆ مرۆڤ و گیانداران و ڕووەك.

٨- ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ ﴾ ـــــ بۆمان باراندون لە هەوری گوشراوەوە بارانی بە لێزمە.

لێرەدا خودا هەوری بەدوای خۆردا هێناوە ، چونکە خۆر هەڵم دروست دەکات لە ئاوەکانی سەر زەویدا بۆ دروست کردنی هەورو باران.

٩- ﴿ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ ﴾ ، واتە : بەو بارانە بروێنین دانەوێڵەو ڕووەك و باخچەی چڕو پڕ. باران چاوگی ئاوی شیرینە ، باران زەوی زیندوو دەکاتەوەو کانیاو و ئاوەکان دەژیێنێتەوە ، باران هەڵگری نتریت و زۆر ماددەی بەسوودە بۆ ڕووەك ، بۆ ڕواندن و خۆراك پێدانیان و گەشە پێ کردنیان .

پاشان قورئان ئاماژە دەکات (خۆرو باران و هەوا) سەرچاوەی ژیانی مرۆڤ و گیانداران و ڕووەکن بەدوای خاکدا.

(ام . اس . کوردون / ١٩٦٧) پێ ی وایە : (سەرچاوەکانی ژینگەی ژیان هەر ئەوەندە نین بەردەوامی بە ژیان بدەن ، بەڵکو هەموو ئەو شتانەن لە هەموو بوارێکدا بۆ ژیان پێویستن ، لە ڕووی دەروونی و هەستەوەری و ڕۆشنبیری تاکی و کۆمەڵایەتی یەوە ، ئەو هەڵوێستە پێویست دەکات مرۆڤ و ئەدگاری جوانییە بنیاتنەرەکانی بپارێزرێت، دیسان دەبێتە هۆی پاراستنی بەشە تازەکانی خودی سروشتەکەی وەکو ناوچە سەیرانی و کوێستانییەکان و شوێنەکانی شیفا بەخشی و گەرماوە کانزایی یەکان و ناوچەکانی پاراستنی سروشتی ڕووەکی و ئاژەڵی لە بنیات نان و کانزا کردن و هەر پیس کردنێکی شارستانی لە بازنەی خۆیدا.

**(تیشکی خۆر)**

خۆر سەرچاوەی تیشکی کەهرۆموگناتیسی یە، ڕۆڵێکی گرنگی هەیە بۆ دەوام دانی سووڕی سرووشتی بونەوەر لە ژینگەی ژیاندا ، کە سووڕێکی پێویستە بۆ پاراستنی ژیان لە زەویدا ، وەرگرتنی وزەی خۆرو گۆڕینی بۆ وزەی کیمیایی بە بنەمای

گرنگترین کارلێکردنی کیمیایی دا دەنرێ لە ژیانی ڕووەکدا کە ڕۆشنە پێك هاتنە ، گۆڕینی وزەی خۆر بۆ وزەی گەرمی لە گریمانکارییە سەرەکییەکانی سووڕی ژیانی ئاوە لە سروشتداو نوێ کردنەوەی سەرچاوەی ئاوی شیرینی کیشوەرەکانە .

تیشکی کەهرۆموگناتیسی لەماوەی گۆڕینەوەی کاریگەری لەگەڵ ماددەدا بۆ وزەی گەرمی دەگۆڕێت، خۆر چاوگی لەرەلەرە کەهرۆموگناتیسییەکان بە هەموو شەپۆلەکانەوە لە (ئێکس) و سەر بنەوشەیی و تیشکی کەهرۆموگناتیسی ، لەکاتی کەوتنی شەپۆلی کەهرۆموگناتیسی بەسەرماددەدا ، بەشێکی دیاری کراوی هەڵدەمژێ، بەشێکی تری ماددەکە دەبڕێ ، ئەوەی ماوەتەوە دەیداتەوە ، هەموو تەنێ تیشکی خۆر وەردەگرێ و پلەی گەرمی زیاتر لە سفری سەدی بەرز دەبێتەوە ، لە شێوەی تیشکدەرەوە بە لەرەلەری درێژ گەرمی دەداتەوە .

بڕی گەرمی کە زەوی وەری دەگرێ لەخۆر لەنێوان (١,٨ — ٢,١) تاوزە سم$^2$/ لە خولەکێکدایە ، پێ ی دەوترێ تیشکاوەری خۆری نەگۆڕو گەرمی خۆر پشتی پێ دەبەستێت ، دیسان پشت بەو گۆشەیە دەبەستێ تیشکی خۆر لەو ماوەیەوە لە ڕوی زەوی دەدات ، پاشان پشت بە پاکژی و سامانی هەوا دەبەستێت ، تۆزو گەردی ماددی لە هەوا دەبڕێ بەشێك لە تیشك دەمژێت ، ڕووی زەوی بەشێ لە ڕوناکی لە خۆرەوە وەردەگرێ و بەشێکی بەرەو ئاسمان دەداتەوە ، وزە شاراوەکەی ڕووی زەوی گەرم دەکات ، ڕووی زەوی ڕوناکی لە خۆرەوە وەردەگرێ و گەرم دادێ . پلەی گەرمی ژینگەیی لەو چەند ڕێگایانەوە بەرز دەبێتەوە :

- به گەیاندنی گەرمی (وەکو گواستنەوەی گەرمی گەردەکانی خاك یان ئاو بۆ گەردەکانی هەواو بە پێچەوانەوەش).
- به تەوژمی گەرمی ڕاستەوخۆ .
- بەمژینی گەرمی (وەکو بەرگە هەوای زەوی کە تیشکە شەپۆل درێژەکانی بەرکەوتووی هەڵدەمژێ و هەڵیان دەگرێت).

ئەو بەشە تیشکەی زەوی دەیداتەوە بە (ئالبیدۆ) ناسراوە ، لەسەر ئۆقیانووسەکان (٥٪)و لەسەر ناوچە سەوزاییەکان (١٥٪)و لەسەر ڕووەك و بەرهەمی کشتوکاڵی (٢٠٪) و لەسەر بیابانەکان (٣٠٪) و لەسەر بەرگی بەفری (٨٥٪) ، تێکڕای (ئالبیدۆ) لەسەر زەوی (٤٠٪).

ئەو بڕە وزەیەی ژیانی زەوی بەرێکی لە خۆر وەردەگرێ بنەمای سەرەکی ڕۆشنە پێکهاتنە لە ڕووەکەکاندا ، وزەی خۆر لە رێگای بۆیە سەوزەکانەوە (کلۆرۆفیل-الاخضر) و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئاو بۆ ماددەی ئەندامی دەگۆڕێ ، دیسان ڕووەك لەو کردارەدا کاربۆن بەدەست دێنێ و بۆ ماددەی ئەندامی سەوز دەیگۆڕێت ، تیشکی خۆرو هێزی کێش کردن مەرجی سەرەکین بۆ سووڕی ئاو لەزەویدا[52]، وەکو لە سووڕی ئاودا باسکرا .

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات ﴿ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ ﴾ النبأ: ١٣ - ١٥ ، خۆر سەرچاوەی ڕوناکی و گەرمی و وزەیە ، سەرچاوەی سووڕی ئاوە لە سروشتە ، سەرچاوەی کرداری ڕۆشنەپێکهاتنە لە ڕووەکدا ، ئەگەر ئەو ڕووناکییە نەبوایە ژیان نەدەبوو ، کلۆرۆفیل کە قورئان بە (الاخضر) ناوی دەبات ڕوناکی سوور هەڵدەمژێ ، هەندێ قەوزەی دەریایی شەبەنگی تری خۆر هەڵدەمژن .

دواترین توێژینەوە پیشانی داوە هەناسەدانی ڕوناکی ( التنفس الضوئي- photo rotes pirating) بەڕوناکی شین زیاد دەکات ، وەکار دەکاتە سەر دروستکردنی پرۆتین و جوڵەی سایتۆ پلازمی.

---

[52] الانسان والبيئة / ت: عصام عبداللطيف.

گیانداران له زەویدا پلەی گەرمی زیاتر له (٦٠°)س بەرگه ناگرن ، کوللەی دەشتایی ئەو توانایەی هەیە ، پلەی گەرمی خاك له بیاباندا دەگاته (٦٠°)س و کانی گەرمی ئێ یە پلەی گەرمی (٨٥°)س پتره ، دیاره ئاو له (١٠٠°)س دا دەکوڵێت ، گەرمی کار دەکاته سەر گەشەی تۆو و کردنەوەی خونچەکان ، زۆربەی تۆوەکان له پلەی گەرمی (٢٥-٣٥°) س دا دەروێن ، بەڵام پاقلە پێویستی بە پلەی گەرمی پتر هەیه .

زۆربەی گیانداران بۆ بەرەو ڕووبونەوەی گەرمی ناوگونجاو چەند ڕێگایێ دەگرنە بەر ، زۆر لەوانەی خوێنیان دەگۆڕێ له پلەی گەرمی نزمدا زستانه تووشی سڕبوونی زستانی (السبات الشتوی) دەبن ، خشۆکەکان پلەی لەشیان بە هاتوچۆکردن بۆ بەر سێبەرو خۆر ڕێك دەخەن ، گیاندارانی بیابان ڕۆژانه له کونەکاندان و شەوانه چالاکی و پلەی گەرمی لەشیان نەگۆڕە ، چونکه بە ڕۆژ له کونەکاندا پەرە موچەو کوڵك و چینی چەوری ژێر پێستی باڵندە و شیردەرەکان ڕۆڵێکی گرنگی یان هەیە بۆ خۆ گونجاندن لەدژی گەرمیدا ، بەم شێوەیە بەرزو نزمی گەرمی لەو گیاندارانەی خوێنیان دەگۆڕێ زۆر کاریان تێ دەکات ، بەڵام ئەو گیاندارانەی خوێنیان نەگۆڕە بە بڕی هەناسەدان پلەی گەرمیان ڕێك دەخەن ، بڕوانه (علم البیئة ءمبادي/ بریج کوبال/ ل:١٧٤-١٧٥) .

قورئان لەو ئایەتەدا سەرنجمان بۆ لای ئەو ڕاستیانه ڕادەکێشێ و نمونه بە (سەگ) دێنێتەوە ، کەچۆن بۆ ڕێك خستنی پلەی گەرمی هەناسه بڕکێ دەکات ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ﴾ [illegible] .

() هەناسەبڕکێ یە ، زیاد له ڕاددەی سروشتی ، دیاره سەگ گلاندی ئارەقەی نیه ، بۆیه ئاو دەرنادات بەو ڕادەیە پلەی گەرمی پێستی ڕێك بخات ، بۆیه بۆ وەرگرتنی بڕە ئۆکسجینی پێویست دەمی دەکاتەوەو زمانی دەردەهێنێت ، بڕی ئاو و گەرمی لەو دۆخەدا ڕێك دەخات ، بەتایبەتی له گەرمایی زۆردا ، یان لەکاتی تینوێتی دا، یان

لەكاتی ماندوو بووندا ، یان نەخۆشی نەندامی و هەناسەدا ، یان لەكاتی وروژان و دڵخۆش بووندا ، بۆ زانستی پتر بڕوانە ( :د /الكـــريم القــرآن فــي الحيـــوان / النجــار زغلـول: ٢٤٤ – ٣٥٤).

**خاك ( التربه ) :**

قورئانی پیرۆز بەر لە زانستی جیۆلۆجی و ژینگەزانی لەدەیان ئایەتدا ئاماژەی بە خاك و قوڕ كردووە ، هەرجارەش دەیان موعجیزەی زانستی شاراوەی پەردە لەسەر هەڵماڵیوە ، كە زیاتر لە هەزار ساڵ دوای هاتنی قورئان زانستی ئەزمونی پەی پێ بـــردوون ، وەكـــو ﴿ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا ﴾ ، واتە : نمونەی وەكو بەردێكە خاكی بە سەرەوەیە ، بارانێكی بەرێژنە دا دەبارێتە سەری .

لێرەدا قورئان ئاماژە بە خاكی نیشتەنی دەكات بەسەر تاوێرەكانەوە (التربية أو البيئة – Residual or sedimentary soil) ، ئاماژە بە كرداری ڕوتانەوە (العريه) دەكات ، ئاماژە دەكات باران چونكە ماددەی ترشی تێدایە كاریگەری زۆرە لە تواندنەوەو ڕوتاندنەوەو ڕامالێندا.

أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ﴾ الكهف: ٣٧ ، واتە : باوەڕت بەو خوایە نییە لە خاك دروستی كردوویت؟

بێگومان لێرەدا پەیوەندی مرۆڤ بە خاكەوە دەخاتە ڕوو ، كە لە ڕێگای ڕووەك و ئاژەڵەوە ماددەكانی لێ وەردەگرێت بۆ خۆراك و دروست كردنی سپێرم و هێلكۆكە ، لەشی مرۆڤ لەو توخمانە پێك دێ كە لە خاكدا هەنە ، كاتێك مرد لەشی بۆ ئەو خاكە شی دەبێتەوە كە لێ ی دروست بووە .

وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴿٥﴾ ، واته : تۆ خاك دەبينى بێ ژيانە گەر ئەومان بارانده سەر خاكە لەرزى و جولأو هەلأمساو هەموو ڕووەكێكى ڕازاوەى ڕرواند.

لە (گۆڤارى : الوعي الاسلامي / عدد٢٨١) دا هاتووە : لە ساڵى ١٩٨٨دا كۆنگرەيەكى ئيعجازى زانستى لە ئيسلام ئاباد / پاكستان بەسترا ، (٣٠٠) زاناى جيهان لە هەموو بوارێكدا بەشدارييان تێدا كرد ، يەك لەو بابەتانە (تێكەلأو بوونى ئاو لە زەوى)دا بوو ، كە (د.قطب عامر على) لە كۆلێژى زانستى (اسيوط) خستيە ڕوو ، تێيدا ئاماژە بۆ ئەو ئيعجازييە زانستييە قورئانييە دەكات ﴿فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴿٥﴾ ، دەرى خست قورئان ئاماژە دەكات كاتێ باران دەبارێتە سەر خاك (اهتز) تەنۆلكەكانى خاك دەلەرێنێتەوە (وربت) پاشان خاكەكە هەڵدەاوسێ و دەكشێت ئەو تۆوەى لەناويدا سەوز دەبێت و چەكەرەى دەكات .

لەكاتى بارينـدا تەنۆلكەكانى خاك دەلەرێنەوەو دەلەرزن ، (اهتـز) ، چونكە بارگەى كارەباييان هەلگرتووە ، پێويستە ئەو بارگانە بەر لە ئارام گرتن هاوبارگە ببن ، بۆيە دەجولێن تا دەستى بەو شتانە بگات كارەباييەكەى هاوبارگە بكات ، قورئان ئەم وشەيە بە (اهتز) ناو دەبات ، هەرچى هەلأمسان و هەڵسانى خاكە كاتێ ڕوودەدات خاكەكە ئاوەكە هەڵدەمژێ ، بەمەش قەبارەى زياد دەكات ، قورئان ئەو قۆناغە بە (ربت) ئاماژە بۆ دەكات ، چەكەرە پەيدا دەكات بەو شێوەيە خاكە ئەو تۆوە دەروێنێت (انبتت) . ئەم قۆناغانە (لەرينەوە ، هەلأمسان ، ڕوان) بە تەواوى لەگەڵ ئەو كاتە زەمەنيانە دەگونجێ لەهەر كام لەم قۆناغانەدا ڕوودەدات ، ئەمەش ئيعجازێكى مەزنە قورئان بەر لە چەندان سەدە دەست پێشخەرى كردووە [٥٣] .

---

[٥٣] التربية الاسلامية /تموز / ١٩٨٨ / ل:٥٧- ٥٨/ بغداد.

﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ ﴾

لێرەدا قورئان ئاماژە دەكات خۆراك و میوە و سەوزە و دانەوێڵە و گژو گیاكان سەرچاوەیان ڕووەكە ، خودا لە خاكدا بارانی ناردوونە سەریان ، پاشان زەوی بۆ نەرم كردنەوەو شەقی كردووە تا تۆوەكان دوای گەشەكردن و چەكەرە دەركردن بتوانن لەو خاكە ڕەقەوە سەربێننە دەر بۆ پەیداكردنی بالأو لق و پۆپ و گەڵاو دەركردنی گوڵ و بەروبووم ، وە ئاو توێنەرەوەیە .

(بارسون) دەڵێ : ئاو شارەگی ژیانە ، بەزەویدا دەڕوات ، زۆربەی كرداره كیمیاوییە پێویستیەكانی ژیان و گەشە پێویستیان بە ئاوە ، یان سەردەكێشێ بۆ پێك هێنانی ئاو، ئاو زۆر ماددە دەتوێنێتەوە ، بەمەش زەمینە خۆش دەكات بۆ كارلێككردنی كیمیایی پێویست لەناو ڕووەكدا ، ئەو لەزۆربەی شوێنەكان زۆرە ، سووڕی ژیانی كە كۆمەكی زەوی و زیندەوەرانی دەكات بەردەوامەو نابڕێتەوە[٥٤].

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾ لە (لسان العرب)دا (سلالة ) بە مانای (پوختە) هاتووە ، بە مانای دەرهێنانی شتێ دێ لە شتێ وەكو ئادەم (علیه السلام) لە قوڕو نوتفە لە پشت ، (السلالة) بەمانای منداڵ و سپێرم و هێلكۆكە دێت ، بەكورتی خودا مرۆڤی لە توخمەكانی زەوی دروست كردووە .

(بریج كوبال) دەنووسێ : ( خاك چینەكی بەرزی توێكڵی زەوییە ، زۆربەی ڕووەكەكان تێیدا دەڕوێن و ئاو و خۆراكی لێ وەردەگرن ، دیسان خاك چاوگی سەرەكی ڕووەكی ئاوییە كە لە ڕەگ و ڕیشاڵی داپۆشراو و سەرئاو كەوتوو پێك دێت ، دووبارە خاك بۆ گیاندارانیش پێویستە ، چونكە گرۆیێ لە ژێریدا دەژین وەكو نیمارتۆ

---

[٥٤] الله یتجلی في عصر العلم / ل١٢٢.

(کرمانێکی دەزوولەیی فرە کۆڵکن و مێرووەکان و قرتێنەرەکان ... هتد) ، لەنزیکەوە پشکنینی خاك ئەوە دەردەخات لە ژمارەیێکی زۆر تەنۆلکەی کانزایی پێك دێ لە قەبارەدا لێکتر جیاوازن ، دیسان لە کەرستەی ئەندامی و زیندەوەری وردی وەکو بەکتریاو قەوزەو کەڕوو پێشەنگەکان پێك دێت ، ئەو خاکە لە ماوەیێکی درێژدا بەهۆی کاریگەری کرداری فیزیایی و کیمیایی و ژیانی لەتاوێری کانزایی پێك دێت[55] .

هەموو ئەو ڕاستییانە لەژێر ئایەتی﴿ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ ﴾ کورت دەبێتەوە ، واتە: ئەوەی لەژێر خاکدا هەیە هەمو سامان و موڵکی خودایە.

## ئەو خاکە لە چەند پارچەیێ پێك دێت و چەند توێیەکی هەیە :

(د.زغلول) لە کتێبی (الارض) داو (بریج کوبال) لە کتێبی (مبادي علم البيئة) دا خاك کە قورئان بە (الثرى) ناوی دەبات ، لە کتێبی (مجمع البحرين الطريحي) بە (التراب الندى) هاتووە دەیکەن بە سێ چینی سەرەکی یەوە ، (د.زغلول) دەڵێ : بەزۆری خاك دەبێ بە سێ بەشەوە :

١- ناوچەی سەر خاك (الثرى) ، لە هەمو ناوچەکانی تری خاك ڕووتاوەتەوە و شێدارترە ، لە ڕووی زەوییەوە تا کەڵەکەی تاوێری یان تا ئەو تاوێرەی نەڕووتاوەتەوە درێژ دەبێتەوە ، هەندێ پاشماوەی ئەندامی تێدا کۆ دەبێتەوە ، بەڵام وزەی ناو لەسەرەوە بۆ خوارەوە زۆر لە ناوەڕۆکی خۆراکی ڕووەکی لەدەست دەدات ، ئەستورایی چەند سەنتی مەترێ بۆ دەیان سەنتیمەتر دەبێت.

٢- ناوچەی ناوەڕاست و ژێر خاك (تحت الثرى) : لەخاکەوە درێژدەبێتەوە تا نزیکەی (لم) ، ناوچەیێکی مام ناوەندە لە ڕووتانەوەدا ، بەڵام جوڵەی ئاو ژێروەژوور

---

[55] مبادىء علم البيئة / ل : ١٩٤.

پێ ی دەگات ، بەزۆر پێکهاتەی کیمیایی گرنگی دەوڵەمەند دەکات ، کە لە خاکەوە پێ ی گەیشتووە ، بۆیە دەوڵەمەندترین کەرتی ژیانە لە هەموو بوارێکدا .

٣- ناوچەی تاوێری : دوو چینەکانی سەرەوە بەهۆی ڕوتانەوە ماددەکانیان لێ وەرگرتووە ، گەشەی ژیان لەژێر خاکدا ڕاستی یەکە لە سەردەمی دابەزینی قورئاندا مرۆڤ ئاشنای نەبووە ، تا چەند سەدەیێکیش دوای ئەوە ، ئاماژە بۆ کرانی لە قورئانی پیرۆزدا گەواهیدانە ، کە قورئان وشەی خوایە و موحەممەد (صلی الله علیة وسلم) پێغەمبەری خوایە ، بە سروش بۆی هاتووە [56].

(لسترجون زەومان) پسپۆڕ لە خاك و فسیۆلۆجیای ڕووەك لە ئەمریکادا دەنووسێ : تەواوی کەرستەکان لە توخمی کیمیایی پێك دێن ، توخمە سەرەکییەکانی گەشەی ڕووەك خاك و هەوایە ، ئەو خاکە لەکوێ هاتووە ؟ چۆن ئەو خۆراکانە هەڵدەگرێ کە ڕووەك پێویستی پێ دەبن؟

خاکی بەپیت لە کەرستەی کانزایی پێك دێت ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ماددەی ئەندامی لەسەرە لە بنەڕەتدا بۆ تەرمی ئاژەڵی و ڕووەکی دەگەڕێتەوە ، ئەو ماددە ئەندامیانە تووشی شی بوونەوە دەبن ، لەو کردارە ژیانی زۆر لە ڕووەك و گیاندارانی لێوە سەرهەڵدەدات ، لە سایەی ئەو توخمە کۆکراوانەو ئاو و هەوا کرداری زیندەگی لەناو تەنی زیندەوەراندا بەردەوام دەبێت ، ئەو خاکەی تەنیا لەکەرەستەی تاوێری و کانزایی شی بووەوە پێك دێ بە خاکێکی بەپیت دانانرێ و نابێتە زێڕی ڕووەکەکان ، خاکی بەپیت و بەرهەم هێنەر ئەو خاکە زیندەگییە ژمارەیێکی زۆر گیانداری وردی تێدا دەژی لە زیندەوەرو ڕووەك ، ڕێژەی ئەو زیندەوەرانەی لەو خاکە زیندووەدا دەژین دەگاتە (٢٠٪) ی ئەو ماددە زیندەگییەی تێی دایەتی.

---

[56] الارض في القران الكريم / د.زغلول محمد النجار / ل : ٥٢٧.

له یەك گرام خاكدا ژمارەی زیندەوەرانی ناوی دەگاتە بلیۆنەها زیندەوەر ، بۆیە خاك لـە هۆكارەكـانی هـەوایی پێـك دێ ، كـە كاردەكەنـە سـەر ڕەقـایی سـەر ڕووی زەوی ، سەرباری زیندەوەرانی ناوی و بەرهەمەكانیان بە درێژایی ڕۆژگار ، بەلآم چۆن و كەی ئەو كردارانە دەست بەكار دەبن ؟ لێرەدا ئەوەندە بەس نیە ، ئەو ڕوناكی و كەرەستە كیمیایی و ئاو و هەوا هەیە بۆ گەشەكردنی ڕووەكەكان ، لێـرەدا هێـزێ هەیـە لەناو تۆوەكـەدا لـە دەرفـەتی لـەباردا دەتـەقێ و بـەزۆر كـارلێككردنی ئـاڵۆز هەڵدەسـتێ و پێكەوە بە هاوڕێكییەكی سەیر هەڵدەسـتن ، تۆوەكە لەیـەك پـێ گرتنـی دوو خانـەی میكرۆسكۆبی پێك دێ ، هەركامێك لەوانە لە ژمارەییـەكی زۆر تـوخم و كـردار پێـك دێ ، دەبێتە ئەندامێكی نـوێ بـەرەو ژیـان ڕێگـا دەگرێتـە بـەرو بـەو ڕووەكە دەچـێ بەرهەمی هێناوە ، بەشێوەیێ دەنكە گەنم تەنیا دانكە گـەنم بەرهـەم دێنـێ و تـۆوی بەڕوو تەنیا دار بەڕوو بەرهەم دێنێت ، لەگـەڵ بـوونی وێـك چـوونی سیفاتی نێـوان جۆری ڕووەكەكان كەچی هەر سیفەتە خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە ، بەڕاستی ئەمە ڕژێمێكی سەیرو جوانە ، قەشـەنگی یەكـەی سـنووری نییـەو بـێ هاوتایـە ، هاوڕێكی یەكی سەیری هەیە ، ئەوە هەموو ئەو شتانەیە مرۆڤ ڕوو لە هەر كوێیـەكی جیهانی ڕووەكی سەیرو سەمەرە بكات دەبینێت[٥٧]. دەنووسـێ : تـا مـن زیـاتر لـە توێژینـەوەی سروشتی خاك و ڕووەك و ورد ببمەوە بڕوام بە خوا زیاتر دەبێت و بە سەرسوڕمان و پاكژ ڕاگرتنەوە كوڕنوشی بۆ دەبەم[٥٨] ، وە قورئان خاك بە (شار) ناودەبات چونكە پڕە لە زیندەوەر لەناخیدا دەژیێن : (والبلد الطیب...) (الاعراف ٥٨)

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : (وفي الارض قطع ...) (الرعد/٤) ، واتە : لەزەویدا چەند پارچە زەوییەكی هاوسێ هەیە لەگەڵ چەند باخچەی ترێ و ڕەزو كشتوكاڵ و خورما ، هەیانە درەختێ یان پتر لە بنەكەی دەڕوێ ، هەیە یـەك درەختـێ لـە بنـی دەڕوێ ،

---

[٥٧] الله یتجلی في عصر العلم/ ل: ١٢٢- ١٢٣.

[٥٨] الله یتجلی في عصر العلم / ل: ١٢٥.

بەیەك ئاو ئاودەدرێن ، هەندێ بەسەر هەندێکدا باشتری پێ دەدەین ، ئەمانە بەڵگەیێکن بۆ ئەوانەی تێ دەگەن و ئاوەزیان هەیە) ، بەو پێیە خاك یەکە ، یەك ئاویان هەیە ، یەك کرداری ڕۆشنە پێك هاتن ، کەچی لەجۆرو بەرهەم و تام و سوودا جیاوازن ، ئەمانەش بەڵگەی زانستین ، لەسەر بوون و تواناو زانستی کرداری مەزن بۆ زانایانی تەواو .

(دیل سوارتزق دروبر) پسپۆڕی فیزیای خاك لە ئەمەریکا دەنووسێ : خاك جیهانێکی پڕ لەسەمەرەیە ، ئەو شتە سەیرانەش بە زانست و توێژینەوە پەی بە ڕازەکانیان دەبرێت ، بۆیە دەمەوێ لێرەدا بە کورتی ئاماژە بە سیفەتەکانی خاك بکەین ، خوێنەر لەکاتی باسکردنی ئەو لایەن و زاراوە هونەرییانە ناتوانێ ئەوەندە بە ئاسانی لەگەڵ مندا بڕوات ، بەڵام داهاتوو دێتە سەر قسەی من ، کە جیهانی خاك پڕە لەسەیرو سەمەرە ، ئەو پەیوەندییە زۆرو ئاڵۆزەی نێوانیان سەرەنجی ڕادەکێشێ ، کە ناکرێ لە ڕێگای پلان کێشی و جوانکاری کردندا نەبێ هاتبێتە دی ، بێگومان داهاتوو خوێنەر بەرەو بیرکردنەوە لەداهێنەری مەزن دەبات .

سەیری خاك بکە چۆن بە هۆکاری ڕووتانەوە (التعریة) پەیدا دەبێت ، ئاکامی ئەو هۆکارانە دەبێتە چەند بەشێك : چینی پاشماوەی ژێرەوە بارستاییەکی پاشماوەی تری دەکەوێتە سەرەوە ، دوای ئەوە چینی خاك (الثری) دێت ، هەموو ئەو چینانەی باسکران بەهۆی وردوخاشی لە ڕێگای هۆکارەکانی ڕووتانەوە پەیدا دەبن ، خاك بۆ ئێمە سیفەتێکی گرنگی هەیە ، چونکە سەرچاوەی خۆراکە سەرەکی ییەکانە ، ڕووەك لەکاتی گەشەدا بەدەستیان دێنێ ، دیسان بۆ ڕاگرتن و قایم کردنی ڕووەك لەسەر زەویدا پێویستە.

قورئانی پیرۆزیش فەرموویەتی :﴿ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَـٰيِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ ﴾

واتە : (بژێویمان بۆ لەناو زەویدا داناون ، وە بۆ ئەو کەسانەی ئێوە ڕۆزییان نادەن ،

هەموو شتێ عەمبارەکەی لای خۆمانە بەبڕێکی زانراو دایئەبەزێنین ). لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات بەشێ لە خۆراك لەخاکدایە ، بەشێکی لە ئاسمانەوە بە بڕێکی ڕێـژەیی ڕەوانەی دەکەینە ناو خاك لە تیشك و گەرمی و باران و ترشی نترێت و توخمی تـر ، کە لەگەڵ باراندا دەبارن ، وەکو زانای نـاودار (دیـل سـوارتزق) دەڵێ : کـاتێ بـەردی ئاگرین تووشی شکان و هاڕان دەبن وردە وردە ئەو ماددە تفتانـەی (القواعـد) توانـای توانەوەیان هەیە لە ئاودا وەکو (کالسیۆم و مەگنیسیۆم و پۆتاسیۆم، ئۆکسید سیلیکۆن و ئەلەمنیۆم و ئاسن) دەمێننـەوە ، بەشـی هـەرە زۆریـان لـە خاکـدا پێـك دێـن ، ئـەو کرداره ڕێژەی فۆسـفۆڕ دانابـەزێنێ ، بـەڵکو ڕێـژەی هایـدرۆجین بـەرزتر دەکاتـەوە ، شیبوونەوەی توخمی سلیکاتی بنەڕەتی بەهۆی کردارەکانی خـاش بـوون بـەردە قـوڕ (الصلصل) دروست دەکات ، ئەو قوڕە لەناوچە فێنك و ساردەکانـدا هەیـە ، ڕێـژەیێکی زۆری سلیکاتی ناکریستاڵی ( نا بلووری) و ماددەی تـر جگـە لـەوی بەڕێـژەیێکی کـەم تێدایـە ، بـەڵام لەناوچـەکانی هێڵـی یەکسـاندا ڕێـژەی ئۆکسـیدە بـەڕەڵاکانی ئـاوی و ئەلـەمنیۆنی زۆری هـەڵگرتووە ، خاسـیەتێکی گرنگـی بـەردە قـوڕین ئەوەیـە توانـای ئـاڵوگۆڕی ئـایۆن و موجەبـەکانی هەیـە ، ئـەو سـیفەتە توانـای دەداتـێ ئـەو تفتانـە (القواعد) ی توانای شی بونەوەیان هەیەو بۆ گەشەی ڕووەك بەسوودن ، دەستی پێوە بگرێت ، ئەوەش دەبێتە هۆی دانەبەزینی ئەو کەرەستانە لە خاکداو نـەبڕانیان ، لـە لایەکی ترەوە دەبینین کرداری خاش بوون دەبێتە هـۆی لەدەسـت دانـی هەنـدێ لـەو تفتانـەی دەتوێنـەوە ، لەهـەمان کاتـدا ڕێگـای تـر دەگرێتـە بـەر بـۆ پاراسـتنی ئـەو کەرستانە[59] .

دەنووسێ : زۆر کەس پێیان وایە بروسکە تـەنیا ئـامێرێکی وێرانکـەرە ، کەچـی ئـەو شـۆرتە کارەبایـە ئۆکسیدەکانی نـایترۆجین پەیـدا دەکـات ، لەگـەڵ بـاران و بـەفردا دادەبەزێتە ناو خاك و سوودی لێ دەبینێت ، بڕی ئەو نایترۆجینەی بەو ڕەنگە خـاك

---

[59] الله یتجلی فی عصرالعلم / ل: ١١٧- ١٢٠ بەکورت کردنەوە.

سوودی لێ دەبینێ لە شێوەی نتراتدا ساڵانە بۆ (١) دۆنم زەوی (٥) ریتلە ، کە نزیکەی (٣٠) ریتڵ نیتراتی سۆدیۆمە ، ئەوەندە برەش بۆ گەشەی ڕووەک تەواوە[٦٠].

دەڵێ : گومانی تێدا نیە لەدوای هەمووشتێکەوە لە ئاسمان و زەوی ژێرماندا کارزانی و پلانێکی بەدواومیە ، نکۆڵی کردن لە پلان کێش و داهێنەری مەزن لەبێ عەقڵی و ناڵۆژیکیدا وەك ئەو کەسەی وایە باخچەیێکی جوان و پڕ لە گوڵە گەنمی جوان دەبینێ ، پاشان لە هەمان کاتدا نکۆڵی لە بوونی ئەو جوتیارەی دەکات کە چاندوویەتی لەو خانوەدایە لەتەك کێڵگەکەدا بەرزی کردۆتەوە[٦١].

﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾ ، واتە : بێگومان خودایە لەتکەری دانك و ناوکەکەیەتی ، زیندوو لە مردوو دەردێنێ و دەرهێنەری مردووە لە زیندوو . بێگومان خوداوەند لە توانای دایە ناوك بروێنێ لە تۆوەکانداو ماددەی نازیندە بگۆڕێ بە زیندەو ماددەی زیندە بە ماددەی نازیندە بگۆڕێت.

ئاو ($H_2O$) :

﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ ، واتە : هەموو شتێکی زیندومان لەئاودا دروست کردووە .

﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ﴾ ، واتە : سەیری شوێنەواری خوا بکە چۆن زەوی دوای مردنی زیندو دەکاتەوە .

---

٦٠هەمان سەرچاوە / ل: ١١٧–١٢٠ بەکورت کردنەوە

٦١هەمان سەرچاوە / ل: ١١٧–١٢٠ بەکرت کردنەوە

لێرەدا قورئـان دەری دەخـات ئـاو یەکـەی سـەرەکی ژیـانی خانەیـەو خـودا لـە ڕێگـای بارانەوە بۆ مرۆڤ و گیانداران و ڕووەکی ئاسان کردووە .

(بـریج کوبـال) دەڵـێ : ئـاو گـرنگترین هۆکـاری ژیـانی زینـدەوەرە ، چـونکە مـاددەی سەرەکی یە لە پێك هێنـانی پرۆتـۆپلازم (الجبلـة) دا ، ئـاو لەشـێوەی بـاران و بـەفرو شەونم و خوناودا بۆ زیندەوەر ئاسان کراوە .

سـەرجەمی بـڕی بـاران و کەژەکـەی بـۆ بـارین لەجیهانـدا لێـك جیـاوازە ، ئەمـەش جیاوازی دابەش بوونی گیاندارانی لەڕوویەکی ساکاردا دابەش کردووە ، بڕێکی زۆری ئاو بەهۆی بوونە هەڵم و دزەکردنی بۆ ناو خاك لەدەست دەڕوات ، بڕە ئاوی ناو خاك و بڕە هەڵمی ئاسمان گرنگییەکی زۆری بۆ زیندەوەر هەیە ، بڕە هەڵمی ناو کەش بـە شێ ی ڕەها (الرطوبة المطلقة) ناسراوە ... هەرچەندە زۆر لە ڕووەکەکان ناتوانن سـود لە شـێداری هـەوا وەربگـرن ، بـەڵام ژمـارەیێ لـە قـەوزە و حەزازییـەکان (گڵـەوەز) و کەرەوزە کێویلەو .

پەردەییەکان (الخشارات الغشائية) و هەندێ جۆر ئۆرکید لەسەر ڕووی ڕووەك دەژیـن دەتوانن ڕاستەوخۆ شێ لەهـەواوە وەربگـرن ، هەنـدێ قالۆچـە (الخنفسـاء) لـەڕووی لەشیانەوە دەتوانن شێ بمژن ، هەرچی ڕووەکەکانی ترن ، جگە لەو ڕووەکانەی ئـاوی و داپۆشراون ، ئاو لە ڕێگای ڕەگەکانیان هەڵدەمژن ، گیانداران ئاو دەخۆنەوە ، دیسان ئـاو لـە خـۆراك وەردەگـرن ، لـە زۆربـەی دۆخـدا گیانـداران ئـاوی میتـاپۆلیزم (المـاء الایضی) بەکاردێنن.

ئاو کاریگەری ڕاستەوخۆ لە زیندە چالاکییەکان دەکات ، کار لە ڕۆشـنە پێـك هـاتن و هەناسەو مژینی کەرستەی خۆراکی و هەندێ کرداری میتاپۆلیزمی تـر دەکـات ، بـەو بڕە ئاوەی بۆ ڕووەکەکە دەڕەخسێت ، بڕە شێیەکی کەم بەهۆی ئارەقەکردن بە پەلـە دەردەچـێ و کاردەکاتـە سـەر گەشـە ، ڕوانـی تـۆو ئـارامگرتنی و چـەکەرە (البـادرة) ڕاستەوخۆ ئاوکاری تێ دەکات ، ئاو بۆ پیتاندنی ڕووەکە نزمەکان پێویستە ، بەڵام لە

ڕووەکە باڵاکاندا متوربەکردن و بڵاوبونەوە ، لە چەند بارێکدا ئاو کاریان تێ دەکات ، پەیوەندی ئاو و پلەی گەرمی ڕۆڵی گەورە دەبینێ لە پێك هێنانی پەردەی ڕووەکی هەر ناوچەیەك ، گەشەو زۆر بوونی گیاندارانیش هەر بە ئاوە ، زۆربەی گیاندارە نزمەکان لە ئاستێکی بەرزی شێ دا دەمردەکەون ، زۆر لە جاڵجاڵۆکە لە دارستاندا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ یان بەڕێژەی شێوە هەیە ، زۆر لە کرمە ئاڵقەییەکان و مێرووە و فرە پێ دارەکان و پێ یە یەکسانەکان و کرمە دەزولەیی یەکان لە شێی (١٠٠٪) دا نەبێ ناژین ، شێ ی خاك ڕاستەوخۆ کار لە زۆربوونی زۆرێ لە مێرووەکان و مۆرانە (العث) دەکات .

شێی خاك کار لە زۆربوونی کوللەو گەشەی هێلکە بۆ هەراش بوون دەکات ، مێشولەکان گەر شێ کەم بێ بەرگەی گەرمی زۆر ناگرن ، مشەخۆری مەلاریا گەر پلەی گەرمی لە (١٥,٥°)س و ڕێژەی شێ (٦٥٪) کەمتر بێ ناتوانێ بگوازێتەوە ، ژمارەیێ لە مێرووەکان و کرمە دەزولەییەکان دەتوانن بەرهەڵستی وشکایی زۆر بگرن ، شایانی باسە ڕەنگی گیانداران شێ کاری تێ دەکات[٦٢] .

گەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین ئاماژە بە گرنگی شێی هەواو ئاوی ناو خاك کردووە ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ ﴾ واتە : ئاومان لە ئاسمانەوە بەڕێژە باراندووە لەناو زەوی دا دامان ناوە .

قورئان ئامازە بە تەڕو وشکی دەکات و دەفەرمووێ ﴿ وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ (٥٩) ﴾ ، واتە : دەنکە دانەوێڵەییەك لە تاریکییەکانی زەوی داو تەڕو وشك لە کتێبەکی ئاشکرادایە .

---

[٦٢] مبادیء علم البيئة / ل: ١٨٥ – ١٨٧ سەیر بکە.

لێرەدا قورئان ئاماژە دەكات لە تاریكایی زەویدان ، خودا ئاوا باران و تیشكیان بۆ دەنێرێت و خۆراكیان پێ دەدات ، پاشان ئاماژە بە شێ و وشكی دەكات لە ژیانی ڕووەكدا ، بۆیە دوای تۆو باس لە شێ و وشكی دەكات (شێ و وشكی هەواو خاك) تەنەكان یان شێ دارن یان وشكن و خودا هەموو شتەكانی لەو دوو وشەیەدا كۆكردۆتەوە .

پاشان (بریج كوبال) دەنووسێ : ئەو گیاندارانەی لە ئاودا دەژین پێویستییەكی پتریان بە ئاو و شێ یەو بەرگەی وشكی زۆر ناگرن و زۆر بمێننەوە ، ئەو ڕووەك و گیاندارانە بە ڕووەكی بیابانی (الصحراوية) و گیاندارانی بیابانی دەناسرێن .

ئەو ڕووەك و گیاندارانەی پێویستی یان بە برە ئاوێكی مام ناوەند هەیە بە ڕووەك و گیانداری فێنكی یەكان (المعتدلة) دەناسرێن ، ئەو ڕووەكانەی ئاوین بە تەواوی یان هەندێكیان لەناودا نقومە ، لەبن ئاودا ڕواوە یان بە ئاو داگیرساوەتەوە ، یان بەسەرئاودا بە ئازادی دەڕوات [63].

بێگومان ڕووەكی ناوچە وشكەكان لەكاتی نەبوونی ئاودا ، یان بەرزی پلەی گەرمی دا بەرگەی دەگرن و خۆیان لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا دەگونجێنن ، ئەو درەختانە یان داری گەورەن ، یان ڕووەكی بچوكن یان پوش و پەلاشن ، گیاندارانی ناوچە وشكەكانیش توانای پاراستنی شێ یان هەیە ، شەوانە لەسەر خاك و ڕووەك شێ دەمژن توانایان هەیە لە هێلكەوە ببنە گیاندار﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ ﴾

خوداوەند سەرنجمان بۆ وشتر ڕادەكێشێ سەیری بكەین چۆن خودا بە شێوەیێ دروستی كردووە لەگەڵ بیاباندا توانای خۆ گونجاندنی هەبێ و بەرگەی برسێتی و تینوێتی و ڕەشەبای بیابان و لمی بیابان بگرێ و توانای ڕۆیشتنی هەبێت ، بۆ نمونە

---

[63] مبادیء علم البيئة ل : ١٨٥- ١٨٧ سەير بكە

وشتر مانگێك بەرگەی برسێتی دەگرێ و دوو هەفتە بەرگەی تێنوێتی دەگرێ ، سوود لەو كۆپارەی دا كۆی كردۆتەوە و سوود لەو ئاوە وەردەگرێ بە زیندە پاڵ دوای ئۆكساندنی خۆراك لە لەشدا پەیدا دەبێت ، دەستیش دەگرێ بەو برە ئاوەی لە لیمف و شانەكانی لەشی دایە ، بەشێوەیێ پارێزگاری دەكات بەشی زۆرترین ماوەی بكات بۆ هاتوچۆی بیابان بە ویستی خوا لە كتێبی (گیاندارزانی) دا باسی دەكەین ، ئەو شێوەیە خاك و ئاو دوو بنەمای گرنگی ژیانن و لەشی مرۆڤ و گیانداران و ڕووەكی لێ پێك هاتووە ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَىۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ ﴿٧﴾ ﴾
واتە : دروست كردنی مرۆڤ لە قوڕ دەستی پێ كردووە ، (قوڕ = خاك + ئاو).

وەك (ام هولی) باسی كردووە ، خاك لە ڕووی فیزیاوییەوە سیستەمێكی بلاّوە لە سێ قۆناغدا : (ڕەق ، شل ، گازی) دەنوسێ : خاك هۆكارێكە بۆ بەرهەم هێنان ، چونكە جێگای ڕووەكە و دەبێتە سەرچاوە بۆ (ئۆكسجین و خواردن و سوتەمەنی خاو و كار كەر لە ئاو و هەوا. ئاو لە خاكدا لە سەرووی ئاستی ئاوی ژێر زەوییەوە بڕەكەی (٢/١)ی ئەو ئاوەیە لەحەوزە سروشتی یەكان دا كۆدەبێتەوە ، بڕی ئاومرۆییەكان نیوەی ئەو بڕەیە لەلایەكی تردا.

قورئان فەرموویەتی ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِى خَلَقَكُمۡ وَٱلۡجِبِلَّةَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ ﴾
(الجبلة) بریتی یە لە (پرۆتۆپلازم) كە ئاو ڕێژەیێكی گەورە پێك دێنێ لەخانەی زیندوودا ، لە خانەی ڕووەكدا ڕێژەی ئاو (٩٠٪)و لەهەندێ ڕووەكی نیمچە وشكدا (٥٪) و لەلەشی گیاندارانــدا (٧٠٪ - ٨٠٪) یە [٦٤] ، خودا فەرموویەتی ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَىۡءٍ حَىٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

[٦٤] الانسان والبيئة.

ئاو وەکو (أم . هولى) باسی کردووە مرۆڤ لە زۆر بواردا سوودی لێ دەبینێ :

١- بۆ پێویستی جەستەیی و پێویستی کرداری .
٢- بۆ بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی و پیشەسازی .
٣- بۆ گەرماو کردن و وەرزشی تەندروستی .
٤- بۆ گۆڕین و پاڵپشتی کردنی تواناکانی وزە .
٥- بۆ گواستنەوە ڕوباری دەفەری و دەریای دەرەکی[٦٥] .

دەنووسێ : پێویستی بە ئاو پشت بەکەش و جۆری بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی باو دەبەستێ ، ئینجا ئاستی چڕی بەرهەمەکە ، گرنگترین پێویستی ئاو بۆ ئاودانە ، ئێستاکە نزیکەی (٢٠٠) ملیۆن هەکتار زەوی لە جیهاندا ئاو دەدرێ ، وە (٥٠٠) ملیۆن هەکتار لەبارە بۆ کشتوکاڵ کردن[٦٦] .

ئاو هەر جێگای ئاو پڕناکاتەوە لەلەشدا ، بەڵکو توخمی تریش وەکو خۆراك بۆ مرۆڤ دابین دەکات ، هیچ شتێ بۆ پاکژی شوێنی ئاو ناگرێتەوە ، بۆ چاك بوونەوە لە نەخۆشی و بەهێز بوونەوە بەسوودە ، ئاو بۆ شوشتن و خاوێن کردنەوەو لابردنی پیسی گرنگە ، ئەنجا بۆ گەرم کردنەوەو هەوا گۆڕکێ و شتی تر ، ئاو بۆ مەلەوانی و وەرزشی و پشوودان بەسوودە ، لەشی مرۆڤ لە ڕووی تەندروستی یەوە ساغ دەکات ، توانای ماسولکەیی و هزری بۆ دەگێڕێتەوە ، سەلماوە گەرماو و مەلەکردن و وەرزشی ئاوی گرنگترین هۆکارن بۆ چاك کردنی تەندروستی مرۆڤ و پەرەپێدانی ڕێکی لەش و هێزی هزری بە تەواوی ...[٦٧] .

---

[٦٥] الانسان والبيئة / ل:٥٦ سەیر بکە.

[٦٦] هەمان سەرچاوە / ل : ٥٧.

[٦٧] هەمان سەرچاوە/ ل: ٥٥ بە کورت کردنەوە.

بێگومان ئیسلام پاکژی بەنیوەی بڕوا دەزانێ ، غوسل و دەست نوێژی واجب کردووە ، پاشان تارەتی واجب کردووە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ ﴾ المائدة

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : (علموا ابناءكم السباحة والرماية)(رواه الفردوسي / اسناده حسن. واتە : منداڵەکانتان فێری مەلەوانی و تیر هاویشتن بکەن. (الطهور شطر الايمان) (رواه المسلم والترمذي / صحيح). واتە : پاکژی نیوەی بڕوایە . ئاو (٩٠٪)ی میکرۆب لادەبات لەکاتی دەست شوشتن و شوشتنی شتی تردا، وەك ڕێکخراوەکانی جیهانیی ئاماژەی پێ کردووە[٦٨] .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان بە شوشتنی دەست دەکات پێش و پاش نان خواردن ! (بركة الطعام الوضوء قبله وبعده) رواه ابو داود والترمذي.

خوا فەرمان بە پاکژی جل و بەرگ دەکات ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤﴾ المدثر ٤ دیارە دژوێنی لەش و بەرگ پیسی دەبێتە هۆی پەستی و دروست بوونی ئەسپێ و کێچ و میکرۆب ، کە نەخۆشی جۆراو جۆر دروست دەکەن .

پێغەمبەر (ﷺ) داوا دەکات ماڵ و مزگەوت و ڕێگاو بان و کۆڵان پاکژ ڕابگرین و نەیانکەینە مۆڵگەی زبڵ و پیسایی : (البصاق في المسجد خطيئة وكفارتها دفنها) متفق عليه ، واتە : تف لە مزگەوت فڕێ دان تاوانە کەفارەتی شاردنەوەیەتی .

(فنظفوا افنيتكم وساحاتكم) رواه البزار. واتە : ناو ماڵەکانتان و گۆڕەپانەکانتان و دەرەوەتان پاکژ بکەنەوە .

---

[٦٨] الطب الوقائي في الاسلام / عمر محمود عبدالله.

(تميط الاذى عن الطريق صدقة) متفق عليه. واته: لابردنى ئازار لەسەڕێگا خێره .

ومكو (د. عبدالحسين بيرم) لة (في صحة المجتمع) داو (د.عمر عبدالله) لة (الطب الوقائى في الاسلام)دا باسيان كردووه ، كۆكردنەوەی زبڵ و پيسايی لەسەر گۆفەك دەبێتە هۆی زۆربوونی مێرو و مێش و زۆربوونيان ، زۆر نەخۆشی دەگوازنەوە ، وەكو (تەراخوما ، چاويەشە ، ئاوەڵە ، سورێژە ، سورێژەی ئەڵمانی ، سيل ، تيفۆئيدو ، پاراتيفوئيدو زەحيری ئەميبی و باسيلی و هەوی وڕيخۆڵەو ژەهراوی بوون و ڕەشەتاو كولێراو ...هتد .

پاشان پيس بوونی ئاوی خواردنەوە / يان پيس بوونی خۆراك و هەموو ئەو نەخۆشيانەی باسكران تووشی مرۆڤ دەكەن ، بۆيە ئيسلام پاكژی بە نيوەی بڕوا دادەنێت، سەرچاوەی پاكژيش بە ئاوی پاكژە .

(كنيب) باسی كردووه : ئاو توانای شی كردنەوەی ئەو ميكرۆبانەی هەيە تێكەڵی خوێن دەبن ، ميكرۆبەكان لە كۆئەندامەكە دور دەخاتەوە ، خوێن پاكژ دەكاتەوە ، جەستەی لاواز بە توانا دەكاتەوە .

(اميل خليل بيدس / كن طبيب نفسك ل٩٣) سەير بكە ، بە ويستی خوا لە بەشی (الطب الوقائی-ئيعجازی ثزيشكی ئاراستن) بەتێرو تەسەلی ئەم بابەتە ڕوون دەكەينەوە [69].

## بەرگە هەوا:

﴿ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ ﴾ ، واته : دروستمان كردووه لەسەرتان حەوت چينی بەهێز.

---

[69] بروانه (في صحة المجتمع/د:عبدالحسين بيرم) و (الطب الوقائى في الاسلام) العميد الصيدلى ، د: عمر عبدالله) وكن طبيب نفسک / ت:اميل خليل بيرس.

﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ﴾ ، واتـه : سـەرەوەی زەویمـان کردۆتە سەقفێکی پارێزراو.

حەوت چینەکان یەکێ لە مەبەستەکانی حەوت چینەکانی بەرگە هەوایە ، کە دەوری زەوی داوە ، ئەو سەقفە پارێزە چینی ئۆزۆنـە لـە چـینی (ئـایۆن سـفیر) دا پـارێز لـە زەوی دەکات ، لەوانە بەرایی لە تیشکی سەر بنەوشەیی دەگرێت.

قورئان ئاماژە بە (سنترابوسفیر – چینی کەش و هەوا) دەکات :

﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) ئاسمان (بەرگـە هـەوا) بـە شـەپۆل نـاودەبـات : (هـذا مـوج مكفـوف عنكم) ابن ابي حاتم.

گەر بڕوانینە کتێبی (الانواء الجوية / د. فياض النجم و د.حميد مجول/ ل:٢٢) و (الموسوعة الذهبية/ د.احمد مصطفى المتولى/ ل:٢٠) بـاس لـە (٧) چـینی هـەوایی دەکات کە دەوری زەوییان داوە وەکو حەوت بـەرگ ، یـان حـەوت چـین ، یـان حـەوت توێکڵ و دەبنـە (٧) ئاسمـان بـۆ زەوی ﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ ﴾

:

١. چینی تروپۆسفیر (Troposphere) یان چینی ئـاو و هـەواو کـەش ، (١٠) (١٢) کم بەرزە ، لـە هێڵی یەکساندا دەگاتـە (١٦)کـم ، لـە ٩٠٪ی بارسـتایی هـەوا پێـك دێنێت ، (٤×١٠ $^{15}$) تەنە.

٢. دوو چـینن بـەناوی ترۆپـۆس ی بنـەڕەتی (تروپـوزی)ی دووەم (١٦-٨٠) کـم ، لـە کتێبـی (الانسـان والبيئـة)دا ، تـا بـەرز بینـەوە پلـەی گـەرمی بـەرز دەبێتـەوە و دەگاتە (٥٦-٦٥°)س ، بە هەر دوو چین دەگوترێ (ستراتوسفیر).

٣. میزوسفیر : (٨٠-٨٥)کم بەرزە .

٤. پرمۆسفیر : (٩٠) کم بەرزە .

٥. ئایۆنسفیر : (٥٠٠)کم بەرز دەبێتەوە چالاکی ئۆزۆنی تێدا ڕوودەدات ، قورئان بە (السقف المحفوظ) ناوی دەبات ، لەو چینەدا هەوا ئایۆن دەبێت.

(د.فیاض النجم) دەنووسێ (لەمیزوسفیر)دا لەبەرزی (٨٠)کم دا پلەی گەرمی تا (°٩٠)س دا دەبەزێ ، لەو چینەدا هەوری شەوانەو ئایۆنات (+O٢ - NO) و هێشوی ئاوی ئایۆنی (H٢O) + (H٢O) هەیە شەپۆلی بێ تەلی درێ دەگرێتەوە ، ئەو چینە شەو لاواز دەبێ و بە ڕۆژ بەهێز دەبێ و شوهبێ تێدا دەسووتێت ، لە سەروی (٩٠)کم پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوە بە چینی گەرمی (پرموسفیر) دەناسرێت ، شەفەقی جەمسەری و بریقەی لەوێدا ڕوودەدات .

قورئان بەو چینەی شوهبەکان دەسووتێنێ و شەپۆلی بێ تەل دەداتەوە و دەفەرمووێ ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴿١١﴾ ﴾ [illegible] ، واتە : سوێند بە ئاسمانی گێڕەوە ، کە هەڵمی ئاو بەشێوەی باران و شەپۆلی بێ تەل و زۆرشتی دەگێڕێتەوە .

٦. چینی (ئیکسوسفیر) (٨٠٠-٣٥٠٠٠) کم بەرزە ، لەو چینەوە سنووری گواستنەوە بەرەو بواری گەردوونی دەست پێ دەکات ، بێگومان هەوا بۆ مرۆڤ و گیانداران و ڕووەك ئێکسیری ژیانە بۆ هەناسەدان ، لەوانە ئۆکسجین ، کەکرداری ماددی و بایۆلۆجی دەوام پێ دەدات ، مرۆڤ ڕۆژانە (١٥) گرام ئۆکسجین بەکاردێنێت . لە سووڕی ئۆکجسین لە هەوادا زۆر شتی تر باسکراوە ، هەروەها باسی کاربۆن و نایترۆجین و گازی تر کراوە ، بۆیە زیاتر باسی ناکەین ، دیسان هەوا لەلایەن مرۆڤەوە بۆ گواستنەوەی هەوایی و ساردکردنەوە بەکاردێت.

## سامانی کانزایی:

﴿ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارًا ﴾ ، واته : خوا ئەو خوایەیە لەداری سەوز ئاگری بۆ داناون .

دارو تەختە بۆ سووتەمەنی و خەڵوزو پیشەسازی سوودیان لێ وەردەگیرێت ، بەپێ ی رێکخراوی ولاتە یەکگرتووەکان بەشی خۆراك و کشتوکاڵ هەر لە ساڵی (١٩٦١) وە بەکارهێنانی تەختە وەکو سووتەمەنی گەیشتۆتە (١٠٠)ملیۆن م$^3$ و (١٠٠٠) ملیۆن م$^3$ بۆ پیشەسازی و (٢٠٠) ملیۆن م$^3$ بۆ مەبەستی نا بەرهەمی[٧٠].

قورئانی مەزن باس لە دوو چەرخ دەکات ، کە وەکو چەرخی نوێ زانستی فیزیایی و میتافیزیکی تێدایە گەیشتۆتە چڵە پۆپەو لە مەیدانی پراکتیکی دا دەوری بینیوە ، چەرخی داوود و سولەیمان و چەرخی زولقەرنەین. بۆ نمونە قورئان فەرموویەتی

﴿ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعۡمَلۡ سَٰبِغَٰتٖ وَقَدِّرۡ فِي ٱلسَّرۡدِۖ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ ﴾ سبأ: ١٠ ، (واتە : ئاسنمان بۆ(داود) نەرم کردەوە) ئاسن گەرم کردنەوە یان بە کورەی ئاگر (مووشەدەمە) بووە ، یان وزەی گیانی (هالەی موگناتیسی) بەهۆی سایکۆکینیزیاوە بووە، (نورمان فنست بیل) دەڵێ : (ئێوە فێری نوێژ ببن بەرێگایەکی دروست ، خۆتان لەنوێژی بێ ئاگا بپارێزن.

ئێوە وزەو توانایەکتان تێدایە دەتوانێ شاری نیورك ئاگربدات و بیتەقێنێتەوە بیکاتە خۆڵەمێش ، فیزیای پێشکەوتوو ئەوەمان پێ دەڵێ[٧١]. (انایـد هوفمـان) دەڵێ : (سایکۆکینیزیا – psycho kinesis) : کارکردن و جولاندنی تەنەکان لەدوورەوە

---

[٧٠] الانسان والبيئة / ل:٦٩.

[٧١] حروب العقل . رونالدم . ماكري / ل:١٣٠.

بەهۆی وەزی هـزری ، کەمی ڕووانـی ئـەو دیاردەیـە بـۆ بـڕوا نـەبوونی خـەڵکی دەگەڕێتەوە ، کە جوڵاندنی شتەکان بە وزەی هـزری ڕێکی نەچووە ، کەچی لێرەدا (یوری گیلەر) هەیە ناو بانگێکی گەورەی پەیدا کرد ، لەتوانای دا بوو بە وزە شتەکان بجوڵێنێ ، لەبەردەم ملیۆنان کەس کانزاکان نەرم و خوار بکات و بۆ خەڵکی ئەو توانا هزرییە بسەلمێنێت[72].

بێگومـان پێغەمبـەر (ﷺ) و ئـەولیاکان بـەو هێـزە کـاری ناناسـییان بـۆ لـواوە ، پێغەمبـەران ڕەوانـەکراوانی خـوایی وەکو مـوعجیزە بـەو هێـزە کـاری موعجیزەیـان نوانـدووە ، بـۆ نمونـە بـاس لەدەسـتی ڕونـاکی دەکـات لـە موسـادا (علیـە السـلام) ﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ پێشەوا (علی) لە بارەی ئەو هێـزە فەرموویـەتی : (والله مـا قلعـت بـاب خيـبر بقـوة جسـدانية ولكـن قلعـت بقـوة ملكوتية ونفس بنور ربها مضيئة)[73] ، خوا دەربارەی ئەو وزەیە فەرموویەتی ﴿ يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم ﴾ ، زانـای گـەورە (عمـاد الـدين خليـل) دەنوسـێ ﴿ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ ﴾ .

لێرەدا بەخزمـەت دووبەنـدەی هەڵبـژاردەی خـوا دەگـەین داودو سـولەیمان (علیهمـا السلام) خوا هێزی بێ شوماری سروشتی بۆ خستبوونەژێر ڕکێف ، دیسان وزە غەیبی و نادیارەکان دور لە زەمەن و شوێن ، تا لەژێر فەرمانی مرۆڤدا کار بکەن ، مرۆڤی بەرپرسیار لە (ئەسپ و باڵندەو ئاسن و باو نەوت (القطر) کە لـە چـەند پانتاییـەکی

---

[72] تطوير المهارات النفسية / انايد هو فمان / ل:١٤٦.

[73] تفسير ابن عربي/ ج١ /ل:٣٠٧.

کاری تـەکنیکی پراکتیکی دا ئامازەیان بـۆ کـراوە ، پیشەسازی و ئـاوەدان کردنـەوەو دروست کردنی باڵەخانە و هونەرو شێوەکاری[٧٤] .

کەواتە : هەموو بوونـەوەر ڕام کـراوی مرۆڤـەو لەخزمـەت ئـەو دایـە ، مـادام توانـای زانستی و هزری و گیانی تێدابێ .. ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ ﴾

(ام هـولی) دەنووسێ : سـامانی کـانزایی مـەرجی سـەرەکی پێشکەوتنی تەکنـەلۆژیای مرۆڤە ، سامانی کانزایی لە چەند سامانێکی کانزایی خاوی دیاری کراو پێك دێ ، بە قەبارەو شوێنی دۆزینەوە ، دابەش دەکرێ بۆ : (کـانزایی ، ناکـانزایی ، سـووتەمەنی بەردین) هەرچی کانزاییەکانـە دەتـوانرێ چـەند جارێ لەپیشەسـازی جـۆراو جـۆردا دووبارە بەکاربێتەوە ، بەڵام نا کانزاکان و سوتەمەنی بەردین یەك جار لـە مـەیدانی تەکنـەلۆجی دا بـەکاردێنرێن، هەنـدێ لـە کەرەسـتە خاوەکـان یـەدەگیان زۆرە وەکـو کانزاکان و پەترۆڵ و دەیانساڵ سوودیان لێ دەبینرێت.

لەکاتی دەرهێنانی نەوتدا یان سەرچاوە خاوەکاندا ماوەیێ دەخایەنێ ، بەڵام لەسەر حیسابی وێران بوونی ژینگە تەواو دەبێ ، وەکو دەرهێنانی نەوت لە دەریاکان ، بـەکارهێنانی کەرەسـتە خاوەکـان بـۆ بەرهـەم هێنـان و بـەکاربردن پاشـەڕۆکی زۆر پەیدا دەکات تەنیا سوود لە برێکی کەمیان دەبیندرێ ، پاشەڕۆکەکە لەکۆگای گشتیدا یان لەژێر ئۆقیانووسـدا دادەنـرێ ، یـان دەسـووتێنرێ ژینگـە پـیس دەکـەن ، زۆر لـە ناکانزاکـان لـەژێر زەوی دەردێنـرێن لەسـەر زەوی کەڵەکـە دەبـن ، ئـەوانی تـر وەکـو خەڵوزو نەوت دوای سووتانیان بەشێکیان بەهەوادا پەرش دەبێتەوە[٧٥]!

---

[٧٤] حول اعادة تشكيل العقل المسلم / د.عمالدين خليل / ل: ١٤٥.

[٧٥] الانسان والبيئة / ل:٦٤- ٦٥.

## ڕووەکەکان :

بەدەقی قورئان ڕووەك زیندەوەرێکن لەخانەی زیندوو پێك دێن و زمانی تایبەتییان هەیە یادی خوا دەکەن﴿ وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ﴿٦﴾ ﴾ ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡزُونٖ ﴿١٩﴾ ﴾ ، واتە : شاخ و کێومان لەزەوی دا داناو هەمو شتێکی ئەندازە کێشراومان تێدا ڕواند.

لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ چیاکان و دارو درەخت دەکات لەگرنگترینییاندا بۆ هاوسەنگی ڕاگرتنی زەوی ، خوداوەند ڕووەکی تێدا داناوە بە کێشراوی (موزون) وشەی (الموزون) هەمان وشەیە ڕووەك زانان و زانایانی ژینگە بەکاری دێنن بۆ هاوسەنگی ژینگەیی (التوازن البيئة).

چیاکان چەقیون لەزەویدا زەوییان توندو تۆڵ کردووە ، شوێنەکی گرنگن بۆ دارستانەکان و ڕووەکی سروشتی و بارینی بەفروباران بۆ لەوەڕی ئاژەڵ و هاوینە هەوارو کوێستان ، پاشان چیاکان عەمبارێکن بۆ گل دانەوەی ئاو و ژیاندنەوەی ئاوی ژێر زەوی ، نمونەی گەورەیان چیاکانی کوردستانە ، دیسان چیاکان ئاو دەپاڵێون و عەمباری دەکەن ، ڕووەك هاوسەنگی ژینگە ڕادەگرێ بە خۆراك دان و ڕاگرتنی هاوسەنگی ئۆکسجین و گلدانەوەی ئاو و پاراستنی خاکی زیندو ...هتد ، وەکو باسمان کرد.

(ام هولی) و برادەرانی دەڵێن : (ڕووەکی سەوز بنەمای بەرهەم هێنانی ماددەی ئەندامین و برگەی یەکەمینن لە زنجیرەی خۆراکیدا ، ڕۆڵی یەکەمی ڕووەك لە بوونی مرۆڤ و گیاندارانەدا لە توانای ڕووەکی سەوزدایە بۆ بەرهەم هێنان لەکاتی بوونی تیشکی خۆردا ، ئەو ماددەی زیندەو ئاڵۆزو ئەندامی لە کەرەستەی سادەی نازیندە دەردێنێ ، بە تایبەتی لە ئاو و نایترۆجین ، دوای کرداری ڕۆشنە پێك هاتن وزەی

کیمیایی لە ئەتەمی ڕووەکیدا دەگۆڕێ وزەی کیمیایی کەشانەو ئەتەمەکان بنیات بنێت ، ئەمەش بۆ ڕووەك مانای ژیان دەبەخشێت) .

قورئان دربارەی ئەم زانستە گرنگە فەرموویەتی﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا ﴾

لێرەدا قورئان ئاماژە بە گرنگی ڕووەکی سەوز دەکات لەبەرهەم هێنانی ماددەی ئەندامی دا ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَيِّ ﴾ ، هەروەها ئاماژە دەکات خودا ناوك دەردێنێ و ئەو ڕووەکە دەتوانێ ماددەی مردووی وەکو ئاو و نایترۆجین بگۆڕێ بۆ ماددەی زیندە .

پاشان ڕووەك لە دارستانەکاندا بەکاردێ بۆ جوانی سروشتی ، بۆ پاراستنی خاکی زیندە لە ڕووتانەوە ، بۆ فێنکی و ڕاگرتنی هاوسەنگی ئۆکسجین و هەڵمژینی گازی دووەمی ئۆکسیدی کاربۆنی ژەهراوی .

پاشان (الخضرة) کە قورئان ئاماژەی بۆ دەکات ، (ام هولی) دەنووسێ : سەوزایی پێویستە ، چونکە تەواوکەری ژینگەی ژیانە ، سەوزایی بە پیشەی بایۆلۆجی و جوانی و ئاو و هەوای بابەتی و تەکنیکی هەڵدەستێت، دەنووسێ : پیشەی بایۆلۆجی و کەشی و بابەتی و تەندروستی و سەوزایە لەوەدایە کەشی دەقەرەکە پڕ لە ئۆکسجین دەکات و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کەم دەکاتەوەو توندی لەرەلەری گەرمی و شێ سووك دەکاتەوە ، پاشان تۆزو خۆڵ لەناوچەکەدا کەم دەکاتەوەو دەنگە دەنگ و هاژە هاژ (الضوضاء) هەڵدەمژێت و کار لە ئایۆنی هەوا دەکات ، پاشان سەوزایی بۆ هەستی بینین و دەماری مرۆڤ پێویستە .

پیشەی تەکنیکی سەوزایی لە سروشتی کراوە ترە نەك لە ژینگەی شارستانی دا ، سەوزایی ئامانجی جۆراو جۆری گرنگی هەیە ، سەرچاوەکانی ئاو دەپارێزێ و خاك پێکەوە قایم دەکات ، ناوچەکە دەگۆڕێت بۆ ناوچەیێکی گەشتیاری و هاوینە هەوارو

شیفا بەخشی ! ، بەلاّم لەشارەکاندا بۆ تۆڕی پەیوەندییەکان و باخچەکان و ناوچە نیشتەجێیەکان و یاریگەی منداڵان و وەرزش و گۆڕستانەکان و شوێنی چەمانەوەی گشتی دا دادەنرێت[٧٦] .

سەوزایی بۆ کرداری هاتوچۆی ئامێرەکانی هاتوچۆ گرنگە ، بەرچاوی شوفێر ڕوونتر دەکاتەوە ، بە تایبەتی لەکاتی خراپی کەش و هەوادا ، (با) کەم دەکاتەوە بوار نادات لەکاتی بادا بەفر زۆر بکەوێتە سەر شەقامەکان ، دڵتەنگی و پەستی شوفێر دووردەخاتەوە ، هانی دەدات بەناو ئەو دارودرەختانەدا هێواش بڕوات .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (سافروا تصحوا) الجامع الصغیر / للسیوطی. واتە : (گەشت و گوزار بکەن ساغ دەبن) ، لەکوردستاندا چەندان هاوینە هەوار هەیە وەکو لە هەولێر : گەلی عەلی بەگ و بێخاڵ و جوندیان و ... ، لە سلێمانی سەرچنارو دوکان و دەربەندیخان و ئەحمەئاواو بیارەو قەرەداغ و ... ، لە دهۆك : سەرسەنگ و سوارە توکەو سۆلاڤ و سیپەو خنس و ... ، گوندەکانی خۆشمان سەرگەینێڵ و سوورە دێ و ئاشقوکەو سینەمۆکەو شارۆش و پشت ئاشان و گوندەکانی تر لە کوێستان و هاوینە هەوارە هەرە خۆشەکانن لە بناری قەندیلدا.

**گیانداران :**

﴿ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ﴾ ، واتە : گەزۆو شێلاقەمان ناردە سەرتان. ﴿ أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَىٰ بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ اهْبِطُوا مِصْرًا ﴿٦١﴾ ﴾ ، واتە : (دانەوێڵە) دەگۆڕنەوە بەشتێ کە لەو باشترە (کە شێلاقەو گەزۆیە) ، واتە : پرۆتینی ئاژەڵی باشترە لە پرۆتینی ڕووەکی .

---

[٧٦] الانسان والبیئة : ل: ٧٣-٧٦ بەکورت کردنەوە.

﴿ أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ﴾ ، واته : بۆتان ڕەوا کراوە ئاژەڵان و مەڕو ماڵات.

﴿ ...أُحِلَّ لَكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَحۡرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِۖ ... ﴾ واته : نێچیری دەریاو خواردنەکەی ئێوە ڕەواکراوە بۆ سواری ئێوە .

﴿ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾ ، واته : ئەسپ و ئێسترو کەر بۆ سواری و جوانییە ، شتی واتان بۆ دروست دەکەین ئێوە نایزانن.

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات ئەو سێ ئاژەڵە بۆ خواردن نیەیە ، بەڵکو بۆ جوانی و سواری و بار هەڵگرتنە ، وە داهاتوو ئامێری تری سواریتان بۆ دروست دەکەین کە ئێوە لە چاخی پێغەمبەر (ﷺ) نایزانن وەکو ئۆتۆمبێل و فڕۆکەو شەمەندەفەرو پاپۆڕو کەشتی ئاسمانی و هیتر .

لێرەدا قورئان ئاماژە بەگرنگی ئاژەڵ دەکات لە ژینگەدا بۆ خواردن و سوودو سواری و جوانی و کەیف و سەفا ، لە پێستی ولاخ پێست و مەشکەو پێڵاو دروست دەکەن ، لە موو خوری و جل و بەرگ و تاوڵ دروست دەکەن ، لە شیرەکەیان ماست و دۆو نیفشك و کەشك و پەنیر دورست دەکەن ﴿ ...وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ... ﴾ ، واته : لەخوری و تووك و مووی کەل و پەل دروست دەکەن.

(ام هولی) دەنووسێ : گیانداران بۆ مرۆڤ گرنگی یەکی گەورەیان هەیە ، هەرچەندە لە بەشی گیاندارە بەکارهێنەکانە (المستهلكة) لەگەڵ مرۆڤدا ، بەلام کۆمەڵگا بەبێ گیانداران ناتوانێ دەوام بەبوونی خۆی بدات ، داهاتوو ئاماژە بە گرنگی پڕۆتینی ئاژەڵی دەدەین لە ڕاست مرۆڤدا ، پاشان باس لە سوودەکانیان دەکەین.

- سەرچاوەی خۆراكن وەكو گۆشت و بەز (پیو).
- سەرچاوەی كەرەستەكانن (كەوڵ ، پێست ، قۆچ ، عاج ، شتی تر).
- هەندێ مێروو پارێزەری ڕووەك و بە پیتی و تەندروستی گشتین.
- وەكو بەهای جوانی و هۆكاری وەرزشی .
- بۆ دەوڵەمەندی سروشت و دارستان : (وەكو ڕاگرتنی هاوسەنگی نێوان ڕووەك و دار و ئاژەڵ).
- وەكو بەهای زانستی بۆ تاوتوێ كردن و ئەزموونەكان ، پاشان گەشەدان بەبەرگری مرۆڤ دژ بە نەخۆشیەكان و ڕزگاركردنی لە هەندێكیان[٣٧] .

قورئان ئاماژە بە گرنگی زۆر لە مێرووەكان دەكات لە قورئاندا ، وەكو : (هەنگ ، مێرووله ، باڵندە ، مێش و مێشووله ، پەپوله ، كولله) ، بە ویستی خوا لە بەشی (زیندەوەر زانی لە سایەی قورئان و فەرموودەدا) باسیان دەكەین ، وە بڕوانە (الحیوان في القرآن الكریم/ د.زغلول النجار).

بۆ نمونە قورئان فەرموویەتی ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم .... ﴾ [illegible] ، واتە : هەر گیاندارێك بەزەویدا دەڕوات یان بە باڵەكانی بەهەوادا دەفڕێ میللەتێكن وەكو ئێوە ، بێگومان ئیمڕۆش زیندەوەرزانان گیاندارانیان پۆلێن كردووە ، مرۆڤیان بەبەشێ لە جیهانی گیانداران داناوە !

جیهانی سەرەتایی وەكو بەكتریا / جیهانی پێشەنگەكان وەكو پارامسیۆم / جیهانی ڕووەك وەك گوێزو گژوگیا / جیهانی كەڕو وەكو كوارگ / جیهانی گیانداران ، هەموو گیاندارە فرە خانەكان دەگرێتەوە ، لەمرۆڤ و گیاندارانی تر ، تا ئێستا زیاتر لە ملیۆنێ جۆر گیاندار لە زەویدا دۆزراونەوە .

---

[٣٧] الانسان والبیئة : ل:٧٧.

(ام هولی) دەڵێ : سەیرە تا مرۆڤ لە ڕێگای ڕاو بەدەستی هێناوە ، پاشان بەماڵی کردن و بەخێو کردنی ئەو گیاندارانەی کەیی دەکرێن ، جاران گیانداران تا ئێستاش لە هەندێ شوێندا بۆ کاری ڕاکێشان و جووت و ئاودێری و گواستنەوە بەکاردێن وەکو ئێسترو ئەسپ و ماین و ووشتر ، وە لەکاری تردا یارمەتی مرۆڤ دەدات ، وەکو ڕاو (وەك : سەگ و تاژی) ، ئەو ڕاوەی مرۆڤ بۆ خۆڕزگارکردن لەمردن دەیکرد وەرزشی ڕاوی لێ کەوتەوە .

ماسی برگەیێکی گرنگە لەناو ئاژەڵانی ڕاودا ، بەتایبەتی دەریاییەکان ، بۆیە ڕێژەیەکی گرنگی خۆراکی جیهان پێك دێنن ، شێوازی ڕاوی ماسی بە پێ ی ناوچەکان جیایە ، ڕاوی ماسی ئاوی شیرین لە ڕاوی ماسی کەنارەکان و ئەویش لە ڕاوی قوڵایی دەریا و زەریا جیایە ، بەکارهێنانی سامانی ئاژەڵی و ماسی وەکو سەرچاوەی خۆراك پاڵپشتێکی هاوچەرخییە بۆ بەرهەمهێنانی ئاژەڵی ، پێشکەوتن لە تەکنەلۆژیای کشتوکاڵی دا کاریگەرییەکی ئیجابی یە لە گۆڕانی پەیتا پەیتایی وزەوە سەرهەڵدەدات ، شێوازی چاولێکەری گۆڕانی وزەی کیمیایی تەنیا (٦,٢٥)ی کۆی وزە عەمبار کراوەکان دەدات لە بنەڕەتدا[٧٨] .

﴿ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَٰنَ الَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ ، بەم شێوەیە قورئان شان بەشانی زانستە تازەکان دەڕوات و لە هەمو بوارێکدا زانست تەنیا ڕاڤەیێکە لە خزمەت ڕوونکردنەوەی ئایەتەکانی خوایە لە گەردوون و قورئان .

[٧٨] الانسان والبيئة / ل:٧٨- ٧٩.

# بەشی پێنجەم

# سەرچاوەکانی وزە

ئیعجازی ( ٣٣ ) چاوگە سەرەکییەکانی وزە

ئیعجازی ( ٣٤ ) وزەی خۆر

ئیعجازی ( ٣٥ ) وزەی زەمینی

ئیعجازی ( ٣٦ وزەی گەردیلەیی

ئیعجازی ( ٣٧ ) وزەی ئاو

ئیعجازی ( ٣٨ ) وزەی با

ئیعجازی ( ٣٩ ) وزەی سوتەمەنییەکان

گەر تەماشای قورئانی پیرۆز بکەین و لێ ی وردبینەوە ، دەبینین بوونەوەری ماددی و گیانی (یـر الاث) بەجیهانی گەورەی وزە (الطاقـة) گـەرمی و ڕونـاکی دەناسـێنێت ، کەمرۆڤ لە ئاستی توانای ماددی و گیانی خۆیدا دەتوانێ سوودیان لێ ببینێت.

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَـٰتِ وَٱلنُّورَ ... ﴾ ، واتە : سوپاس و پێ زانین بـۆ ئـەو خوایـەی ئاسمانـەکان و زەوی دروسـت کـردووە ، تـاریکی ییەکان و ڕوناکی داناوە .

﴿ ۞ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ ﴾ ، خـودا دروسـت کـەری ڕونــاکی ئاسمانەکان و زەوییـە. مـرۆڤ و گیانـداران خـاوەن وزەو تیشـکێکی موگناتیسـی گیـانن بـەناوی (هالـەی موگناتیسـی) : ﴿ يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِم ...(١٢) ﴾

یان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (اتقوا فراسة المؤمن فانـه ينظـر بنـور الله) الجامع الصغير ، واتە : لەدووربینیی بڕوادار خۆت بپارێزە ئەو بـە ڕونـاکی خـودا دەبینێـت، وشەی (الظلمات) و (النور) ئاماژەیە بۆ ماددە و وزە لە گەردووندا.

(جـون کلیفلانـد کـوثران/ کیمیـازان و ماتماتیـك زان) دەنوسـێ : کیمیـا لـە پێـك هاتەکانی ماددەو ئەو گۆڕانانە دەکۆڵێتەوە بەسەر ماددەدا دێت ، لەوانە گۆڕانی ماددە بـۆ وزەو گـۆڕانی وزە بـۆ مـاددە. مـاددە لـە کۆمـەڵێ گەردیلـە پێـك دێ ، گەردیلـە و ئەلکترۆن و نیوترۆنەکان کە کارەباو خودی وزە پێك دێـنن ، هـەموو ئەوانـە مـل بـۆ چەنـد یاساییەکی دیاری کراو کەچ دەکەن پەیدابوونی ڕێککەوت بێت ، کاتێ ماددە بۆ

وزە دەگۆڕێت ، یان وزە بۆ ماددە دەگۆڕێ ئەوە بەپێ ی چەند یاسایێکی دیاری کراو دەگۆڕێت[٧٩] .

(ئـەدوارد لـوتر کیسـیل)پسـپۆڕی گیانـدارزانی و ڕووەك زانـی لـە ئەمـەریکا دەڵـێ : گەردوون سەرەتای هەیەو ئەزەلی نییە ، (یاساکانی دووەمی دینامیکای گەرمی) هەڵەی ئەزەلییەتی ماددە دەسەلمێنێ ، لێرەدا بەردەوام گەرمی لە تەنە گەرمەکانەوە بۆ تەنە ساردەکان دەگوازرێتەوە ، پێچەوانەوەش ڕوونـادات ، گـەرمی لـە تەنـە ساردەکان بـۆ گەرمەکان ناگەڕێتەوە ، بەو پێیە ڕۆژێ دێ گەرمی هەموو تەنەکان یەکسان دەبێ و چاوگی وزە دوایـی دێـت و وشـك دەبێـت ، کـرداری کیمیـایی و سروشـتی ڕونـادات و شوێنەواری ژیان لە گەردووندا نامێنێت[٨٠] .

بەو پێ یە گەردوون بریتی یە لە تۆپەڵێ ماددەو وزەو سەرەتای هەیەو کۆتایی هەیە ، کە قورئان بە (الظلمات) و (النور) ناویان دەبات .

(ئەنشتاین) لە ڕاست (هاوسـەنگی بارسـتایی و وزە) دەڵـێ (١)گـم مـاددە ئـەو وزەیـەی لەناوی دایـە ($٩\times10^{13}$)(وات)ە ، واتـە گـەر ئـەو وزەیـە لەیـەك چـرکەدا بتەقێنـرێتـەوە ($٩\times10^{13}$) (وات) دەدات ، بـەو پێیـە بـڕە مـاددەیێکی کـەم گـۆڕا بـەبڕە وزەیێکـی بـێ شومار[٨١] . تەقینەوەی ناوکی لەسەر ئەم یاسایە دادەمەزرێت ، بەو پێیە گەردوون ماتە وزەیەکی بێ شومارە ئامادەیی تەقاندنـەوەی هەیـە ، بـەڵکو بوونـەوەر خـۆی سـەرەتا وەکو بۆمبایێکی هایدرۆجینی تەقیوەتەوە . ئاو ($H_2O$) ئامادەیی تەقینەوەی هەیـە!

﴿ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ۝٣ ﴾ الانفطار ٣ ﴿ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ۝٦ ﴾ التكوير ٦ ،

---

[٧٩] الله يتجلى في عصر العلم / ل:٢٤.

[٨٠] هەمان سەرچاوە / ل:٢٧.

[٨١] النسبية بين نيوتن وانشتاين / د.طالب ناهي الخفاجي / ل:٥٢.

دارو درەخت ماتە وزەیە﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا ﴾ ،
وزەی گیانیی گەورەترین وزەیە ، توانای سایکۆکینیزیاو ڕاگرتنی خۆرو ڕاکێشانی هەورو تلەپاتی و ... هتد هەیە .

(بیل) دەڵێ : مرۆڤ وزەیێکی هەیە توانای هەیە شاری نیوۆرك ئاگر بدات و بیکاتە خۆڵەمێش.

(بیدرن) باس لە (zarg – زارگ) دەكات : (توانای ڕاكێشانی هەوری ئەستێرەكان لە خولگەیان و شێواندنی گۆی زەوی و كۆمەڵەی خۆرو وەستاندنی زەوی لە خولگەیی و گۆڕینی یاساكانی خودی سروشت [٨٢].

كارە نا ئاساییەكان بەو ڕوناكی و وزە گیانی یە ئەنجام دەدرێن ، (ابن حجر) لە (الصواعق المحرقە / ل: ١٦١) لە باسی كارە نائاسایی یەكانی ئیمامی عەلی (ﷺ) فەرموویەتی : عەلی ڕۆژی بۆ گەڕایەوە. یان علی لە (الصیفین) دا باسی كردووە ، ڕابردوو نمونەی ترمان باسكردووە پێغەمبەران و ڕەوانەكراوانی خوایی و ئەولیایان بە ویستی خودا لە توانایاندا بووە ، وەكو موعجیزەو كەرامەت بەو وزەیە كارە نائاسییەكان ئەنجام بدەن و كۆمەكی خەڵكی بكەن و ڕێنومایی خەڵكی بكەن بەرەو خودا ناسی و گۆڕان لەسروشت و ماددەدا دروست بكەن. بۆ نمونە : موسا بەو هێزە ڕوناكییەی لەدەستیدابووە جادوی جادوكارانی بەتاڵ كردەوە ، نیلی كەرت كرد بۆ پەڕینەوەی بەنوئیسرائیلی یەكان ، كانیاوی بەنو ئیسرائیل(١٢) دانە لەزەویدا تەقاندەوە ، گەزۆو شیلاقەی باراند ، مردوی زیندوو كردەوە ، وەكو لە نمونەی بەسەرهاتی مانگای (بەنو ئیسرائیل)دا دیارە ...هتد ،﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ

---

[٨٢] حروب العقل / رونالدم ، ماكري / ل:١٣٢- ١٣٦.

﴿٣٣﴾ کارە نائاسییەکان بۆڕەوانە کراوانی خوایی موعجیزەیە ، بۆ ئەولیایان کەرامەتە .

سولەیمان (ﷺ) (با) و (جنۆکە)و هێزی گیانی ڕام بوو، توانی لە ڕێگای وزەی گیانی و ماددیەوە وەکو موسا لە دەوڵەتەکەیدا بەکاربێنێ و سوودی ئیمانی و ئابووری لێ وەربگرێت ، (وەکو لە ڕابردوو باسکرا).﴿ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ ﴾

(ام هولی) دەربارەی سەرچاوە سەرەکییەکانی وزەی ماددی و بەکارهێنانەکانی دەنوسێت : هەندێ لە سەرچاوەکانی ژینگەی ژیان لە بواری وزەدا دەتوانرێ بەکاربرێن .

سەرچاوە سەرەکییەکانی وزە بۆ پێشکەوتنی ئابووری کۆمەڵگا گرنگن ، هەروەها لە وزەی تر وەرنەگیراون ، وەکو وزەی تیشکی خۆرو وزەی هەڵکشان و داکشان و وزەی ئەتۆمی و وزەی گەرمی و وزەی بای پەیوەست بە سوڕی زەوییەوە ، هەرچی وزەی ترە لەو جۆرانەی باسمانکردن وەردەگیرێن ، بەتایبەتی لە وزەی خۆر ، لەوانە باسی ئەو وزەیە دەکەین لە سوتاندنی سوتەمەنی ئەندامی پەستراو وزەی چڕ بوونەوەی هەوایی و تەوژمی ئاوی و شتی تری لەو شێوەیە بەدەست دێنرێت .

کۆمەڵگای هاوچەرخ ناتوانێ چالاکی ئابورییەکەی گەشە پێ بدات بەبێ ئامادەکردنێکی لەباری وزەی بەردەوام ، بەرز بوونەوەی پێویستی بە وزەی جیهانی گرنگی خۆی لەسەر یەدەگی ئەو چاوگە وزانە دادەمەزرێنێ بۆ بەکارهێنان دەشێن ، کە دەکرێ بۆ وزەی لاوەکی بگۆڕدرێ ، لەسەرووی هەموویانەوە (وزەی کارەبایی) ، بەو پێ و دانگەی باسکرا ئەمانە چاوگی وزەی سەرەکین : (تیشکی خۆر / گەرمی زەوی / وزەی ناوکی / ئاو / با / سووتەمەنی).

**تیشکی خۆر:**

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ ﴾ واتە : خۆرو مانگی بۆ خستونە ژێر ڕکێف بە بەردەوامی ، بێگومان خۆر چاوگی ڕوناکی و وزەیە ، مانگ و خۆر هەڵکشان و داکشان لە دەریا پەیدا دەکەن .

پاشان ئیمڕۆ وزەی خۆر لە زۆر بواری تردا ڕام کراوەو لە خزمەت مرۆڤدا دەرگای عەمباری خۆی خستۆتە سەر پشت، بەکارهێنانی وزەی خۆر دەکرێ بکرێن بە چەند بەشێکەوە : بەکار هێنانی گەرمی لە کیمیای ڕوناکی دا ، لەبەکارهێنانی کارەبایی دا ، تیشکی خۆر وەکو گەرمی بۆ گەرم کردنەوەی ماڵ و ئامادەکردنی ئاوی گەرم بەکاردەهێنرێت ، دیسان بۆ بەکارهێنانی دەزگای چێشت لێ نان بە وزەی تیشکی خۆر و دڵۆپاندن و فڕنی و ئاگردانی گەرمی و بەدەست هێنانی وزەی میکانیکی و کارەبایی و ... هتد ، لەبواری کیمیایی ڕوناکی دا تیشکی خۆر بۆ بواری کشتوکاڵی و پەروەردەی گژوگیاو قەوزەی دەریایی و شی کردنەوەو پارچەکردنی ئاو بەکاردەهێنرێت لەکاتی بنیاتنانی پاتری کارەبایی و وێنەگرتن و پاتری خۆری و کرداری کارەبایی و گەرمی هەمە جۆردا سوودی لێ وەردەگیرێت[٨٣] .

**گەرمی زەوی:**

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ ... ﴾ ، واتە : تۆ نابینی هەرچی لە زەویدایە خودا خستویە ژێر ڕکێفی ئێوەوە ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ

---

[٨٣] الانسان والبيئة / ل:٨٥.

﴿ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ ﴾ ، واته : كاتێ زەوی كەوتە بومەلەرزە ، زەوی تەنە قورسەكانی دەرهێنا .

لێرەدا قورئان ئاماژە دەكات ناخی زەوی هەمووی تەنی قورس و تواوەیە ، ڕۆژێ دێ ئەو وزەیە بێتە دەرو كۆتایی پێ بێت .

(ابن جرير) لە (ابن مسعود) ی گێڕاوەتەوە (الارض كلها نار يوم القيامة) ، واتە : لە قیامەتدا زەوی دەبێتە پارچە ئاگرێك ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (فان تحت البحر نارا) (رواه البيهقي باسناد صحيح ورواه ابو داود) ، واتە : لەژێر دەریادا ئاگر هەیە ، خواش فەرموویەتی ﴿ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ﴿٦﴾ ﴾ واتە : سوێند بە دەریای گڕگرتوو .

زانستی جیۆلۆجی دەڵێ : ناخی زەوی پارچەیەكە لە ئاگر ، پلەی گەرمی چەقەكەی ($٧٠٠٠^{\circ}$)س ، واتە : لە پلەی گەرمی ڕووی خۆر نزیكە ، دوای (٦٤٠٠) كم گەشت بەو كڕۆكە دەگەیت[٨٤] .

وە لێرەدا قورئان ئاماژە بە ئەڵقەی ئاگر (Ring of fire) دەكات ، ئەو ناوچەیە پشتێنەیەكی ئاگرینە (٨٠٪) ی بومەلەرزەكانی تێدا ڕودەدات ، ناوچەیێكە دەكەوێتە ناوەوەو دەرەوەی كەنارەكانی ئۆقیانووسی هێمن (الهادي) ئەو ناوچەیە لە هەموو ناوچەكان پتر تووشی بوركان دێت[٨٥] .

بەو پێیە مرۆڤ چۆن دەتوانێ سوود لەوزەو گەرمی خۆر وەربگرێ دەشتوانێ سوود لە گەرمی و وزەی ناخی زەوی وەربگرێت و خودا بۆ مرۆڤی دەستە مۆكردووە ، كاتێ

---

[٨٤] بڕوانە (الزلازل والبراكين / د.ايمن الاسكندري/ ل: ٧- ١٧- ١٨.

[٨٥] هەمان سەرچاوە.

خــودا فەرموويــەتى : ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ ﴾ ، واتــە : كاتێــك زەوى دەخولێتــەوە ، مانــاى وايــە زەوى لەهــەوادا دەسوڕێتەوە ، لەناخيشدا ماددە تواوەكانى لەبەر گەرمى دا لە هەڵچوون و گێژ خواردن و سوڕدانە .

(ام هولى) دەڵێ : وزەى گەرمى ناخى زەمين (باطن الارض) سروشتى بۆ گۆى زەمـين ، بـەكارهێنانى تەكنيكييەكـەى لەبـەكارهێنانى چاوگە سروشـتييەكانى هـەڵم و ئـاوى گەرمـدا لـە ناوچـە بوركانييـەكانى ئێسـتا و رابـردوودا خـۆى حەشـار دەدات ، ئـەو هەڵمەى لە ڕێگاى كونەكانى زەوييە دەردەچێ لەناخى زەوييەوە لە سەرچاوەكەيەوە دەردەچێ بۆ ئەو شوێنەى تێ دا بەكار دەهێنـرێت .

گەرمى زەوى بە ماناى وزە لە وێستگەى كارەبـايى تايبـەتى دا وەكـو وزەيێكـى بـزۆك سـوودى بنـەڕەتى هەيـە ، ئـەو هەڵمـەى لـە زەوييـەوە دەردەپـەڕێ تۆڕبينـەكان و كۆنفيرتـەرەكان (المحولات) لـەو وێستگانەدا دەخاتـە گـەڕ ، لـە جيهـانى ئێسـتادا زۆر وێستگەى لەو بابەتە هەيە. (وايكر) لـە نيوزلنـدا وە لـە ئەمـەريكاو ئيتاڵيـاو شـوێنى تردا ، بۆ دانانى وێستگەى گەرمى نـاخى زەمينـى پێويستى بـە يـەدەگى گـەرمى نـاو وزەى هەيە ، قولاَييەكەى بۆ دەرهێنان لە (١٢٠٠ – ٢٠٠٠) م كەمتر نەبێ لەبەرزيدا [٨٦].

بەكارهێنانى گەرمى ناو زەوى بۆ گەرم كردنەوەى جێگاو كێڵگەى زەمينـى داپۆشـراو لە هەموويان بلاَوترە ، لێرەدا شارى تايبەتى هەيە بۆ چارەسەر كردنى سروشـتى لـە چيكۆلۆفاكيا ، هەر لـە (١٩٦٠) دا سـود لـەو پلـە گەرمييـە بەدەسـت هـاتووە بـەردەوام وەردەگـيرێ لـە سـنوورى (٤٢,٧)°س دايـە ، لـە زۆر ولاَتـى تريشـدا ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ

---

[٨٦] الانسان و البيئة / ل:٨٦- ٨٨ بەكورت كردنەوە .

ٱلۡفَلَقِ ﴿١﴾ وزەی گەرمی ناخی زەوی سودی لێ دەبینرێ وەکو نیوزلەنداو مەکسیك و یابان و فەرەنساو شوێنی تر ، بەلاَم بەرێژەیێکی کەم .

**وزەی روناکی :**

له کتێبی (گەردیلەزانی) دا بـه درێـژی باسـی گەردیلـەو وزەی گەردیلـه کـرا ، لێـرەدا وەکو بیرخستنەوە تیشکێکی دەخەینە سەر ، قورئان فەرموویـەتی : (قـل أعـوذ بـرب الفلق) (الفلق١) ، وشەی (الفلق) زۆر واتای زانستی هەیە ، وەکو بەرەبەیان ، گەردوون ، دۆڵێکی دۆزەخ ، لێك جیاکەرەوەی کاو و دانه ، وەکو له (تفسیر الطبری) باسکراوە.

لەهەمان کاتدا (الفلق) وشەیێکی ئەتۆمییه ، (انفلاق الذرة) یان (الإنشطار الذرة) ، واته : کەرت بوونی ناوکی ، یان ئەتۆمی ، له (معجم البحرین)دا هاتووه : وتـراوه (الفلـق) بەهەموو دروستکراوێ دەوتـرێ ، (فلقته : اي شـققته) ، بـەو پێیـه (انفـلاق)بـه مانـای کـەرت بـوونی نـاوکیش دێ ، یەکـەی پێـك هـاتنی گـەردوون بـەلای زۆربـەی زانایـان گەردیلەیە. پێشەوا عەلی (کرّم الله وجهه) فەرموویەتی : ( ان من ورائکم الذر لا تبقي ولا تذر) (سلوا علیا/ هشام ال قطیط/ل : ٢٨٤. واته : بـەدوای ئێـوەدا گەردیلـه هەیـه هیچ شتێك ناهێڵێتەوەو پاش خۆی نادات.

(ام هولی) دەنووسێ : وزەی ئـەتۆمی لەکـەرت بـوونی نـاوکی (الانفـلاق النـووی)یـەوە دەردەچێت لەگەردیلەکاندا لەناو کوورەکانی ناوکیدا ، لـەکاتی کـرداری کـەرت بـوونی ناوکیـدا لـەرێگای زنجـیرە کارلێککردنێکـدا لـه تـەواوی توخمـه تیشـکدەرەوەکانـدا ، (زرتوخمی یۆرانیۆم و پلۆتۆنیـۆم – النظـائر)دا ناوکـەکان بـەکاردەهێنرێت ، توخمـه تیشکدەرەکانی خاوەن ناوکی ئەتۆمی ئـاڵۆز بـۆ ئـەو توخمانـه دەگـۆڕێن ناوکـەکانیان ناڵۆزییان کەمترە ئەو توخمه نوێیانه بڕێکی دیاری کـراو لـه بارسـتاییەکەی دەگـۆڕێ لەکاتی کارلێکردندا ، بەو برەیه بۆ وزەیێ دەگۆڕێ بـەپێ ی هاوکێشـەی ئەنشـتاین :

($E=m.c^2$) ، هێمای (M) واتە : بارستایی ، ئەوەندەی ئەو ناوکانەیە گەردیلەکان لە دەستی دەدەن ، (C) بریتی یە لە (خێرایی تیشک) .

کەواتە : بارستایی جێگیر بۆ وزەیێ دەگۆڕێت ، ئەو وزەیەی بەهۆی زنجیرە کارلێککردنێ دێتە دی بۆ وزەیێکی گەرمی دەگۆڕێ نزیکەی (٨٦٪) ئەوەی ماوەتەوە وزەی تیشک دەرەوەو وزە جوڵەی نیوترۆنەکانە ، دەتوانرێ گەرمی وەکو سووتاندنی خەڵوز بەکاربێنرێت ، بۆ سەدکردنی پێویستیە ڕاستەوخۆیەکان لە وزەی گەرمییەوە ، یان بۆ گۆڕینی بۆ وزەیێکی میکانیکی یان کارەبایی .

وێستگە گەردیلەیەکانی ئێستا لە ڕاستیدا وێستگەی کارەبایی گەرمین ، پلەی گەرمی ئەو کەرەستانەی دەردەچن (٣×١٠٦) جار زیاترە لەو گەرمییەی لە سووتاندنی باشترین جۆری خەڵوز دەردەپەڕێت.

دیسان وزەی ئەتۆمی جگە لەبەرهەمهێنانی وزەی کارەبایی لە تەکنیکی دەزگای پزیشکی و بەرهەمهێنانی پیشەسازی و پاراستنی خۆراك و بەرهەم هێنانی ئاوی خواردنەوە لە ئاوی دەریادا (شیرینکردنی ئاو) و وەکو جێگرەوەی خەڵوزی (کوك) لە پیشەسازی کانزایی پۆڵاو شتی تردا بەکاردێنرێت ، بەردەوام ئاسۆی بەکارهێنانی وزەی ناوکی بێ سنوور فراوانی بەخۆوە دەبینێت [87].

**وزەی ئاو:**

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ ﴾

[illegible] ، واتە : ڕوبارەکانی خستۆتە بەردەستتان .

---

[87] الانسان والبيئة / ل:٨٨- ٨٩.

قورئانی پیرۆز له چهند ئایهتدا ئاماژه به شهپۆلی دهریاکان دهکات ، ئاماژه به جۆرو بهرزی و توانـای ئـهو شـهپۆلانه دهكـات و سـهرهنجی مرۆڤیـان بـهرهولا ڕادهكێشـێت ﴿ ...جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ ... ﴾ ، لێـرهدا قورئان ئاماژه بـه شـهپۆلی دهریـایی دهكات ، كـه گـهردهلوول و بـا پـهیـدایان دهكات ، قورئان ئاماژه به شهپۆلی لافاوی نوح (علیه السلام) دهكات ﴿ وَهِيَ تَجۡرِي بِهِمۡ فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ ﴾ ، لێـرهدا قورئـان ئامـاژه بهشـهپۆلی لـه شـێوهی (تسـۆنامی) دهكـات ، (تسـۆنامی Tsunami) : ئـهو شـهپۆله بههێزانـهن دهریـا بـهرهو كـهناریان بهڕێ دهكات ، توانای لهناوبردنی هەموو ئهو شتانهی ههیه دێنه پێشی یهوه له بیناو كشتوكاڵ و مـرۆڤ و ... ، خێرایی ئـهو شـهپۆلانه لـهكات ژمێرێكدا (٦٠٠-٨٠٠)كـم ه ، درێژی ئهو شهپۆلانه دهگاته (٦٠م)[88] یان ئاماژه به شهپۆلی ههڵكشان و داكشان دهكات ﴿ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوۡجٞ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴿٣٢﴾ ﴾

(ام هولی) دهنووسێ : ناو چاوگێكی سروشتی ژینگهیه ، ههڵگری وزهیێكی میكانیكی و كیمیـایی و گـهرمییـه ، وزهی میكـانیكی ئـاو دابـهش دهكـرێ بـۆ وزهی چـڕبوونهوهی ههوایی و وزهی بارسـتایی ڕهنوبـهفر (سـههۆڵ بهنـد) و وزهی تـهزووی ئـاوی و وزهی دهریاكان .

وزهی میكانیكی كه له چڕ بوونهوهی ههوا پهیدا دهبێت و لهشێوهی باران و بهفردا له چهند بهرزاییهكی جیا لهسهر ڕووی زهوی دهبارێت ، بهدژواری بهكاردێ ، هۆیهكـهی ئهوهیه كهمتر چڕ دهبێتهوه ، بهپێ ی شوێن لهبارنییه ، بـهپێ ی كـات چـاك دابـهش نابێت ، پاشان له پلهی پهیتی دا ئاڵوگۆڕی زۆر وهردهگرێت .

[88] الزلازل والبراكين / ل:٢٩- ٣٠.

له ڕووی تەکنیکی یەوە ناتوانرێ وزەی میکانیکی بارستایی بەستەڵەك بەکاربێنرێ لەجەمسەرەکان و لوتکەی زنجیرە چیاکاندا ، لەکاتێکدا بارستاییەکەی لەسەر زەویدا (٦١٠×٢١ کم$^3$) ایە ، ئەوە بەکارهێنانی ئەو وزە دیاری دەکات لەکاتی توانەوەو ئەو وزە جوڵەیەی بەدوایدا دێت .

وزەی میکانیکی ئاو لایەنێکی گرنگ پێك دێنێ لە هاوسەنگی سەرچاوە وزەیی یەکان ، بەکارهێنانی تەکنیکی یەکەی کە بە زۆری لە وێستگەکانی دروستکردنی وزەی کارەبایی دا دێتە دی ، گرنگترین مەرجی ئەو دیاری کردنەیە ، واتە : جیاوازییەکە لەنێوان بەرزی ئاستی ڕووی ئاو دایە کە لەسەرەوەو ژێرەوەی وێستگەدا بەکاردێنرێت.

تواناکانی بەرهەمهێنانی کارەبایی لە تەزووی ئاودا کەمترین ئاستی بە پێ ی زانستەکانی ولأتە یەکگرتووەکان دەگاتە (٤٧٨٩ × ٩١٠) کیلۆ وات لە کاتژمێرێکدا ، هەرچی وزەو توانستی دەریاکانە لە چەند شەپۆلێکی گەورەدا دەردەکەوێ لەکاتی کرداری هەڵکشان و داکشاندا ، وزەی شەپۆلە دەریایی یەکان فرە گەورەیە ، بەلأم لە ڕووی تەکنیکی یەوە بەکارهێنانیان زۆر ئەستەمە ، چونکە گۆڕینی شەپۆلی بەلەرەلەر لە هەرشتێ دا لەکارە دژوارەکان و ئاڵۆزەکانە ، بەرزی شەپۆلەکانی هەڵکشان و داکشان (المدو الجزر) دەگاتە (٤)م ، جار هەیە دەگاتە (١٠-١٥) م ! بە دەگمەن دەگاتە (١٩)م ، بەکارهێنانی وزەی ئەو شەپۆلانە لە وێستگەی کارەبایی هەڵکشاندا بەپێ ی هەڵکشانە دەکرێت ، لەوێدا ئەو تۆڕبینانە بەهۆی ئاوی هەڵکشاو بەرەو وێستگە کارەباییەکە دەست بەکار دەکەن (ئەو هەڵکشانانەی لە کەنداوێکی گونجاودا پەیدا دەبن) ، لێرەدا بەنداوی ئاوی هەیە بەرەنگاری شەپۆلی دەریایی دەبێتەوە ، ئاستی ئاو لەکاتی هەڵکشاندا لە ئاستی ڕووی دەریا کەمتر دەبێ ، بە پێچەوانەوەش پێویستە ئەو تۆڕبینانە بەکاربێن ، فشاریان نزمە تا تەزووی ئاو لە هەردوو لاوە ڕوویان تێ بکات لەکاتی بەکارهێنانی وزەی هەڵکشان و داکشاندا ، لەبەر

نـاڕێکی سیسـتەمی هەڵکشـان و داکشـان لـە زەویـدا خـەملێنـراوە نزیکـەی (٨٢ × ١٠٩) لەکاتژمێرێکدا لە یەك ساڵدا .

گرنگترین وێستگەی کارەبایی لە ئەوروپادا ، کە وزەی هەڵکشان و داکشان بـەکاردێنێ وێستگەی فەرەنسایە لە (سانت مـالو) لـە تـەك ڕێژگـەی روبـاری (رانـس) لـە کـەناری (نورماندی) ، توانای پەیداکردنی کارەبایی ئەو وێستگەیە (٢٤٠) مێگا واتە ، بەرهەمی ساڵانەی (٥٦٧) ملیۆن کیلۆ واتە/ لە کاتژمێرێکدا .

وێستگەی تری ئـەزموونی لـە شـۆڕەوی کـۆن دروسـت کـراوە بـۆ بـەدی هێنـانی وزەی هەڵکشانی کەنـداوی (کیسلا کوبـا) لـە نیمچە دورگـەی (کـولا) بـۆ وەرگرتنـی ئـاوی هەڵکشان ، کە ئەو پەڕی بەرزبوونەوەکەی (٧)م) ، توانـای کارەبـا پەیـداکردنی (٨٠٠) کیلۆ واتە .

بەدروستکردنی گێراوەی ئاوی سوێر وزەی کیمیایی پەیدا دەبێ ، ساڵانە (٢٧×٦١٠) تەن لە کەرستەی ڕەق بەهۆی ئاوەوە دەتوێتەوە ، ئەمەش ئامازەیە بۆ بوونی (ماتە وزەی کیمیایی) گەورە لە ئاودا ، ئەوەی ڕێگا دەگرێ لـە بـەکارهێنانی ئـەو وزەیـە دا کـەمی پەیتی ئەو گێراوانەیە .

ئاو لە سروشتدا بەو چەمکە وەسف دەکرێ کەوزەیێکی گەرمی گەورەیە ، دەکـرێ لـە ڕووی تەکنیکی یەوە لە ترومپای گەرمی (المضخات الحرارية) دا بەکاربێنرێ ، لەسـەر بنەمای بەکارهێنانی ڕێژەی کەم و زۆری گەرمی بەکاربێنـرێت .

لێژبوونەوەی گەرمی بە تایبەتی لە دەریاکانی هێڵی یەکساندا (البحارالاستوائيه) دا لە پلەی گەرمی ئاویدا هەیە (٢٠°)س لەسەر ڕوتا (٢٥°)س لە قولایی تەنیا (٤°)س یە ، هێشتاش تەزو شـەپۆلی دەریایی و گۆڕانـەکانی دۆخـی ئـاوی وەکـو وەزەیێـك لـە ڕوی تەکنیکی یەوە ناکرێ بەکاربێنـرێت.

وزەی هەڵمی ئاو هێشتا لە ڕووی ئاوی کراوەدا لە سیستەمی (بەهەڵم کردنی خۆری) دا بەکاردێنرێت.

وزەی تەزووە ئاوەکان گرنگترین شێوەکانی وزەی ئاوییە بتوانرێ لە ڕووی تەکنیکییەوە پراکتیك بکرێن ، چاوگێکی مەزن و گرنگە بۆ وزەی هەرزان ، سوڕی ئاو لە سروشتدا وزەیێکی قەت لەبن نایەت ، وێستگەکانی کارەبایی چونکە هەمیشە ئامادەن و دەتوانرێ بەکاربێنرێن و زاڵ بن بەسەری داو بەسەر ئاوەکە گرنگترین برگەی سیستەوزەن لە تەواوی جیهاندا[89].

لە کوردستاندا زۆر بەنداو هەیە وزەی کارەباییان لێ بەرهەم دەهێنرێت ، وەکو بەنداوی دوکان لەسەر زێ ی بچوك و دەربەندیخان لەسەر زێ ی سیروان. شایانی باسە لە زانا موسڵمانەکان پێشەوا (جەعفەری سادق) فەرموویەتی : (ان الماو الڕى النار يستگيع ان يوقدها بفچل العلم) (الامام الصادق/ مجموعه من العلماو المستشرقين/ ل:١٢٧ . واتە : ئەو ئاوەی دەتوانێ ئاگر بکوژێنێتەوە لەسایەی زانست دەتوانێ ئاگر هەڵبکات ، لێرەدا ئەم زانایە ئاماژە بە کرداری ئۆکسجینی هایدرۆجینی دەکات وەکو لەکاتی لەحیم کردنی ئاسن و پۆلادا.

وزەی بـــــــــا :

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦ ﴾

هەوا لە ئاسمانی ژینگەدا هەمیشە لە جوڵەدایە ، هۆکارەکەی ناچۆنییەکی دابەش بوونی پاڵەپەستۆی هەوایە لە ئاست ئاسۆیی دا ، لەکاتی پەستانێکی بەرزی هەوادا لەناوچەیێکی دیاری کراودا تەوژمی هەوایی بەئاراستەی ناوچەکانی پەستان نزمدا ڕوودەدات ، بەمەستی هاوسەنگی پەستان لە هەموو ناوچەکاندا ، جیاوازی فشارو

---

[89] الانسان والبيئة / ل : ٩٠- ٩٤ بەکورت کردنەوە.

پەستانەكان كە بە (كربدينت) ی پەستان (الضغط) ناسراوە هێـزی بنەمايـە جولەی هەوا پەيدا دەكات ، جياوازی پەستانەكان لە بناغەدا لە تيشكدانەوەی خۆری (الاشعاع الشمسي) يەوە سەر هەڵدەدات .

گەر گەرديلەكانی ئەو هەوايە تووشی هێزی (كربدينت) ی پەستان بوو ، ئەو هەوايە تەنيا بە ئاڕاستەی ئەو هێزەدا دەجوڵێت ، بەڵام لێرەدا هێـزی تـر هەيـە كـار دەكاتـە سەر گەرديلەكانی ئەو هەوايە ، ڕێرەوی هەوا لـە ڕێـرەوی (كربـدينت) ی ئـەو فشارە دەردەچێت ، ئەمە هێزی بەردەوامی جوڵەی زەمينەو هێـزی هانـدەرە لەناوەڕاسـتداو بەرهەڵستی لێك خشان و هێزی كێشكردنی زەوی دەكات .

هێزو وزەی ميكانيكی كەرستە جولاوەكانی هەوا لە ماتۆڕەكانی هەوائی دا بەكاردێت ، لە توانايدايە تەواوی مەكينـەكان و ئامرازەكانی وەكـو وێسـتگەی كارەبـايی هـەوائی و وێستگەكانی ترۆمپا (الضخ) و ئاشی هەوايی و نمونەی تر بخاتە گەڕ ، وزەی با لـەو شـوێنانە زۆرە بەسـەر دەريـادا دەڕوانـن ، كـە بـەردەوام بايـان لێ هەڵـدەكات ، وەكـو بەريتانيا و ڕوسياو ، ئۆكرانيا و هۆڵەنداو ... هی تر.

لە بناغەدا دوو جۆر مەكينە بۆ دەست بەسەر داگرتنی يا (الريح) بەكاردێنرێت ، كە بريتين لە بزۆكەكان (المحركات) و وێستگەی هەوايی ، توانای ئەو بزۆكانە (٥-١٠) كيلۆ واتە ، وەكو ماتۆڕێكی فرە پانكەو شانە دارەو بە هێواشی خول دەخـوات ، يـان وەكـو مـاتۆڕێكی دوو سێ پـەرە لـە تـيرەی (١٠-٢٠)م دا لەسـەر بـورجێكی (٤٠)م دا دەنـرێ ، خێرايی بـا لـەوێ (٤)م ە لـە خولەكێكـدا ، هەرچی وێسـتگەی كارەبـايی هەواييـە لـە مەكينەی تاك پەڕە پێك دێ بازنەيی يە تيرەكەی (٥٠)م دەبێت ، ئەم جـۆرە مەكينـە بزۆكە لە ڕوسيادا دا دەنرێ ، لەبەرزی (١٠٠)م دا بايەكی پێويستی بە (٨-٩) هەيـە لـە خولەكێكداو لە توانايدايە (٥٠-١٠٠٠) كيلۆ وات وزە پەيدا بكات [٩٠].

---

[٩٠] الانسان والبيئة / ل:٩٤- ٩٦.

**سووتەمەنی (الوقود)**

﴿ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ ، واتە : خۆت بپارێزە لەو ئاگرەی سووتەمەنیەکەی مرۆڤ و بەردە !

(ابن عباس) دەڵێ : مەبەست لەو بەردە گۆگرد (کبریت)ە ، وەك لە (الدر المنثور / السیوطي) دا باسکراوە ، دیسان لە (تفسیر الطبري) دا هەروەها قَالَ ﴿ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا فَإِذَآ أَنتُم مِّنۡهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ واتە : ئەو خوایەی لەداری سەوزدا ئاگری بۆ داناون (وەك ماتە وزە) ، مەبەست لەداری سەوز (کلۆرۆفیلە) ، ئاگر وزەی خۆرو کاربۆن و هایدرۆجینە ، وە (ئاگر) مەبەست لە خەڵوزە ، کە لە سووتاندنی دارو تەختە ئامادە کراوە ، یان بە سروشتی ئامادەبووە و بە ماتە وزە ئەو وزە کیمیایی یەی تێدا حەشاردراوە ، ﴿ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ﴿٥﴾ ﴾ ، واتە : ئاگری خاوەن سوتەمەنی .

(ام هولی) دەنوسێ : سووتەمەنی کەرستەی سروشتی یە یان پیشەسازی خەڵوزە ، لەکاتی سووتاندنی دا لەناو ئاگردانەکاندا بڕێکی گەورەی گەرمی دروست دەکرێت ، سووتەمەنی بۆتە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی وزەی گەرمی لە پیشەسازی و ماڵ و سەرچاوە خزمەتگوزارییەکاندا .

بەهۆی سووتان وزەی کیمیایی شاراوە لە سووتەمەنی (الوقود) دا بۆ وزەیێکی گەرمی دەگۆڕێ ، واتە :- بەهۆی ئۆکساندن ، کە ئۆکسجینی بەرەڵای هەوا بەشداری تێدا دەکات ، یەکەم مەرجی سووتاندن بوونی هەوایە ، بەهۆی چاك نەسووتان گازە دۆکەڵێیەکان پەیدا دەبن و دزەی دەکەن و کاری خراپ دەکەنە سەر ژینگە ، لەوانە (ئۆکسیدی کاربۆن) و (ئۆکسیدی گۆگرد – کبریت) و گەردیلەی تری نەسووتاوی ئەو سوتەمەنیەو هاوشێوەی ئەو .

ئەو گەرمی یەی لە سووتانێکی تەواوەوە پەیدا دەبێ لە (١) گرام سووتەمەنی ڕەق یان شلدا ، یان (١م$^3$) سووتەمەنی گازی بەگەرمی سووتاو دەناسرێت ، جۆرەکانی سوتەمەنی رەق هێشتا چاوگی وزەی بەکارهاتووی مرۆڤن ، یەدەگی سووتەمەنی ئاسایی بەپێ ی ڕای زانایانی سۆڤیەتی (کۆن) لەساڵی (١٩٦٨) دا نزیکەی (١٢٣٩٤ × ١٠)٩ تەنە لە سووتەمەنی ڤیاسی ، هەر تەنێکی سووتەمەنی ڤیاسی = (١تەن – ٧×١٠٦) ، هەرچی ئەو یەدەگەیە توانای دەرچوواندنی هەیە (٢٤٨٤ × ١٠٩) تەن دەبێ لە سووتەمەنی ڤیاسی دا[٩١].

[٩١] الانسان والبيئة / ل:٩٦–٩٧.

## بەشی شەشەم

# مرۆڤ و پەیوەندییە قووڵەکانی نێوانیان

ئیعجازی ٤٠ پشت بەستنی مرۆڤ بە ژینگە :

ئیعجازی ٤١-٤٢ چاودێری کردنی ژینگەو پاکژ ڕاگرتنی لە ڕووی فیقهی یەوە :

ئیعجازی ٤٣ و ٤٤ پەیوەندییە سەلبی و ئیجابییەکانی نێوان مرۆڤ و ژینگە :
سەرهەڵدانی نەخۆشی شارستانییە نوێیەکان :

ئیعجازی ٤٥ کێشەی دەروونی و پێوەرەکانی جوانی ژینگە :

ئیعجازی ٤٦ هەست کردن بە پشوودان و حەسانەوە لەژینگەدا :

قورئانی پیرۆز لە چەندان ئایەتدا ئاماژە بە پشت بەستنی مرۆڤ بە سروشت دەکات ، ئامـاژە دەکـات سروشـت پەیوەنـدی زۆری بـە لـەش و دەروون و هەسـت و نەسـتی مرۆڤەوە هەیـە ، سروشـت چاوگی ژیـان و پشودان و حەسانەوەی مرۆڤـە و ئـارام و هێمنی بە دڵ و دەروونـی دەدات ، لـە سەوزایی و هـاژەی ڕوبـارو دەنگی بولبـول و ، هەوای پاکژو بڵندایی شاخەکان و ... هتد.

﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ۝١٠ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ۝١١ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ۝١٢ ﴾ ، واتـە : زەوی بـۆ خـەڵکی دانـاوە میـوەو دارخورمای چەکەداری تێدایە ، وە دانەی کادارو ڕەیحان.

﴿ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ۝٦ ﴾ واتە : پێمان ڕوانـد باخچە جوان و دڵگیرەکان.

﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا ۝٨١ ﴾

﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدٗا لِّلَّهِ وَهُمۡ دَٰخِرُونَ ۝٤٨ ﴾ النحل ٤٨ ، واتـە : بـۆ سـەیری ئـەو شـتانە ناکـەن خـوا دروسـتی کردوون سێبەریان ڕاست و چەپ لار دەبێتەوە و کورنوش بۆ خودا دەبەن .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان دەکات بە پاکژی ژینگە (طيبوا ساحاتكم ، فان انتن الساحات ساحات اليهود) (رواه الطيالسي) واتە : گۆڕەپانەکانتان پاکژ ڕابگرن ، بۆگەنترین شوێن گۆڕەپـانی جولەکەکانـە ، وە فەرموویـەتی : (ان الله طيـب يحـب الطيـب ، نظيـف يحـب النظافـة) (رواه الترمـذی) ، خـوا باشـە باشی خۆش دەوێ ، خاوێنـەو خـاوێنی خۆش دەوێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی سەیر کردنی ژنی خۆت گەر بەلاتەوە جوان و قەشەنگ بێ ، سەیرکردنی باخچەو سەوزایی توانای بینایی زیاد دەکات (النظر الى المرأة الحسناء والخضرة يزيدان في البصر) (رواه ابو نعيم في الحلية )، لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە بە خۆشەویستی دەکات ، بەهۆی سەیرکردنەوە یان خوای گەورە سەبارەت بە باخچەو باغ و دارستانەکانی بەهەشت دەفەرمووێ : ﴿ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَـٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ ، واتە : پیاوان و ژنەکانیان لەژێر چەند سێبەرێکدا لەسەر کورسی و قەنەفەکان دادەنیشن . کەواتە : ئەی ئادەمیزاد تۆ لە تواناتدایە زەوی بکەیە باخچەیێ لە باخچەکانی بەهەشت ، یان بیکەیە دۆڵێ لە دۆڵەکانی دۆزەخ .

﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ... ﴾

، واتە : مژدە بدە بەوانەی بڕوایان هێناوەو کرداری باش دەکەن ، چەند باخچەیێکیان هەیە ڕوبارەکانی بەژێردا ڕەت دەبن .

قورئان ئاماژە دەکات ، مرۆڤ کار دەکاتە سەر ژینگەو ژینگەش کار دەکاتە سەر مرۆڤ لە ڕوی ئیجابی و سەلبییەوە .

خودا دەفەرمووێ : (ظهر الفساد في البر والبحر بما كسبت ايد الناس) (الروم: ٤١) ، واتە : خراپەکاری و کاول کاری وشکانی و دەریایی دەرکەوت بەهۆی کردەوەکانی مرۆڤ ﴿ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ ﴿٥٨﴾ ﴾ واتە : شاری پاکژ ڕووەکەکانی بەویستی پەروەردگاری دەڕوێنێ ئەو شارەی پیسە بە دەگمەن نەبێ ڕووەك ناهێنێت .

﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّـٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَـٰرًا ﴿١٢﴾ ﴾ ، واتە : داوای لێبوردن

له پەروەردگارتان بکەن ئەو زۆر لێ بوردەیە ، ئاسمان ڕێژنە بارانتان بۆ دەبارێنێ ، سامان و منداڵتان پێ دەدات ، باخچەو ڕەزتان بۆ دروست دەکات و ڕوبارەکانتان بۆ دروست دەکات ، کەواتە : مرۆڤ پەیوەندییەکی (سایکۆ – فیزیایی) یان پەیوەندییەکی جەستەیی و گیانی لەگەڵ ژینگەو بوونەوەردا هەیە ، لە کتێبی (الحوارالمتمدن– کیمیاء الحب / الفتاح دیبون) دا باسێ بەناوی (کیمیاء الحب) هاتووە : (کۆمەڵێ توێژەر لە پەیمانگای ماساشوستن / ئەمریکا) بۆیان دەرکەتووە دیمەنی جوان مێشکی مرۆڤ دەخاتە خۆشیەوە بە وێنەی کەسی برسی بۆ خواردن و کەسی نەخۆش بۆ دەرمان ، کەسی جوان کاریگەری لەسەر مێشك و دەماخی مرۆڤ بەجێ دێڵێت ، ڕوانین بۆ دیمەنی جوان ناوچەی بینین لە مێشکدا چالاك دەکات .

## پشت بەستنی مرۆڤ بە ژینگە :

﴿ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٣﴾ ﴾ [illegible] ٣٠ - ٣٣ ، واتە : پاشان خودا زەوی بە شێوەی هێلکەیی دارشت ، ئاو و لەوەڕی لێ دەرهێنا چیاکانی تێدا چەقاند ، بۆ سوودی ئێوەو ئاژەڵانتان.

لێرە قورئان ئاماژە دەکات وەکو (ام . هولی) و یارانی دەنووسن : پەرەسەندنی جۆری مرۆیی هەر لە قۆناغە درێژەکانی مرۆیی دا ڕووی نەداوە ، بەڵکو بەر لەمەش بەر لە چەند وەچەیێ ڕوویداوە ، ئەمەش لە ماوەی ئەو بارودۆخە سروشتی یەدا باڵی بەسەر گۆی زەوی دا کێشاوە .

ئەو بارودۆخە بوو پێکهاتنی مرۆڤ و ڕێڕەوەکانی پەرەسەندنی خودی خۆی لە ڕووی جەستەیی و دەروونی و کۆمەلایەتی یەوە دیاری کرد ، لەبەر ئەوەیە مرۆڤ لەگەڵ ژینگەکەیدا یەکەی (سایکۆ فیزیایی) بە تەواوی پێك دێنێت ، مرۆڤ لە ڕێگای چالاکی هەستیارەکان و سیستەمی دەمارییەوە پەیوەست دەبێ بە ژینگەی دەوروبەرییەوە ،

ژینگەش لە ڕووی سەلبی و ئیجابیەوە کاردەکاتە سەر مرۆڤ ، لە شوێنی کارکردنیدا ، لەجێگاو ڕێگای دا ، لە شوێنی هاتوچۆی خەڵکی دا ، لەناو شارو دەرەوەدا ، وەکو ناوچە گەشتیارییەکان و کوێستانەکان و هاوینە هەوارەکان و سروشتی کراوە ، ئەو کاریگەرییە تا ئیمڕۆ شوێنەواری دیارەو بۆتە جێگای بایەخی مرۆڤی ئێستا[٩٢] .

وشەی (ژینگە) وشەیێکی قورئانییە وەکو باسکرا ﴿ وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا ﴾ ، واتە : ئیبراهیممان لەناوچەی کەعبەدا نیشتەجێ کرد ، هیچ هاوبەشی بۆ من پەیدا ناکات، ﴿ وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِن بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا ﴾ ، واتە : خوا لەزەوی نیشتەجێ کردوون لەدەشتایی یەکانی کۆشك دروست دەکەن و لەچیاکانی دا ماڵ دا دەتاشن.

(بوأ) (بیئە) ئاماژەن بۆ ژینگەی مرۆڤ ، دەشتایی و چیاکان دوو ژینگەی مرۆڤن بۆ دروست کردنی کۆشك و داتاشینی چیاکان و دروست کردنی کۆشك لە بڵندایيەکانی دا بۆ هاوینەهەواری و بەخێو کردنی ئاژەڵ و گیانداران و نیشتەجێ بوون و ڕەوەندی .

گەر بڕوانینە کوردستان ﴿ وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ ﴾ (کورد) یان گوتی یەکان ناوی گەلێکی دێرینە (ستان) واتە : شوێنی نیشتەجێ بوونیان ، خوداوەند ژیانی سەرەتایی لە کوردستاندا دروست کرد ، دووبارە بوونەوەی ژیانیش هەر لە کوردستان بووە ، چونکە خۆشترین شوێنەو ناوچەیەکی ستراتیژی و دەوڵەمەندە ، خاڵی بەیەکتر گەیاندنی خۆرهەڵات و

---

[٩٢] الانسان والبيئة / ل:١٦.

خۆرئاوایە! ﴿ قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ ﴾ واتە : ئەی نوح (عليه السلام) بڵێ : خوایە لە شوێنەکی پیرۆزو پڕ پیت و بەرەکەت دامبەزێنە .

وەکو نووسەرانی نامیلکەی (دليلك الى اقليم كردستان) نوسیویانەو لە ڕابردوودا باسکرا : هەرێمی کوردستان ئەدگارێکی جوگرافی و ژینگەیی تایبەتی خۆی هەیە کردوویەتی بە جوانترین ناوچەی هاوینە هەواری و گەشتیاری و ڕەوەندی لە ناوچەکەدا ، سروشتی بەرزو نزمییەکەی چیا بەرزو دۆڵە قوڵەکانی و دیمەنە سەرنج ڕاکێشەکانی و ئاوی زۆر و پاکژی و خاکی داپۆشراوی بە ڕووەك و درەختی هەمەجۆرو کەشە ساف و سامانۆ و فێنکەکەی ، هەموو ئەوانە کوردستانی کردۆتە هاوینە هەوارو کوێستانێکی قەشەنگ لەناوچەکەو جیهاندا .

هەرێمی کوردستان دەکەوێتە بەشی باشووری خۆرئاوای کیشوەری ئاسیا لە نێوان هەردوو بازنەی پانی ٣٢,٤٥ / ٣٧,٢٢)ی باکووری گۆی زەمینەوە ، هەردوو هێڵی پانی (٤١,٣٢ / ٤٥,١٩) ی خۆرهەڵاتی گۆی زەمینەوە ، ئەو جێگایە گرنگی یەکی ئیستراتیجی بە کوردستان دەدات ، بەخاڵی بە یەکتر گەیاندنی خۆرهەڵات و خۆرئاوا دادەنرێت .

ڕووبەری هەرێمی کوردستان / عێراق بە (٩١٠٠٠)کم² مەزندە دەکرێت و ژمارەی دانیشتووانی بە (٦) ملیۆن زیاتر دادەنرێت [٩٣].

گەر سەیری قەڵای هەولێر بکەین بۆ زیاتر لە (٦٠٠٠) ساڵ دەگەڕێتەوە شوێنەکەی دێرینەو شێوەی بازنەیی وەردەگرێت و بە جۆرەها هونەری جوان ماڵەکانی ڕازێنراونەوە. یان بڕوانە قەڵای (دیوین) لە گوندی دیوین (٥٠کم) لە هەولێر دوورە ، بڕوانە بانەمان (قەڵای خانزاد) لەسەر ڕێگای هەولێرو هاوینە هەواری (صلاح الدين) ، بڕوانە چیای هەریر چۆن داتاشراوە ، ئەو داتاشینە درێژی (٢,٥) م بازنەیێکی درێژ

[٩٣] دليلك الى اقليم كردستان / سردار محمد عبدالرحمن / هوشيار محمد امين خوشناو/ ل:٧.

کۆڵە دەوری داوە شێوەی مرۆڤێ پیشان دەدا ، جل و بەرگی شاهانەی پۆشیوەو کلاوێکی لەسەرەو ڕمێکی بەدەستەوەیەو دەستی ڕاستی بۆ زەوی ڕاکێشاوە ، بەپێ ی هەندێ ڕاپۆرت بۆ سەدەی یەکەمی بەر لە زایینی دەگەڕێتەوە ، یان گردی بیستون (٢٩) کم لە قەزای سۆران دوورە ، بڕوانە داتاشراوی سەنحاریب لای بەستۆڕە (٢٠) کم لە هەولێر دوورە ، هەموو ئەوانە مانای بەرزی ئەو ئایەتە پیشان دەدەن لە ڕوانگەی ژینگەو شوێنەوارەوە ، یان بڕوانە ئەشکەوتی هەزار مێرد (١٣) کم لە خۆر ئاوای سلێمانی یەوە ، دووەم ناوچەیە لەکۆنی دا بۆ (٥٠) هەزار ساڵ دەگەڕێتەوەو ناوچەیێکی شارستانی بووە .

ئەشکەوتی (زەرزی) دەکەوێتە خۆرئاوای سلێمانی ، ناوچەیێکی دێرینە مرۆڤی چەرخی بەردینی تێدا ژیاوە ، لەسەدەی بیستەمدا زانایانی خۆرئاوا ئێسکی گیانداری سەردەمی بەردینی تێدا دەدۆزنەوە .

چیای (قسقایان) لە زنجیرە چیاکانی پیرە مەگرون داتاشراوە گۆڕی سێ لە پادشایانی میری تێدایە ، دیسان وێنەی کۆنی تێدا کێشراوە ، (٨) م بەرزەو پێیژەی بۆ سەرکەوتن بۆ دانراوە ، یان بڕوانە (داتاشراوی میرقولی) لە نزیک گوندی زێوە بەرزی (٢)م بڕوا وایە بۆ (٣٠٠٠) ساڵ بگەڕێتەوە ، بڕوانە داتاشراوی دەربەندی گاوڕ بۆ (٤٠٠٠) ساڵ دەگەڕێتەوە ، (٤٠) کم لە سلێمانی دوورە لە دۆڵی کوشان ناوچەی قوبی قەرەداغ ، بڕوانە (دلیلك الی اقلیم کردستان) بە زۆر ناوچەی دێرینی کوردستانت ئاشنا دەکات ، ئەم ناوچانە هەر لە سەردەمی ئادەم و نوحەوە (سەلامی خوایان لەسەر) کوردەکان لەناوی دا ژیاون و هەمیشەش شوێنی کێشە بووە لەنێوان ئەوان و داگیرکەراندا ، وەکو سۆمەرییەکان و بابلییەکان و ئاشوورییەکان و مەغۆلەکان و تورکەکان و عەرەبەکان و فارسەکانەوە ، دواجاریش جەنگی مەسیحی دەجال لەوێ ڕوودەدات و ئالا ڕەشەکان بەرەنگارییان دەبنەوە و دەیشکێنن!

(اولئک قوم یأتون من المشرق حردین معهم رایات سود ... شعارهم اقبل اقبل یعني بکوش بکوش) رواه نعیم بن حماد/ ٥٧٢. دەرکەوتنی ئالاّ ڕەشەکان نیشانەی مەهدییە لەگەڵ یارانیدا ، پێغەمبەر (ﷺ)کوردستان بەرز دەنرخێنێ و ئاماژە بە ژینگەی ئەو ولاّتە دەکات (الجنة بالمشرق) رواه الفردوسی ، واتە : بەهەشت لە خۆرهەلاّتە (المناوي) لە (شرح الجامع الصغیر) دا لە (فیض القدیر) دا لە سەر ئەم فەرموودەیە دەنووسێ (مەبەستی ڕواڵەتی خۆرهەلاّتە وەکو عێراق و ناوچەکانی سەر بەئەوێیە ، چونکە پڕ لە باخچەی چڕوپڕە..).

ئاماژە دەکات کوردستان ناوچەیێکی شاخاوی و بەفراوییە بێ ئەوەی ئەوێ ی بەرچاو کەوتبێ و شوێنی هێزی خوایە کە دواجار دینی ئەو زیندو دەکەنەوە (ثم تطلع الرایات السودمن قبل المشرق فیقتلونکم قتلا لم یقتله قوم ، فاذا رایتموه فبایعوه ولو حبوا علی الثلج فانه خلیفة الله المهدي) رواه ابن ماجة وصححه ابن کثیر. پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی کردووە کورد خاوەن هێزو توانای جەستەیی و ئازایەتین و دین پەروەرن ، وەکو لە چەندان ئایەتدا ئاماژەیان بۆ کراوە ، بێگومان هۆکارەکەشی بۆ ماوەیی و ئاو و هەوایە .

خوای گەورە فەرمووییەتی ﴿ قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ ﴾ الفتح: ١٦ ، واتە : بەعەرەبە دواکەوتووەکان لە جەنگدا بڵێ : داهاتوو بانگێش دەکرێن بۆ گەلێك خاوەن هێزن .

لە (تفسیر ابن کثیر)دا هاتووە لە (ابو هریرة) وة (ستدعون الی قوم اولي بأس شدید) قالَ : (هم البارزون) ، دیسان (ابو هریرة) گێراویەوە : (تقاتلوا قومانعالهم

الشعر) (رواه مسلم) ، واته : جەنگ لەگەڵ گەلێ دەکەن (نەعل) کاڵە بە موون ، وتی : (هم البارزون يعني الاكراد) بەو پێیە ئەوان کوردەکانن[٩٤].

(مونتسکیو) لە کتێبی ڕوحی یاساکان (روح القوانين – spirtroflaws) دا دەنووسێ : ئاو و هەوا هۆکارێکی جوگرافی گرنگە ، ئەوانەی دانیشتووانی وڵاتە ساردەکانن لەشیان بەهێزترو ئازاو ڕاشکاوترن و دوورترن لە گومان ، پێچەوانەی خەڵکانی ناوچە گەرمەکان لاوازو تەمبەڵن.

بەو پێیە قورئان کورد بە ئازاو چست و ڕاست و ڕەوان ناو دەبات ، بەڵام (اعراب) لە ناوچە گەرمەکاندا بە تەمبەڵ و دواکەوتو لە غەزا ناو دەبات ، (ئەلین سمبل) لە کتێبەکەیدا (کاریگەرییەکانی ژینگەی جوگرافی – influences of geographic environment) کە لە ساڵی (١٩١١)دا بڵاوی کردەوە باسی کردووە : مرۆڤ بەرهەمی ڕووی زەوییە ، ئەمەش مانای وانییە تەنیا کوڕی زەمینەو کوڕی خاکەکەیەتی ، بەڵکو مانای وایە خاك شیرو خواردنی پێ داوەو جەمەکانی بۆ دیاری کردووەو بیرەکانی ئاڕاستە کردووە ، بەرەنگاری دژوارییەکانی کردۆتەوە ، کەلەشی بەهێز تر دەکات و هزری تیژ تر دەکات ، کێشەکانی جوتیاری و ئاودانی پێ دەدات ، دوایی چارەی کێشەکانی بەگوێچکەدا دەچرپێنێت ، چۆتە ناو گۆشت و ئێسقان و گیان و هزرییەوە ، لەچیاکاندا قاچەکی ماسولکە ئاسنینی پێ داوە بەچیاکاندا سەردەکەوێ ..

(مێجەرسۆن) دەربارەی کۆمەڵناسی (سیسیۆلۆجیا)ی کورد دەڵێ : (ئێمە کاتێك باس لە بەشی ئاسیای خۆرئاوا دەکەین تووشی زۆر گۆڕان و داگیرکردن هاتووە لەلایەن ئەو سوپایانەوە لەمێژووی خۆرهەڵاتدا ناوبانگیان دەرکردووە لە ئاشوورییەکان و پرسییەکان و یۆنانیەکان و ڕۆمانەکان و فارسەکان و عەرەبەکان و مەغۆلەکان و

[٩٤] تفسير ابن كثير / ج٤ / سورة الفتح / ١٦.

تورکەکان ، دەبینی کوردەکان تاکە گەل بوون لە ناو گەلانی ناوی بەردەستیان بون و بەرەنگاری ئەو دەولەتانەبوونەوەو مالّ و خوێنی خۆیان پاراستووە ، شایانی ئەوەن شانازی بە ئاری بوونی خۆیان بکەن ، چونکە کەس ناتوانێ نکۆلّی لەوە بکات ئەوان ئاری تەواون و پارێزەری چیاکانن و خاوەن زمانن[95] .

(د.روس) دەلّێ : (سروشتی کورد لەسەر جەنگ ڕاهاتووە چونکە هەر لەسەر (لانکە) ڕاهێنان دەکات)! بەو پێیە کورد کوڕی کوردستانەو بەخاك و ئاو و هەواو خۆراکی ئەو ولآتە گۆش بووەو کاری تیّ کردووە .

(ام هولی) دەنووسێ : مرۆڤ بەر لە هەموو شتێ بۆ ئەوە پشت بە ژینگەی ماددی دەبەستێ پێویستی بایۆلۆجی دابین بکات ، مرۆڤ لە (٢٤) کات ژمێردا (٢٠)م$^3$ هەوای ئۆکسجین و (٢) لیتر ئاو و (٠,٧) کیلۆ گرام خواردن بەکاردێنێت ، مرۆڤ تەنیا ٥ هەفتە دەتوانیّ بیّ خواردن بژیت و (٥) ڕۆژ بیّ ئاو بژیت و (٥) خولەك بیّ هەوا بژیت !

گرنگترین پێویستی ژیانی مرۆیی لە کرداری نویّ بونەوەی ئۆکسجین لەخوێندا خۆی حەشار دەدات ، ئەو کردارەش لەدەوری خۆی دابین کردنی هەوای پاکژی دروست فەرز دەکات ، پاشان خۆراك و ئاو ، دوایی گەرمی و جولّەو دەردان ، دەکریّ پێویست بوون بە پشوودانیش بخرێتە سەر ، لەلایەکی ترەوە مرۆڤ پشت بە سروشت دەبەستیّ بەمەبەستی دابین کردنی بەکارهێنانی چالاکی کرداری و هێنانەدی مەبەستەکانی ، چالاکی کرداریش بە ئاستی چالاکی ئابوری و تەکنەلۆژیاوە بەندە[96] .

---

[95] الاسس النفسية والاجتماعية / هاشم عقراوي/ سەیر بکە.

[96] الانسان والبيئة / ل:١٦- ١٧.

قورئـانی پـیرۆز ئامـاژه بـه ژینگـەو پەیوەندییـەکانی دەکـات کـاتێ فەرموویـەتی ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ۝١ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ۝٢ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ۝٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ۝٤﴾ ، لێـرەدا قورئان ئاماژه به ژینگەی قورەیش دەکات کە ژیانیان لەسەر چالاکی بازرگانی بەنـد بـووه ، پاشـان قورئـان ئامـاژه بـه گرنگـی خـۆراك و ئـاسـایش و خواناسـی دەکـات بـۆ پاراستنی ژینگەو تەندروستی مرۆڤ لـه ڕووی فسیۆلۆجی و دەروونـی و کۆمەڵایـەتی یەوه ، هەموو ئەو توخمانە کار دەکەنە سەر گەشەپێدانی کۆمەڵگا زوو یان درەنگ .

**چاودێری کردنی دروستی ژینگەو پاکژ ڕاگرتنی له ڕوانگەی فیقهی یەوه:**

گـەلێك ئایـەت و فـەرمـوودەی هەیـه فـەرمان دەکـەن بەژینگـه پـارێزی لەهـەموو دۆخەکاندا ، له دۆخی ئاشتەوایی داو له دۆخی جەنگدا﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَاۚ﴾ ، واته : خراپەکاری و تێك دان له زەویدا ئەنجام مەدەن دوای چاك سازی کردن لەناویدا .

﴿وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ۝٢٠٥﴾ ، واتـه : کـاتێ ڕۆیشت و پشـتی کـردەوه ڕۆیشت بەزەویـدا تـا خراپەکاری تێدا بکـات و کشتوکاڵ و وەچەو مـرۆڤ لـەناو ببـات ، خـودا خراپـەکاری خۆش ناوێت .

(د. وهبة الزحيلي) له کتێبی (والفكـــر المعاصـــر مهيضــايا فقق) بابەتێکی گرنگی لەسەر ژینگەپارێزی نووسیوەو دەڵێ : (ژینگه پەیوەسته بـه مرۆڤـەوه ، گـەر ژینگه پاکژو باش بوو مرۆڤیش ساغ و دروست دەبێ ، گەر ژینگه پیس و چەپەڵ بوو مـرۆڤیش پـیس دەبـێ و تووشـی زۆر نەخۆشـی و خەفـەت و تەنگـژەی ژیـان دەبـێ و کۆتایی به ژیانی دێنێت ، پێویسته لەسەر مرۆڤ لەسەر ژینگه ئەمیندار بێ ، چونکه

ڕاسپاردەیە بەملیەوە ، یەکەم کەس کە تووشی زیان دەبێ ئەنجامی تێك دانی ژینگە وە لە لەلایەن مرۆڤەوە خودی خۆی دەبێت . کەمتەرخەمی کردنی لە چاودێری کردنی ژینگەدا و پیس بوونی زۆر پەتاو نەخۆشی پەیدا دەکەن ، ژیانی دەخاتە مەترسییەوە .

نەبوونی هۆشیاری ژینگەیی و پەی نەبردن بەمەترسییەکانی ژینگە یەکەم ستەمە مرۆڤ لە خۆی دەکات ، بەهۆی سەرەڕۆیی و گوێ نەدان بەکارە هزرییەکانی ، لێرەدا زۆر ستەمکاری هەیە زادەی دەستی مرۆڤەو پاشان تالآوەکەی دەچێژێت ، ئەمەش سروشتێکە پێویستی بە (پەروەردەی ژینگەیی) و ئامۆژگاری هەیە تا مرۆڤ نەخاتە زەلکاوی ڕیسوایی و نەخۆشی و مەرگەوە ، قورئان هۆشیاری داوەتە مرۆڤ لەدەست سەرەنجامەکانی خراپەکردن لەگەڵ (خود – زات) داو سپڵەیی کردن لە ڕاست بەهرەکانی خواداو بێ نمەکی نواندن و خراپەکاری کردن لە ڕاستایندا ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ واتە : گەر بەهرەکانی خوا بژمێرن ناتوانن ، مرۆڤی بێ بڕوا ستەمکارو نا سوپاسگوزارە[٩٧] .

## ژینگەو شارستانی (المدنیة ) و ژیاریی ( الحضارة )

(شارستانی) ئەو هۆکارو ئامرازانەن یارمەتی دەرن بۆ چارەکردنی کێشەکانی ژیان و ئاسانتری دەکات و گشتی گرە ، پەیوەستە بە هەموو گەلانەوەو پەیوەندی بە ئایدۆلۆژیاو بڕواوە نیە  ژیاریی (الحضارة) : کۆمەڵە چەمکێکە لەبارەی ژیانی دنیاو ڕابردوو داهاتووی ، تایبەتە بە هەموو گەلێکەوە ، ژیار دوو ڕەهەندی هەیە ، ڕەهەندێکی گیانی و ڕەوشتی و ڕەهەندێکی ماددی کە شارستانییە[٩٨] .

---

[٩٧] قضایا الفقه والفکر المعاصر / د.وهبة الزحیلي /ل : ٧٠٧- ٧٠٨.

[٩٨] قضایا الفقه والفکر المعاصر / د.وهبة الحیلي /ل : ٧٠٨.

شارستانی و پێشکەوتنی ئاوەدانی و ژیاری ژیان و مرۆڤ : بریتین لە دووکرداری بەرهەمی مرۆڤ ، ئەم دووانە حوکمێکی ورد بەسەر هەڵس و کەوت و ڕەفتارەکان و چالاکییەکانی مرۆڤدا دەکەن ، بە ئەندازەی وردەکاری و پێشکەوتن لە شارستانی و ژیاردا ، مرۆڤ بە هەردوو توێ ی ماددی و مەعنەوییەوە دروستکەری شارستانییە ، شارستانی ماددی هێمای شانازییەو وێستگەی سەیر کردنی جیهانە ، لەجیهانی شارستانی دا یان لە تایبەتمەندێتی شارستانی دا ، چەندە مرۆڤ لەناوبەری جوانی و تەواوێتی ژینگە بێ و لەناوی ببات ئەوەندە ڕەفتاری ناشارستانیانەو نا ژیارانەیە ، بۆ نمونە : گەر مرۆڤ هەندێ پیسایی بینی لەسەر گۆشەو کوچەو لێوارێ کەوتبوو ، یان لەشوێنە گشتییەکان و باخچە و پردە و ڕێگاو بانەکاندا ئەوە دانیشتووانی ئەو دەڤەرە دوورن لە شارستانی و ژیاری ، بەڵکو دوژمنی شارستانیەتن ! پاکژی و ڕێکی بە هەموو شێوەکانیەوە پێوەری کەسایەتی و شکۆی مرۆڤن ، یان نیشانەی نزمی ئاستی رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و مرۆیی ئەون .

مرۆڤی ڕاست و شارستانی ئەو کەسەیە بەجوانی سروشت و پاکژییەکەی و باڵندە و باخچە و دارودرەختەکانی و پاکژی ئاوە سازگارو خوێ دارەکەی بەختەوەرو بەهرەمەند دەبێت ، ئەو کەسەی نەزانە ئەو کەسەیە بەهۆی پیسی و میکرۆب و کرم و جانەوەری دەوری و کەشی گەرمی یان زۆر ساردی تووشی بەلا و کارەسات دەبێت ، پاراستنی ژینگە لەمەترسییەکانی پیس بوون ئەرك و فەرزێکی ویستراوەو شەرع داوای کردووە ، چونکە ژیانی تەشریعی ساغ کەش و هەواییێکی لەبارو ژینگەیێکی پێویستە بۆ پیادەکردنی ئاین و شەریعەتی خودا.

گەر ژینگەیێ هەڵنەکەوێ بە تەواوی شەریعەتی خودای تێدا پراکتیك بکرێ ، دیمەنی دروستی ئیسلام بەبێ ئەوە دەرناکەوێ ، یان بەبێ زانینی ئەحکامەکانی حەلاڵ و حەرام کە لەلایەن خواوە دابەزیوە ، پەیوەست کردنی بە ژینگەوە هۆکارێکە بۆ سەرکەوتن یان هۆیێکە بۆ خراپەکاری و خراپەکردن ، مرۆڤ بیەوێ و نەیەوێ کوڕی ژینگەیە ، هەموو هۆیەکانی پێشکەوتنی گەلان وابەستەیە بە چاکی ئاو و هەواو

بارەکانی ژینگە ، بە پێچەوانەوەش هۆیەکانی هەرەس هێنانی گەلان ژینگە کاری تێ دەکات و ڕوانینی گەل لەبارەیەوە ڕەنگ دەداتەوە لە تاك و کۆمەڵدا ، مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە ژینگەکەی چاك دەکات و جوانی و قەشەنگییەکەی دەپارێزێ و نارێکی و خراپەکانی لادەبات ، بەلاَم بابای نەزان ئەو کەسەیە گوێ بە ژینگەکەی نادات و دەیکاتە مۆڵگەی پیسی و چەپەڵیەکان[99].

بێگومان چەمکی (ژینگە) و (ژینگە پارێزی) و (پیس بوونی ژینگە) و (پەروەردەی ژینگە) بۆ ئیسلام و پەیامەکەی چەند دەستەواژەیەکی نامۆ نین لەگەڵ دەرکەوتنی ژینگەزانی نوێ دا ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیداکردبون و خۆی لەگەڵدا گونجاندبێت ، بەڵکو ژینگەزانی خۆی وشە قورئانیەکان دووبارە دەکاتەوە :

١. ژینگـــــە (البيئـــــة) : ﴿ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ﴾

٢. پاکژی (الطهور) وشەیێکی قورئانیە ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ ﴾
﴿ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ ﴾

٣. پیسی (التلـوث) وشـەیێکی قورئانیـە ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ ، (الراغـب) لـە (المفردات) دا (الرجس) بە (القذر) و (النتن) مانا دەکات ، واتە : پیسی و بۆگەنی کە ئاماژەیە بۆ مۆڵگەی میکرۆب و بۆنە ناخۆشەکان .

٤. چاکسازی ژینگەیی ﴿ وَلَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ ﴾ الأعراف: ٥٦.

---

[99] قضايا الفقه والفكر المعاصر / ل:٧٠٨- ٧٠٩.

٥. پاراستنی ژینگه : وشەی (الوقاية) وشەيێكی قورئانييە لە چەندان ئايەتی قورئاندا لەژێر وشەی (التقوى)دا دووبارە بۆتەوە (الراغب) لە )مفردات) دا دەنووسێ : (وقى : واتە : پاراستنی شتێ لەو شتانەی زيانی لێ دەدەن.

(التقوى) خۆپاراستنە لە گوناه و تاوان و حەرام و نەخۆشی و هەر هۆكارێكی تری زيان بەخش.

خوای گەورە فەرمويەتی ﴿ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ ﴾
واتە : لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنين تا خۆی پێ پاكژ بكەنەوە .

(ڕێكخراوی تەندروستی جيهانی) سەلماندوويەتی بەكارهێنانی ئاو بۆ پاكژ كردنەوە نزيكەی (٩٠٪)ی ميكرۆبەكان لادەبات [100].

قورئان فەرمان بە غوسل و خۆ شوشتن و دەست نوێژ گرتن و سەرئاو كردن دەكات ﴿ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴾ التوبة: ١٠٨ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۚ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُوا۟ ﴾ المائدة: ٦.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی كردووە بە دەست نوێژ پێش و پاش نان خواردن : (الوضوء قبل الطعام حسنة وبعد الطعام حسنة) (رواه الحاكم) ، فەرمانی كردووە بۆ خۆشوشتن لە هەموو هەينييەكدا : (غسل الجمعة واجبة على كل محتلم) (رواه احمد) .

---

[100] الطب الوقائي في الاسلام / ل ٤٧.

فەرمانی کردووە ماڵ و کۆڵان و شەقام و ڕێگا و شوێنە گشتییەکان پاك بکرێنـەوە : (نظفوا فناءكم وساحاتكم) وەکو باسکرا ، قەدەغەی کردووە پیسایی و میز بکرێتە ئاوی مەندو ڕەوانەوە (نهى ان يبال في الماء الراكد) رواه مسلم ، هەروەها (نهى ان يبال في الماء الجاري) رواه الطيالسي ، لەڕوانگەی تەندروستی نوێ وە (ئاوی پیس و سـەر گوفـەك و پاشمـاوەی زبـڵ ، هـەموو ئەوانـە زۆر نەخۆشـی دەگوازنـەوە وەکـو (کولێراو تیفود و پاراتیفودو زەحیری و هەوی ریخۆڵەو بە لهارزیـاو ئیفلیجی منـداڵ (گێڕی) و سورێژەو ژەهراوی بوونی خۆراك و تەرا خوماو ئاوەڵەو ... هتد)[101] .

(ام هولى) دەنووسێ : ئەو زانست و هەوڵانەی پەیوەستن بە تەندروستی و پاکژییەوە بەشێکی زۆری تاووتوێیەکانی تەرخان دەکات ، بۆیە پەیوەندی کۆ ئەندامانی لەش بە ژینگـەی دەوریـیـەوە ، بەمەبەسـتی چـاك کردنـی ئـەو پەیوەندییـە لەبەرژەوەنـدی هـەردوو لادا ، ئـەو زانسـتەی بایـەخ بـە (تەندروسـتی و پـاکی و سـاغی) دەدات زۆر بەگرنگی یـەوە کاریگـەری (بایوفیزیـاوی) ژینگـەیی بـۆ سـەر مـرۆڤ تـاوتوێ دەکـات ، بەمەبەستی دروست کردن و دەوام دان بەدۆخی زیندەگی پێویست بۆ دابـین کردنـی تەندروستی مـرۆڤ و بەشـداری کردنێکـی بنیاتنـەر لـە پشـتگیری لێ کردنیـدا ، بـەڵام مەسەلەی پاراستنی تەندروستی مرۆڤ و پاکژی ئێستا تووشی چەند کێشـەیەکی تـازە هـاتووە ، هەنـدێ لەوانـە مەترسـیدارن ، ئەمـەش بـەهۆی هـاتنی تەکنیکـە جـۆراو جۆرەکـانی مرۆڤـە بـۆ نـاو ژینگـەو چـڕکردنەوەی کردارەکـانی پەرەسـەندنی شارستانییەتە ، بۆ نمونە : چوونە ناو سەردەمی گەشەکردنی (پیشەسازی کیمیـایی) بووە هۆی بڵاوبوونەوەی بڕێکی زۆر کەرستەو ماددەو توخمی کیمیایی لە هەواو ئـاو و خۆراکـدا ، بێگومـان ئـەوەش سەردەکێشـێ بـۆ تێـك چـوونی تەندروسـتی و پاکـژی ژینگەو مرۆڤ پێکەوە .

---

[101] في صحة المجتمع / د.عبدالحسين بيرم (ل:٢٦/٣٠/٥٠) سەیر بکە.

دیسان مرۆڤ ئامێزانی زۆرێ لە جۆرەکانی کەرستە فیزیایی یەکان و کیمیایی یەکان و بایۆلۆجیەکان بووە ، کە ڕابردوو هیچ ئاشنایەتی لەگەڵ جۆرو قەبارەو توخمیان نەبووە ، ئەو تێکەڵ بوونەشی لەم چاخەدا لە ئەنجامی چالاکییە ئابووریەکان و بەرهەمەکانی و زانستە گەشەکردووەکانی دا لە ڕووی ڕووبەرو چڕی یەوە ، ڕۆژ بە ڕۆژ ناچاری کردووە ، زۆرێ لە کاردانەوەکانی مرۆڤ و ژینگە لەگەڵ بلاوبوونەوەی ئەو کەرستە ناوبراوانەدا هێشتا نادیارن ، هەر چەند تاقی کردنەوەو لێکۆڵینەوەو شی کردنەوەی زانستی تاقیگەیی و مەیدانی یەکبینەیە ، وەکو ئاکامێ بۆ ئەوە پێشکەوتنی شارستانی بوو بە هۆی زیادبوونی قەبارەو زۆربونی توخمی دەستکرد لە ژینگەدا ، بەڵکو دروستە قسە لە ڕاست (ژینگەی ئەنترو بۆلۆجی پیشەسازی ژیان) بکرێت، بەلآم پاراستن و دابین کردنی مەرجەکانی ژینگەی سروشتی ژیان لەکرداری نوێ کردنەوەی هێزو تەندروستی مرۆڤ لەکاتی ڕووکردنە چاك کردن و پەرەپێدانی توانا فیزیایی و دەروونیەکان زیاتر دەکات.

زانستە پزیشییەکان و تەواوی ئەزموونە تەندروستییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە تا هەنوکە کاریگەرییەکانی سروشتی کراوەی پاکژ لە پیس بوون بۆ سەر تەندروستی دەروونی و کرداری نوێ بوونەوەی توانای دانیشتووانی شارو مەڵبەندە پیشەسازییەکان ناتوانرێ قەرەبووبکرێتەوە ، هیچ زانست و تەکنیکێکی پەرەسەندو ناتوانێ ببێتە جێگرەوەیێکی دروست و هاوتەریبی بەهای سروشتی کراوەی پاکژ بۆ ئادەمیزاد ، وەکو باسکرا پەیوەندی نێوان ژینگەو مرۆڤ پەیوەندییەکی بەگڕوتین و گەرمە[102].

(پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ژینگە لە ڕووی نێگەتیف و پۆزەتیفەوە سەرهەڵدانی نەخۆشییە شارستانیەکان)

---

[102] الانسان والبیئة / ل:١٨- ٢٠.

﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ١٠ ﴾ ، واته : ڕۆژێ دێت ئاسمان بەدوکەڵێکی ئاشکرا دێ ، خەڵکی دادەپۆشێ ئەمەش سزایەکی بە ئازارە . لێرەدا قورئان پێشبینی دەکات ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرا دایدەگرێ ، ئازاری خەڵکی دەدات ، گومان لەمەدا نیە ئەمە ئاماژەیە بە پیسبوونی هەوا بەدوکەڵ و گازەکان و کەرەستە پیسکەرەکانی هەوا ، پاشان ئاماژە دەکات ئازاری خەڵکی دەدات و تووشی نەخۆشی و زیانیان پێ دەگەیەنێت و دەبێتە نیشانەیێ بۆ نزیك بوونەوەی قیامەت .

*دیسان قورئان ئاماژە دەکات* ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١ ﴾ ، واتە : کاتێ ئاسمان درزی لێ پەیدا بوو . ئاشکرایە بەهۆی دوکەڵ و گازە دەستکردەکان چینی ئۆزۆن درزی لێ پەیدا بووەو ئەو بەرگە پارێزەرەی جاران خوا لەبارەیەوە فەرموویەتی ﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ٣٢ ﴾ درزی لێ پەیدا بووەو زەمینەی خۆش کردووە بۆ هاتنی تیشکی زیانبەخشی وەکو سەر بنەوشەیی ، پاشان ڕەشەبای خۆریی کە خودا دەربارەی دەفەرمووێ ﴿ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ فَلَا تَنتَصِرَانِ ٣٥ ﴾ ئەو درزە فراوانتر دەکات.

(عماد مجاهد) نووسیویەتی : (ڕەشەبای خۆریی یان گەردەلولی خۆریی لەو هۆکارە گرنگانەیە درزی ئۆزۆن فراوانتر دەکات ، کە ئەو چینەیە گیاندارانی سەر زەوی لە تیشکەکانی سەر بنەوشەیی ترسناك دەپارێزێ ، کە لە خۆرەوە دێن ، بەگرنگترین هۆکار دادەنرێ بۆ زۆربوونی ڕێژەی شێرپەنجەی پێست ، بەو پێیەی لەسەدەی بیستەمدا چینی ئۆزۆن داخوراوە خەڵکێکی زۆر لە ئەمریکا تووشی شێرپەنجەی پێست هاتوون ، بۆیە ئێستا مەسەلەی کونبوونی ئەو چینە بۆتە تەوەرێکی گرنگی

نێودەڵەتی بۆ کەم کردنەوەی ئەم درزە ، کە هەڕەشە لە مـرۆڤ و زینـدەوەرانی زەوی دەکات و ئێستاکە بۆتە مەسەلەیەکی گرنگی سەدەی بیستەم[١٠٣] .

(ام هـولی) دەنووسـێ : پەیوەنـدی پێکـەوەیی خراپـی و باشـی یـە لـە نێـوان مـرۆڤ و ژینگـەدا ، ئـەو ژینگەیـەی مـرۆڤ هـەوڵی بـۆ دروسـتکردنی داوە لـە هەنـدێ جـاردا ، هەندێ جاری تریش بە پێ ی قۆناغەکانی بوونی لەزەوی دا خۆ لەگەڵ گونجاندنی دا داوە ، ، ئەو فشاری خستۆتە سەر ژینگە بـۆ گونجانـدن بـە پێـی سـۆنگەی ملبەملانـە دژوارەکە .

ئێستا ژینگە شێوازو تربەی ژیانی بەسەردا دەسەپێنن ، کە زۆر جیـاوازن لـەوەی بـە بۆماوە لە باوانەکانی رابردوو بۆی ماوەتەوە ، بەڵکو لەوەش زیاتر لە هەندێ ناوچەی جیهاندا ژینگە رۆڵی وێرانکاری و شێواندنی ژیانی مرۆڤ و وەچەکەی دەبینێت ، ئەو بڕگەیەی ڕابردوو باسمان کرد سوودمان بـۆ دەرکـەوتن و بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـییە شارستانییەکان (الامـراض المدنيـة) پێ دەدات ، ئەو نەخۆشیانە هەرجارە بەشـێوەیێ خۆ دەنوێنن ، لە زۆربەی دۆخەکاندا لەناڕێکی یەکاندا ڕوودەدەن ، لـەکاتی ئاگـایی و سووربوون یان بەبێ ئەوە ، بەپێ ی سروشت و چالاکی مرۆڤ ، پێویستە لێرەدا ئاماژە بـۆ زۆربـوونی نەخۆشـییەکانی دڵ و خـوێن بـەرەکان و نەخۆشـییەکانی سیسـتەمی دەماری و مێشکی و شـێرپەنجەکان و نەخۆشـییە پێستییەکان و ریخۆڵـەیی یـەکان و نەخۆشیەکانی تر بکەین ، کە بە چەند شێوە ئەو گۆڕانانەی بەسەر ژینگەدا هاتوون پەیدای کردوون .

---

[١٠٣] موسوعة علم الفلك / عماد مجاهد / ل:١٢٩.

**سەرهەڵدان و گەورە بوون و تەشەنەکردنی ئەو نەخۆشییە هاوچەرخانە بۆ ئەو هۆکارانە دەگەڕێتەوە :**

١- گۆڕانی شێوازی بژێوی تاك و خێزان ، کە پێویستی دابین کردن تەنیا بە جوڵەو چالاکی ماسولکەیی بەدەست دێ ، زیادبوونی داخوازییەکانی چالاکییە هزرییەکان ، زۆر بەکارهێنانی کەرستە هاندەرەکان (المحفزات) وەکو : جگەرەو چاو قاوەو کەهولەکان و دەرمانی هێورکەرەوە ، (المهدیئات) یان وروژێنەر ، زیادبوونی قەبارەی ئەو زانیارییانەی پێویستە لە یادو زاکیرەدا خەزنیان بکات و رۆژانە بەکاریان بێنێ ، هەموو ئەوانە پەیوەندی و شیرازە کۆمەڵایەتیەکان و تاکییەکانی کەم کردەوە ، بە تایبەتی ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە دابین کردنی پێویستییە دەروونییەکان ، تا ناردنی هەست و کاردانەوەی کەسایەتی[١٠٤].

(د. امین رویحة) دەربارەی ئەم نەخۆشییە هاوچەرخانە دەنووسێ : گەورەترین خۆراکزانی ئەوروپی (د.کولات kollath) دەڵێ : هەر کەسێ دەست بە نەریتی خراپی ئێمەوە بگرێ لە خواردندا دەبێ لەوەچەی دووەم و سێ یەمدا چاوەڕوانی لەناوچوونی وەچەکەی بکات .

(د.ایمن رویحة) دەنووسێ : نەگونجاندنی دەروون و ترس و خەم و شڵەژان و فێڵ و تەڵەکەبازی و تووڕەبون و شێوەکانی تری بەها سەلبی یەکان لە دەرووندا زیان بە تەندروستی لەش و دەروون دەگەیەنێت وەکو چۆن خواردنی ناسروشتی و خواردنی گەنیو و خراپ زیانیان لێ دەدات .

دەنووسێ : شارستانی و بەرەو پێش چوون زۆر زیانی تەندروستی و نەخۆشی بە مرۆڤ گەیاند ، لەوانە : نەخۆشی میزوپوتالم (الاستقلاب الغذائي) و کلۆربوونی ددان و

---

[١٠٤] الانسان والبيئة / ل:٢٠- ٢١.

پوکانــەوەی پوکـەکان و کـێم کردنیـان و برینـی گـەدەو شـەکرەی میـزو قەڵـەوی و نەخۆشییەکانی ڕوماتیزم و سیل و شێرپەنجە[105].

ئەمـەی باسـی کـرد لـەناو وڵاتـە سـەرمایەدارەکاندا پـتر ئـەم نەخۆشـیيانە سـەريان هەڵداوە، هەرچی وڵاتـە هـەژارەکانن زیـاتر تووشـی بـەد خـۆراکی (سـوء التغذيـة) و (کواشیورکور) و ئەنیمیاو کەم خوێنی بەهۆی کەمی ئاسن و نەخۆشی (بەری بەری ) دەبن ، وەکو نووسەر (میشـال سـیباد و هنـری غونـال) لـەکتێبی (الجـوع) دا (ت:بهـيج شعبان) دا زۆر بە وردی بابەتەکەی شی کردۆتەوە ، نمونە هـەژاری و کڵۆڵی یـەکانی دواکـەوتوویی کیشـوەری ئەفریقیایـە ، کـە (٢٢٠) ملیـۆن کـەس لـەو ناوچـەیەدا لـە باشووری بیاباندا لە هەژارییەکی زۆردان و (٢٠) ملیۆن ئەفریقی لەبەر شەڕو وشکی و نەخۆشی تووشی کۆچ و ئاوارەیی هـاتوون ، بۆ زانستی پـتر بڕوانـە (العـالم في مطـالع القرن ٢١: العميد الدكتور سامي ريحانا/ ج٤) .

گەر تەماشای قورئان و سوننەت بکەین ئاماژەی بەو نەخۆشییە تازانـەو هۆکارەکانی کـردووە ، وەکـو : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ ﴾
واتە : بخۆن و بخۆنەوە زیادەڕەوی مەکەن .

﴿ أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ ﴾ واتـە : سـەرقاڵی کردنی زۆر کـردن تـا مـردن . ئەمـەش ئاماژەیـە بـۆ سـەرقاڵی فکری و جەسـتەیی و خواردنی زۆر لە هەندێ وڵاتداو بەد خـۆراکی لـە هەنـدێ وڵاتـداو نـەبوونی دادوەری کۆمەڵایەتی و گوێ نەدان بە ئایین ، کەم بوونەوەی غەریزە گیانییەکان وەکو ئایین و سۆزو خۆشەویستی و کەم کردنەوەی چالاکی یەکانیان لە کۆمەڵگادا ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى ﴿١٢٤﴾ ﴾

---

[105] اخطاء التمدن في التغذية / د: امين رويحة / ل: ٧- ٨- ١١ سەیر بکە.

(د. بول ئیرنست ئەدۆلف) دەنووسێ : (٨٠٪) ی نەخۆشییەکانی خەڵکی ئەمەریکا دەروونین ، دەنووسێ کاتی لەشی مرۆڤ ساغ دەبێ گەر لەگەڵ خوای کردگاریدا ڕێك بوو ، گەرنا تووشی نەخۆشی و تێك چوون دەبین[١٠٦].

مردنی کت و پڕ کردووە بەهۆی جەڵتەی دڵ و وەستانی مێشك زۆر دەبێت ، وەکو لە فەرموودەدا هاتووە : (ان من امارات الساعة ... ان يظهر موت الفجأة) رواه الطبراني.

**(ام هولی ) باسی خاڵی دووەم دەکات :**

٢- زۆربوونی قەبارەی توخمە دەستکردەکان لە ژینگەدا ، ئەم لایەنە زۆر مەترسی دارە بەتایبەتی بۆ ئەوانەی زۆر هەستیارن لەبەرامبەر کەرەستە کیمیاوییەکاندا لە هەواو ئاو و خۆراکدا ، یان هەستیارن لەبەرامبەر ژاوە ژاو و دەنگە دەنگەکان —الضوضاء) و شەپۆلە کەهرۆ موگناتیسی یەکان لەنێوان (١-١٠) سم دا[١٠٧].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (اياكم والحسد) رواه ابوداود ، واتە: خۆ لە ئێرەیی بردن بپارێزن ، (اياكم والغيبة) ابن ابي الدنيا، واتە : خۆ لە پاشەملەی قسە پێ گۆتن بپارێزن ، (اياكم والجلوس في الشمس) رواه الحاكم ، واتە : زۆر لەبەر هەتاو دامەنیشن ، (لەبەرتاو بردن و تیشکە زیان بەخشەکانی خۆر ، یان گەرما بردن) ، (اياكم والكذب) رواه احمد ، نەکەن درۆ بکەن ، (اياكم والطمع) رواه الطيالسي ، نەکەن تەماع بتانگرێت ، (اياكم والتعري) رواه الترمذي ، نەکەن خۆتان ڕووت و سفوڕ بکەن، (اياكم والهيشات الاسواق) رواه مسلم ، واتە : خۆتان لە قەرەباڵغی و هاتوچۆی بازاڕ بپارێزن ، چونکە ئەو چرژان و دەنگە دەنگانە بێزارکەرن. لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاریمان دەکات بۆ خۆپاراستن لەو هۆکارانەی تووشی نەخۆشی دەروونی و جەستەیی و دەماریمان

---

[١٠٦] الله يتجلى في عصر العلم / ل:١٢٤.٠.

[١٠٧] الانسان والبيئة / ل:٢٢.

دەکەن ، بازاڕەکان قەرەباڵغن ، دەنگە دەنگی زۆرە ، هەوا پیسە ، بۆیە مرۆڤ دەبێ خۆی لێ بپارێزێ بە تایبەتی ئەوانەی هەستیارن بەگازەکان و دەنگە دەنگەکان.

( ام هولی ) دەنووسێ :

بەرزبوونەوەی تێکڕای خەڵکی تەمەن درێژ لە نێو دانیشتوواندا ، ئەمەش نەخۆشییەکانی دابڕانی کۆمەڵایەتی و نەخۆشییەکانی پیری پتر دەکات ، وەکو لەدەستدانی یادو زاکیرەو فشاری خوێن (الضغط) و شەکرەو کەم بینایی و گوێ گرانی و هتد[108].

قورئان ئاماژە بەو کێشەیە دەکات و دەفەرمووێ ﴿ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ ﴾ واتە : کێ تەمەنی زۆری پێ بدەین بێ تواناو دەسەڵاتی دەکەین (توانای جوڵەی نامێنێ و نەخۆش دەبێ)

﴿ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا ﴾ واتە : هەیە لە ئێوە تا بەرزترین تەمەنی دەبەین تا هیچی لەناو نامێنێ دوای ئەوەی خاوەن زانیاری بووە .﴿ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ الْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَاكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ ﴾ . بێگومان لە سایەی ئیسلامەوە کاتێ زۆربوونی دانیشتووان دەبێ بە کێشە ئەگەر ئایین حوکم نەکات و دادوەری کۆمەڵایەتی نەبێت ، ئەگەر نا سامانەکانی زەوی بەشی دەیان ملیار کەس دەبێ ، هەر بەزەکات و خێر دەوڵەتە سەرمایەدارەکان دەتوانن بژێوی وڵاتە هەژارەکان دابین بکەن !

(د. سامی ریحانا) دەنوسێ : گرنگترین کێشەکان کەبەرەو ڕووی وڵاتانی جیهانی سێ یەم دەبێتەوە ، زۆربوونی دانیشتوانە ، یان (تەقینەوەی دانیشتووانە) ئەو زۆربوونە

---

[108] الانسان والبيئة / ل:٢٢.

هەرِەشە لە مرۆڤ دەکات بەهۆی برسێتی لەلایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە داپۆشینی ماددەی ژیان کەزەوی دادەپۆشی و بۆ دانیشتوان هەمواری دەکات ئەو لەناوی دەبات.

کێشەکە لەوەدا کورت دەبێتەوە زۆر لەگەلانی باشوریش پشت بەشێوەکانی دیموگرافی دەبەستێ و زۆرتر لە گەشەی کەرستە خۆراکییەکانی زیاد دەکات ، کەچی باکور کەمی گەشەی دانیشتوان بەخۆوە دەبینێ ، ئەمەش سەر دەکێشێ بۆ کۆچ کردنی دانیشتووانی باشوور بۆ باکوورو تێکەڵ بوونی رِەگەزەکان ، لەسەر ئاستی تەواوی جیهان ، ئەو زۆر بوونەوەی دانیشتوان گەر تاووتوێ نەکرێ دەبێتە هۆی دروست کردنی نارِێکی لە مەیدانەکانی خۆراك و وزەو کارو کۆچ و گەرم بوونی گەردوونی و ژینگەو کشتوکاڵ و هتد ، سەرەنجامەکانی گەشەی دانیشتووان بەنارِێکی ، کە ناکرێ بەرایی لێ بگیرێ ، لەماوەی شێوەکان و ئاستەکانی بەکاربردنە ئاساییەکاندا دەردەکەوێ، بە لەناو بردنی دارستانەکان و کەرەستە سروشتییەکان و سووتاندنی سووتەمەنی توخمی و وشك کردنی گۆم و زەلکاو و پیسکردنی روبار و زەریاکان و هەڵکۆڵینی زەوی بۆ رِووت کردنەوەی لە کانزاکان و و کەرستە خاوەکانی تر .

کێشەیێکی تری دانیشتووان لەدنیای نوێ دا زۆربوونی پەنابەرانە ، کە ژمارەیان بەرەو زیادبوونە ، بەرپرسی ولآتە یەکگرتووەکان لە رِاست کاروباری پەنابەراندا باسی کرد کە ژمارەی پەنابەران لە کۆتایی (٢٠٠٦) دا گەیشتۆتە (٩,٠٩) ملیۆن کەس و هەر لە ساڵی (٢٠٠٢) دا بە رِێژەی (١٤٪) زیادی کردووە ، بەزۆری ئەوانە خەڵکی جیهانی سێ یەمن ، باس دەکات : ژمارەییێکی زۆر پەنابەر لەوانە (١,٥) ملیۆن عێراقیین ، (٢,١) ملیۆن ئەفغانین و گەورەترین رِێژەی کۆچکەران پێك دێنن لە جیهانداو بەسەر (٧١) ولآتدا دابەش دەبن ، دوای عێراقییەکان و ئەفغان سۆدانییەکان دێن و ژمارەیان (٦٨٦) هەزارە ، سۆماڵ (٤٦٠) هەزارو کۆنگۆی دیموکراتی (٤٠٠) هەزار و بوروندی (٤٠٠)هەزار ، ئەگەر پەنابەرانی فەلەستینی بخرێتە سەر کە (٤,٣) ملیۆن

پەنابەرن ، ژمارەی پەنابەرانی جیهان دەگاتە (١٤) ملیۆن کەس [109]، بێگومان گەر خوێندنەوەیەکی ورد بۆ کێشەی پەنابەران و هەزاری ولآتانی هەژار بکەین هۆکاری سەرەکی جەنگ و نەبوونی دادوەری کۆمەلآیەتی یە لەو ولآتانەدا ، پاشان ولآتە سەرمایەدارەکانیش وەك پێویست یارمەتی و پێویستیان پێشکەش ناکەن ، گەر ئەمریکاو فەرەنساو بەریتانیا بە ئەندازەی ئەوەی دەیدەنە سەگ و پشیلەکانیان بیدەن بەو هەژارو پەنابەرانە کەسی برسی یان نامێنێت و گوزەرانیان خۆشتر دەکات ، یان گەر ئەو پارەیەی بۆ چەك و تەقەمەنی و خواردنەوەی ئەلکهول و چارەکردنی ئایدز خەرج دەکرێ بدرێ بە هەژاران کەسی هەژار لەجیهاندا نامێنێت.

(د.زغلول النجار) دەنووسێ : بۆ درووست کردن و فرۆشتنی شەراب و برەو پێ دان و رێکلآم بۆ کردنی سالآنە هەزاران ملیۆن دۆلار خەرج دەکرێ لە جیهانداو سەدان ملیۆن دۆلار بۆ چارەکردنی مودمینەکان خەرج دەکرێ ، زیانە ئابووریەکانی تەمبەڵی و دەغەڵی دوورکەوتنەوە لەکار بەسەدان بلیۆن دۆلار مەزەندە دەکرێ لە ساڵێکدا ، کەچی نیوەی گۆی زەوی قورەی سکی دێ لە برسان ، گەر ئەو ملیار دۆلارانە بۆ ئاوەدانی زەوی خەرج کرابایە کەسی برسی نەدەما [110].

داهاتوو دوای روخانی دەسەلآتی رۆم (ئەمریکا) و هاتنی حوکمی مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) ئەوکات خەڵکی دەزانن بوونی هەژاری و نائارامی و چینایەتی لەزەوی دا بۆ کەمی کەرستە و زۆری دانیشتووان نەبووە ، بەڵکو بەهۆی لادان لە ئیسلام و نەبوونی دادگەری کۆمەلآیەتی بووە.

---

[109] العالم في مطالع القرن ٢١/ د.سامي ريحانا / ل:٨٥- ٩١ / ج١ بەکورت کردنەوە، نمونەی زیندووی ئەمرۆ بەهۆی شەری (داعش) لە عێراق و سوریا نزیکەی دوو ملیۆن کەس بەرەو کوردستان هەلآتوون و ئاوارە بوون ، ئەمەش کارەساتێکی گەورەو نەخوازراوە لە (٢٠١٤)ەدا .

[110] مدخل الى دراسة اعجاز العلمي / د.زغلول راغب محمد النجار / ل:٢٣٧ / دار المعرفة / ط ١ / ٢٠٠٦م.

(كيف انتم اذا نزل ابن مريم فيكم وامامكم منكم) رواه البخاري. واته : ئێوه چۆن دەبن كاتێ كوڕی مەریەم دادەبەزێ و ئیمامی خۆتان لەخۆتانە (لو لم يبق من الدهر الا يوم لبعث الله تعالى رجلا من اهل بيتي يملأ ها عدلا كما ملئت جورا) رواه احمد وابو داود. واته : گەر ڕۆژگار یەك ڕۆژی مابێ خودا لە نەژادو پشتی من پیاوێ ڕەوانە دەكات زەوی پڕ لە دادگەری دەكات چۆن پڕ لە ستەم بووە . (مەهدی) لە خۆرهەلأت (عێراق) دێ : (ثم تطلع الرايات السود من قبل المشرق فيقتلونكم قتلا لم يقتله قوم ، فاذا رايتموه بايعوه ولو حبوا على الثلج فانه خليفة الله المهدي) رواه ابن ماجة والحاكم وصححه وابن كثير وصححه. (وسيكون في امتي خليفة يحثوا المال حثيا لايعده عدا) رواه مسلم . واته : لە ناو ئوممەتی من خەلیفەیێ دێ ماڵ بێ شومار دابەش دەكات و نایژمێرێت ، دەجالیش هەر لەوێ دێ : (يخرج الرجال من العراق) (رواة نعيم بن عماد)

مەهدی خاوەن ئیلهامە (يخرج المهدي وعلى رأسه ملك ينادي هذا مهدي فاتبعوه) رواه ابو نعيم ، بۆ زانستی پتر لەسەر مەهدی بڕوانە (العرف الوردي/ للسيوطي) . (شيخ الاسلام محمد عبدالحي الكتاني) لة كتێبی (السر الحقي الامتنانى/ ل:٣٧٩) لة (دانيال) پێغەمبەری (سەلامی خوای لەسەر) گێڕاویەتیەوە : (طوبى لمن ادرك ايام الالف والاربعة مأة) ، واتە : خۆشحاڵی بۆ ئەوانەی دەگەنە ڕۆژانی (١٤٠٠) . بەو پێیە بە ویستی خودا لە سەدەی (١٤)ی كۆچی پێغەمبەرماندا (ﷺ) ئەو گۆڕا نە گەورە گەردوونی و مێژووی یە ڕوو دەدات و ئێستا لە ساڵی (١٤٣٥)ی كۆچی داین ، خوا لە یارمەتی دەرانی ئەومان قبوڵ بكات .

پاشان خوداوەند ڕێگای بۆ كۆچ بەری و پەنابەری كردۆتەوە ، دەبێ سنورەكانی وڵاتیان بۆ واڵا بكرێ ، بەلأم بە پلان و بەرنامە ڕێژی و دەبێ كاریان بۆ بدۆزرێتەوە ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ۝٥٦ ﴾ ، واتە : ئەی بەندەكانی من كە بڕواتان هێناوە خاكی من فراوانە هەر من بپەرستن. بەو پێیە

گەر خەڵکی چووە هەندەران و وڵاتێکی تر زەوی کراوەیە ، بەڵام دەبێ مرۆڤ لەو وڵاتانەدا بۆ کاربچێ و خواپەرستی و کەسایەتی خۆی لەدەست نەدات و خۆی نەدۆڕێنێت!

**گەورەترین کێشەی ژینگە پیس بوونی هەوا ( تلوث الهواء ) و خاك و ئاوە کە پەیوەندی سەلبی پەیدا دەکات :**

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ یَوۡمَ تَأۡتِی ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِینٍ ﴿١٠﴾ ﴾

پێشەوا علی ﷺ فەرموویەتی وەکو لە (الدر المنثور)دا هاتووە (ان الدخان لم یمض بعد یاخذ المؤمن کهیئة الزکام وینفخ الکافر حتی ینفذ) ، واتە : ئەو دوکەڵە هێشتا نەهاتووە مرۆڤی بڕوادار وەکو هەڵامەت دەیگرێ کافر پێ ی هەڵدامسێ تا دەمرێت .

(د.سامی ریحانا) دەنووسێ : ئەو هۆکارانەی ژینگە پیس دەکەن بە نمونە : زۆربوونی پاشماوەی پیشەسازی ، زۆربوونی مردووان بەهۆی نەخۆشییەکان ، وێرانکردنی زەوی و دارستان و باخچە بەمەستی نیشتەجێ کردن ، داخورانی خاك و لەناوچوونی جۆرەها ڕەگەزی گیاندارو ڕووەك ، پیشەسازییەکان و سووتاندنی خەڵوزی بەردین ، زۆربوونی خوێی زەوی بەهۆی زۆر وەشاندنی پەیینی کیمیایی بە زەویدا ، ونبوونی جۆرەها باڵندە کە بەشدارییان دەکرد لە هاوسەنگ ڕاگرتنی ژینگەدا ، پیسبوونی هەوا ، زۆربوونی دانیشتووان ، زیادبوونی چالاکییە ئابوورییەکان و ناوچەی پیشەسازی و هۆکانی گواستنەوەی ئامرازی .

دەنووسێ : چارەسەرکردنی ئەو کارەساتانە لە ئاستی جیهانی سێ یەمدا تەواو نیە ، چونکە گەلە دواکەوتووەکان پشت بەو چالاکییانە دەبەستن کە بژێوی ژیانیان لەسەرە ، نەخوازا لەگەڵ بەرەو دواوە گەڕانەوەی زەوی کشتیاری ٣/١ ی وشکانی بیابان و شارە ، ٣/١ی تری دارستان و بیابانی ڕەق و ڕووتە ، ٣/١ی تری بۆ کشتوکاڵە و ، ئەو ڕووبەرەش هەر لە ساڵی ١٩٧٠ وە کەم بۆتەوە .

پیس بوونی بەرگە هەوای زەوی ئاكامێكی تری زۆربوونی دانیشتووان و هەوڵدانە بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی گوزەران ، لەگەڵ پەرەسەندنی پیشە سازی قورس و هۆیەكانی گواستنەوەی قەبە ، ئەو پەرەسەندنە كاردانەوەی بۆ سەر پیس بوونی ڕووبار و دەریاچەكان و كەم بوونی سامانی ماسی لەناویاندا دروست كردووە.

ڕاپۆرتەكانی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) بلاوی كردەوە شارەكانی (نیودلهی) و (بیكین) و (تاران) و (شینیانگ) لەو ولاتانە هەوای دووەم ئۆكسیدی كاربۆنیان زۆرە ، لە (١٠) منداڵ (٧) دانەیان كە لە دایك دەبن لە (مەكسیكۆ سیتی) تووشی بەرزبوونەوەی ڕێژەی قورقوشم (الرصاص) بوون بە توندی لە خوێنیاندا.

یەكێ لە دیاردەكانی تری پیس بوونی ژینگە دیاردەی بە بیابان بوون (التصحر)ە ، ولاتە یەكگرتووەكان لە بەیانێكدا ڕایانگەیاند ¼ی ڕووی زەوی بیابانەو ناوچەكانی تریش بەرەو مەترسی بە بیابان چوون دەڕۆن .

دیاردەیەكی تری پیس بوونی ژینگە گەرم بوونی زەوییە ، كە پەیوەستە بەو بەرگە هەوایەی دەوری زەوی داوەو سیستەمێكی داخراوی پێك هێناوە ، جگە لە تیشكی خۆر ماددەی تری تێ ناچێت ، واتە : ماددە بۆ دیمەنی سەرەتایی دەگێڕێتەوە ، واتە : ماددە بۆ پاشماوە دەگەڕێتەوەو سیستەمی ژینگەیی دەیمژێ تا داهاتوو بیگۆڕی بۆ ماددەیەكی خاو ، بەلام بەهۆی زۆربوونی دانیشتووان ئەو هاوسەنگییە جیهانییەی ژینگەیی تێك چوو ، لەوانە گەرم بوونی گەردوونی پەیتا پەیتایی ، ئاو و هەوای هەندێك دەفەر گۆڕاو بارانی كەم بۆوەو هەندێ ناوچەی تریش تووشی لافاو هاتن ، ئەو گەرم بوونەوە ئاستی بەرز بوونەوەو هەڵكشانی ئاو زیاتر دەكات لە دەریاكانداو مەترسی دەخاتە سەر وشكانی ، دیسان زیادبوونی گەرمی هەرەشە لە (١٢٠٠) دوورگەی دەوری زەریای هیندی و دەریای كاریبی دەكات لە هەرە باخچە جوانەكانی زەمینن[111] .

---

[111] العالم في مطالع قرن ٢١/ج / ل:٥٥- ٥٩ سەیر بكە : كورت كردنەوە.

قورئان دەربارەی بە بیابانبوونی زەوی لە داهاتوودا فەرموویەتی ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾ الكهف : ٧ - ٨ واتە : ئێمە ئەوەی لە زەویدا دامانناوە وەکو جوانییەك پێمان داوە ، تا تاقیتان بکەینەوە کامتان کردەوەی هەرە باش دەکات ، وە ئێمە هەرچی لەسەر زەوییە (لەو جوانییە) دەیکەینە خاکێکی ڕووت . (قتادة) دەڵێ : (صعیدا جرزا) واتە : (ترا با لیس فیها زرع) ، ئەمەش مانای گۆڕانی زەوییە بە بیابان (الدر المنثور) /ج ٥/ ل: ٣١٨) ، لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات خودا زەوی بە جوانی و هاوسەنگی تەسلیم بە مرۆڤ کردووە تا تاقییان بکاتەوە کامیان کاری باش دەکات و زەوی ئاوەدان دەکات و خواپەرستی دەکات و ژینگە دەپارێزێت ، بەڵام داهاتوو وشکانی کشتوکاڵ بە پیت بۆ بیابانێکی ڕووت دەگۆڕێـــــت ، ئە مە ش دەستی مرۆڤـــــ دەوری تێدا دەبینێـــت ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ .

وەکو باسکرا مەترسییەکی تر کونبوونی چینی ئۆزۆنە (بەهۆی ڕەوانە کردنی کەرستە کیمیاییەکان بەرەو ڕووی ، کە هەڕەشە بەتووش هاتنی شێر پەنجەی پێست و نەهێشتنی ژیان لەزەویدا دەکات وەکو مەریخ و زوهرەی لێ دەکات ، ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کاروباری بارودۆخی کەش و هەوا ڕایگەیاند لەسەر ئەوروپا چینی ئۆزۆن (٢٠٪)ی کون بووەو لەسەر سیبریا (٢٥٪)ی کون بووە )[١١٣] . قورئانیش هۆشیاری داوە : (اذا السماء انشقت) (الانشقاق : ١)

(ام هولی) دەڵێ : کاریگەری کەرستە پیسە پیشەسازییەکانی هەوا یان بابەتی دەبێ و کار لەیەکێ لە ئەندامەکانی لەش دەکات وەکو کۆئەندامی هەناسەو کۆئەندامی

---

[١١٣] هەمان سەرچاوە / ل:٦٠.

هەرس و پێست و بینین ، یان هەوای پیس بەو كەرستانە لەڕێگای مژین و كاركردنی لەلەش كاری تێ دەكات و توشی شەكەتی و پسان و ئیفلیجی و گێڕی و شەپلەی دەكات ، یان كار لە هەرە چالاكیە هەستیارەكانی دەكات ، مەترسیدار ترینی ئاكامەكانی هەڵمژینی هەوا ، كە لە ریزی پێشەوەی تووش كردنەكانە نەخۆشییەكانی (بۆریچكەكان و سی یەكانە) ، كە هەوی جۆراو جۆرو شێرپەنجەی سی یەكان لەسەرووی هەموویانەوە پەیدا دەكات ، ئەوەی پێش لە لێكۆڵینەوەو چارەكردنی ئەو نەخۆشییانە دەگرێ بە زۆری مل كەچ كردنە بۆ ئەو نەریتانەی زیان لە تەندروستی دەدەن ، وەكو : جگەرە كێشان و خواردنەوەی مادده سەرخۆشكەرەكان و هی تر ، ئەو نەریتانە بوونە خووی ژینگەی شارستانی ئیمڕۆو پێویستی بە هۆشیاركردنەوەی دژ وەستانەوە بەوە هەیە لەناو دانیشتوواندا .

ئەو كەرستانەی هەوا پیس دەكەن و نەخۆشی كاتی و درێژ خایەن دووچاری مرۆڤ دەكەن و تەواوی كۆئەندامانی دەگرنەوە ، دەتوانین (ئۆكسیدەكانی كاربۆن) و (گۆگرد – كبریت) و گەردیلە نا ئەندامییەكانی وەكو تۆزو گەرد و گەردی كەرەستە ئەندامییەكانی وەكو ئۆكسیدی نایترۆجین و ئۆزۆن و زرنیخ و كلۆرو ئەزبست و قورقوشم (الرصاص) و هتد بەنمونە وەربگرین .

هەندێك لەو كەرەستانەی باسكران ژەهراوین بەخۆیان یان بەهۆی كارلێكردن لەگەڵ كەرستەی تردا ، ژەهراوییەكان وەكو : (سلیكاو ئەزبەست و بیریلۆن و زەرنیخ و فلۆرو ئۆزۆن) ، ئەوانەی بەهۆی كارلێككردن كاریگەری پەیدا دەكەن وەكو : ئاوێتەكانی (فلۆرو بیریلیۆم و ئاوێتەكانی هایدرۆجین) لەگەڵ (ئۆزۆن) دا یان (ئۆزۆن) لەگەڵ هەندێ زیندەوەری میكرۆسكۆبیدا.

گەر تەماشای ئەم فەرموودەیە بكەین ئاماژە بە گەرمی زۆرو زۆربوونی لافاو و بومەلەرزەی زۆرو تسونامی زۆر دەكات (وبین یدی الساعة موتان شدید وبعده سنوات

الزلازل) رواه نعيم بن حماد في الفتن ، واته : لەدەوروبەری قیامەتدا دوو مردنی بەهێز هەیە ، پاشان ساڵانی بومەلەرزە دێن .

خوای گەورە دەربارەی تسونامییەکان و بومەلەرزەکان فەرموویەتی﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ﴿٢﴾﴾ الحج ، واتە : ئەی خەڵکینە لە خوا بترسن بومەلەرزەی پەسڵان شتێکی مەزنە ، ڕۆژێکە هەموو دایکێکی شیردەر بێ ئاگا دەبێ لەمنداڵە شیرخۆرەکەی ، هەموو دووگیانێ کۆرپەلەی لەبار دەچێت ، خەڵکی دەبینن وەك سەرخۆشانن ، سەرخۆش نین بەڵکو سزای خودا توندە . (علقمة)پێ ی وایە ئەو بومەلەرزەیە بەر لە قیامەت ڕوودەدات وەکو (نعیم بن حماد) لە (الفتن / ح : ١٧٨٠)دا گێراویەوە .

پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بە پیس بوونی خاك و بێ بەرەکەت بوونی و گۆڕانی بە بیابان دەکات : (لا تقوم الساعة حتى يمطروا الناس مطرا عاما ولا تنبت الارض شيئاً) وراه احمد، واتە : قیامەت نایێ تا باران دەبارێ بۆ خەڵك و زەوی هیچ ناڕوێنێت!

(ام هولی) دەنووسێ : پیس بوونی خاك و ئاوی سەر ڕووی زەوی ناخی زەوی بەرامبەر پاراستنی تەندروستی گشتی و پاکژی ژینگەی ژیاندا زۆر کێشەی باوی تێدایە .

بەزۆری پیس کردن لە ئاکامی ڕزگاربوون لە پاشە ڕۆکی ئاو (ئاوی بەکارهاتوو) لەناوچە ئاوەدانەکانداو پاشماوەی پیشەسازی ئاوییەوە پەیدا دەبێ ، کە لە پاشماوە کیمیاییەکان پێك دێ و لە کارگەکانەوە ڕاستەوخۆ بۆ خاك یان جۆگاکان پاشان بۆ ڕووبار دەگوازرێتەوە ، بەو پیس بوونە ترسناکە پیس بوونی ئاوی خواردنەوە ڕوودەدات، تێکەڵ بە میکرۆبەکانی دووەمی پەتایی و کەرستەی کیمیایی تر دەبێ و

بۆ لەش مرۆڤ دەگوازرێتەوەو نەخۆشی دەکات . لەو پاشماوە خراپانە ماددەی (فینۆل) و پێك هاتەکانی (کیانیید)ە ، ئەنجا پاشماوە کشتوکاڵییە مەترسییەدارەکانە ، کە ئاوێتەی دەرمانی قەلاچۆکردنی مێرووەکان و پەیینی دەستکردە ، دوایی گیراوەکانی پاکژکردنەوەی کیمیاوی دێن چەندان کەرستەی تریش ، کە ڕۆژانە بەکاردێن[113] .

## کێشە دەروونیەکان و پێوەرەکانی جوانی ژینگەیی

﴿ فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهۡجَةٍ ﴾ ، واتە : پێمان ڕواند چەند باخچەی جوان و دڵخۆشکەر . (الراغب) لە (مفردات)دا دەڵێ : (البهجة : حسن اللون وظهور السرور) ، واتە : ڕەنگی جوان و دڵشادکردن (وانبتنا فيها من كل زوج بهيج)(ق ٧) ، واتە : لە زەویدا ڕوواندمان لە هەموو جۆرێکی جوان و دڵشادکەر.

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات یەکێ لە سوودەکانی جوانی و ڕێکی ژینگەو دارو درەخت و چەم و ڕووبارەکان سەرەنج کێشانی جوانییە ، کە غەریزەی هەست کردن بە جوانی وەلام دەدەنەوەو دڵ و دەروون شادو کامەران دەکەن و هەست و دەمارەکان هێور دەکەنەوە و خەم و دڵەڕاوکێ دەرەوێننەوەو زاکیرەو یاد چالاك و تیژ دەکەن .

وەکو باسمان کرد کۆمەڵێ پسپۆڕی پەیمانگەی (ماساشوستن)ی تەکنیکی دوای لێ کۆڵینەوە بۆیان دەرکەوت تەماشاکردنی دیمەنی جوان مێشکی مرۆڤ دەخاتە خۆشی یەوە ، ئاسوودەی دەکات ، بە وێنەی کەسی برسی بۆ خواردن و کەسی نەخۆش بۆ دەرمان ، لەدوا دەرەنجامەکانی گۆڤاری (نیوردن) دەرکەوت کەسی جوان بە شێوەیەکی ئاسایی و ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر مێشك و دەماغ جێ دێڵێ نەك هەر لە ئاستێکی

---

[113] الانسان والبيئة / ل:٢٤.

مەعنەوی بەرز ، ڕوانین بۆ ڕوخسارو دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش چالاك کردنی ناوچەی بینین لە مێشکدا.

گەر تەماشای ئەم فەرموودەیە بکەین پێغەمبەر (ﷺ) بەر لە لێکۆڵینەوەی پەیمانگەی (ماساشوستن) ی ئەمریکی فەرموویەتی (النظرة الى المرأة الحسناء والخضرة يزيدان في البصر) رواه ابو نعيم في الحلية. واتە : سەیرکردنی ژنی جوان (ی خۆت) و سەوزایی بینایی زیاد دەکات . (ان الله تعالى جميل يحب الجمال) رواه مسلم ، واتە : خوا جوانە جوانی خۆش دەوێت .

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۝٧ ﴾ ، واتە : ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە بۆمان کردووە بە جوانکارییەك و پێمان ڕازاندۆتەوە تا ئەوان تاقی بکەینەوە کامیان کاری هەرەباش ئەنجام دەدات .

(د.عبدالحسين بيرم) دەنووسێ : لەماوەی ئەزموونە درێژەکانی خۆمان لەماوەی چەندان ساڵی دوورو درێژدا لەناو گوند و دانیشتووانی زۆنگەکان و ئەهوارەکانی باشووری عێراق و ئەو چەند ساڵە درێژەی لە شارەکان کارم کردووە ئەم چەند دیاردەو ئەو چەند سەرژمێرییەم بەرچاو کەوتووە :

١- ٤٠٪ ی دانیشتووانی گوندو لادێکان ساڵانە دووجار نەخۆش دەبن.

٢- ٩٠٪ی دانیشتووانی شار لە ساڵێکدا کەمتر لە دووجار نەخۆش دەکەون .

ئەو نەخۆشییانەی لەشارەکان بەرچاوم کەوتوون زۆربەیان بەهۆی باری دەروونی درێژ خایەن بووە وەکو : (برینی گەدە – القرحە- و بەرزی فشاری خوێن و میزی شەکرەو نەخۆشی تر ، کە لە ڕێگای باری دەروونی و دڵە ڕاوکێ (القلق) و ترسەوە سەر هەڵدەدەن ، بەڵام بوونی ئەو نەخۆشییانە لە لادێکاندا دەگمەنە ، بەڵکو

نەخۆشــیەکانی ئــەوان بــەزۆری مشــەخۆری ریخۆڵــەیین وەکــو (ئەنگســتوما) و (ئەسکارس) و (بەلهارزیا) و ...هتد .

هۆکارەکانی ئەو دیاردانەش ئاشکرایە کە بریتی یە لە : بوونی دیمەنی جوان لە لادێکاندا ، دارو درەخت و دار خورما و ڕوبارەکان و خۆری جوان و هەوای پاکژی ، هەمو ئەو هۆکارانە خەڵکی لادێ دەخاتە گەشبینی و بارێکی دەروونی باش و بەردەوامەوە ، دوور لە باری هەڵچونی هزری و دەماری و دڵە ڕاوکێ ، دەبینی کێشەی خێزانی بە زۆری لە شارەکاندا هەیە ، تا کێشە کۆمەڵایەتیەکانیش ، بە پێچەوانەی لادێکان .

٣- گەر خەڵکی لە گوندەوە چووە شارو بەردەوام لەوێ دا مایەوە دوای ماوەیێ تووشی نەخۆشی فشاری خوێن (زەخت) و میزی شەکراوی و برینی گەدەو نەخۆشی تر دێت ...هتد.

دەنووسێ : بوونی سەوزایی پێویستییەکی ژیانە لەو کارە سەرەکییانە لەپەرەسەندنی چەمکی تەندروستی تازەدا دا دەنرێت ، چونکە :

أ- باخچە و سەیرانگاکان هەوا لە تۆزو خۆڵ و گەردی هەوا پاکژ دەکەنەوە، هەوا بە مادده زیانبەخشەکان پیس نابێت .
ب- باری دەروونی هەموو شار نشینێ بەرز دەبێتەوەو بەهیواوە لە ژیان دەڕوانێ و شادمانەو دوورە لە پەستی (الكآبة) و خەم ، بەتایبەتی گەر باخچەکان تیپی مۆسیقای لێ بێت.
ج- بوونی بواری لەبارو فراوان بۆ منداڵان تا چەند ساتێ بەیاری و گەمە ڕابوێرن لە باخچەو سەیرانگاو یاریگایەکی جواندا بەیاوەری دایك و باوك ، ئەمە یان شیرنایی بەژیان دەدات[114] .

---

[114] في صحة المجتمع / د. عبدالحسين بيرم / ل:٧٦- ٨٠ بەکورت کردنەوە.

﴿ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ ، برايەكانی یوسف وتیان : سبەی یوسفمان لەگەڵدا بنێرە گەمەو یاری بكات و ئێمە ئاگامان لێ دەبێت.

لێرەدا قورئان ئامۆژگاری باوان دەكات منداڵەكان بەبێ چاودێری خۆیان نەنێرن بۆ سەیرانگاو باخچە و هاوینەهەوارەكان ، چونكە كەس بۆ دڵسۆزی و ئاگایی شوێنی ئەوان ناگرێتەوە ، قورئان ئاماژە بە گرنگی خانووبەرەو كوێستان كردن و گرنگی ئاژەڵ و جل و بەرگ و چیا و سێبەرەكان دەكات و بە بەهرەیێكی مەزنی خوایی یان بە مرۆڤ دەناسێنێت كە بۆ خزمەت و تەندروستی و پاراستنی مرۆڤ دروستی كردون ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلْأَنْعَٰمِ بُيُوتًا تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَآ أَثَٰثًا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَٰنًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ ، واتە : خودا خانووبەرەكانی بۆ كردوون بە جێگای نیشتەجێ بوون ، لە پێستی ئاژەڵانماڵی (تاوڵ – ڕەشماڵ)ی بۆ دروست كردوون كە بە سووكی دەزانن بۆ كاتی كۆچ بارو ڕەوەندی و نیشتەجێ بوونتان ، وە لە خوری و تووك و مووەكانیان كەل و پەل و پێداویستی دروست دەكەن بۆ ماوەیێكی دیاری كراو ، خودا لەو شتانەی بۆی دروست كردون لە دارو درەخت و ڕەشماڵ و خانوبەرەو ئەشكەوت بۆی كردوون بە سێبەر ، چیاكانی بۆ كردوون بە نیشتەجێ ، جل و بەرگی بۆ كردوون بە پارێزەر لە گەرمی ، جل و بەرگی بۆ كردوون بە پارێزەر لە ڕۆژانی جەنگتاندا (زرێیەكان) ، بەو شێوەیە بەهرەكانی خۆتان بەسەردا تەواو دەكات بۆ ئەوەی گەردەن كەچی بۆ خودا بكەن .

ئاشـكرايه خانوبــەره ، گەشــت و كوێســتان ، چــياكان ، ئــاژەڵان ، جـل و بــەرگ ، ئەشكەوتەكان هەموويان ، پێداويستى ژينگەيين و پەيوەسـتن بـە ژيـانى مرۆڤـەوە ، گەر ئەو پێداويستييانە نەبوو ژينگە بە كەڵكى ژيان و حەوانـەوە نـەدەهات و ژيـانى مرۆڤ دەوامى نەدەكرد ، هەموو ئەو بەهرانە پێويستى جەستەيى و هزرى و دەروێنن ، بـەلاّم بێگومـان شارسـتانى نـوێ ، كەلەسـەر مـاددەيێكى ڕووت دامـەزراوە ئـايينى و هزرى و گيانى يەكانى پشت گوێ خستووە ، وەكو خوا فەرموويەتى ﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ ﴾ هـەموو ئامـانجى سـەرمايەدارى زۆركردنـى سامان و داكـردن و كۆكردنـەوەى پارەيـە ، هـەر بۆيـەش مرۆڤـى تووشـى دەيـان نەخۆشـى جەسـتەيى و دەمارى و دەروونى كردووە .

وەكو (د.عبدالحسين بـيرم) ئامـاژەى كـردووە : ئـەم ڕەوتـى ماددييـە مانـدووبوونێكى هزرى و دەمارى بەردەوامى خولقاندووە لەبيركردنەوە لە پێويستييەكانى بەردەوامى ژيان ، لەوانەش : خەمۆكى لە ئەنجامى خەم و گرژى دا ، پاشان تێك چوونى ميزاژ ، كە لە دڵتەنگى توندو قوڵ دەچێ و هۆيەكەشى نازانرێت ، دوايى خـەوزڕان و تێـك چوونى خەو بەبەردەوامى و پچڕ پچڕ بـوونى ، هـەروەها تێـك چـوونى هـزرو كـەم زەينى ، دوايى دڵە ڕاوكێ لەسەر داهاتوو ، لەسەر تەندروسـتى و لەسـەر كەسايەتى ، لەسەر چالاكى جنسى و دڵەڕاوكێ بۆ داهاتوو ، بێگومان ئەو نەخۆشـييە دەروونيانـە سـەر دەكێشن بـۆ نەخۆشـى دەرونـى و كێشـەى تەنـدروسـتى و كۆمەلاّيـەتى ، وەكـو : خۆكوشتن و ڕاهاتن لەسەر ماددە هۆش بـەرەكان (المخدرات) و سـەر خۆشـكەرەكان و ڕووداوى سـتەم و زۆردارى و دزى و كوشـتن و ڕفانـدن و لێـدان ، هـەموو ئـەو كێشـە كۆمەلاّيەتى و دەروونيانە لێكۆڵينەوەى ورد هەڵدەگرن ، ئەوانە كاردانەوەى دەروونين لە خەمۆكى و پەستى يەوە سەرهەڵدەدەن ، سەربارى هەڵچوونى نـاخ و دڵـە ڕاوكـێ ، هەموو ئەو دۆخانە لە وڵاتە پێشكەوتووەكانى تەكنەلۆجى و كشتوكاڵى دا پتر دەبن ، بۆ لە ڕاپۆرتى ١٩٧٦ ى پۆليسى (نيۆرك) دا بەنموونە دەبينن ساڵێكى پڕ لە تاوان بووە ، لەو شارەدا بەتەنيا (٦٥٨) هەزار تاوان كراوە لە هەر كاتژمێرێكدا (٧٥) تاوان كراوە ،

بە (١٣٪)ی لە ساڵی ١٩٧٦ زیادی کردووە ، ئەگەر لەگەڵ ساڵی ١٩٧٠ دا بەراوردی بکەین[١١٥] .

پرۆفیسۆرانی وەکو (ام هولی – جی رجیها – جی سلادك) هەمان قسە دەکەن و دەنووسن (کاریگەرییە دەروونیەکان پێش ئەو کاریگەریانە دەکەون کار لە تەندروستی مرۆڤ دەکەن ، گەر لەگەڵ هەل و مەرجی پیس بوون لێکیان گرێ بدەین ، ئەمە زیان لە زەینی مرۆڤ دەدات ، زیان لە بۆچوون و بڕیارەکانی و باشی و بەرهەمی کارەکانی و توانای هزری بەگشتی و بەئاگایی بەتایبەتی دەدات ، وەکو نەتوانینی دیاری کردنی دوورییەکان و ماوەو پێوانەکان ، بارودۆخی سەلبی و ناهەموار کار لە ژینگەو کاری مرۆڤ دەکات ، کار لە کەشی کۆمەڵایەتی و شوێنی کار دەکات و توندی گرژی دەماری کرێکارەکان و دەمارگیری میزاژیان پتر دەکات و پەیوەندی نێوانیان دەشلەژێنێت ، دیسان دیاردە تەندروستییەکان کە لە پیس بوونی ژینگەوە سەرهەڵدەدەن زۆر نابات دیاردە دەروونییەکانی دەردەکەون بەپێی سروشت و شوێنی تاك یان کۆمەڵ ، ئەمەش بەزۆری ڕوودەدات .

زۆر لە پسپۆڕان بەڵگەی ئەو ئاکامانە دێننەوە کە لە بەسووك تەماشاکردنی لایەنی ماددی ژینگەوە سەرهەڵدەدەن ، لەڕێگای زۆر دیاردەوە ، لەوانە : دابەزینی ڕێژەی زۆربوونی دانیشتوان و زۆربوونی تەلاق و دابەزینی ئاستی ڕێکی لەکاردا و بێ ڕێزی کردن بەخاوەندارێتی گشتی و تایبەتی و زۆربوونی بارەکانی شێوان و توندو تیژی و پەشێوی و تاوانەکان بەتایبەتی لەناو لاواندا .

کاریگەری ماددە پیسەکان بۆ سەر کرێکاران هەر لە مەیدانی کاردا قەتیس نابێ ، بەڵکو لەکاتی گەشت و هاتوچۆداو کۆبوونەوە لە هۆڵی سینەماو شانۆکان و هاوێنە هەوار و شوێنەکانی پشوودان دا لەگەڵیاندا دەبێت ، ئەو بارودۆخە زیانێکی دەروونی

---

[١١٥] في صحة المجتمع / ل: ٦٦- ٧٠ بەکورت کردنەوە.

و تەندروستی زۆر مەترسیدارو بەزیانی دەبێت ، پاشان ئەم دۆخانە کاریگەریان بۆ سەر منداڵیش دەبێ ئەوانەی جەستەیان بەهێزە یان لاوازە ، کاریگەرییەکانی پیس بوون کاردەکەنە سەر ماوەی پشوودان و خەوتن دوای ماندووبوون و کار ، یان لەکاتی چاك بوونەوەو هەڵسانەوە سەر پێ لەنەخۆشی ، کار دەکاتە سەر ژنانی دووگیان و کار دەکاتە سەر وەچەی داهاتو ، کاتێ لە هەستیارترین قۆناغدان هەڵیان دەکوتێتە سەر ، پیس بوون کار لەپیرەمێردو خانەنشینان دەکات و ملکەچی نەخۆشیەکانیان دەکات و توانایان تا ئەو پەڕ لە بەر دەبرێ ، لاوان زوو ڕاپێچی پیر بوون دەکات "[116].

خوای گەورە دەربارەی کاریگەری ترس و دڵە ڕاوکێ بۆ سەر لەش و دەروون فەرموویەتی ﴿ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ﴾ المزمل
لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ نەخۆشی دەروونی دەکات کەبێ بڕوایی و دڵەڕاوکێ دروستی دەکات ، ئاماژە دەکات ترسان لە ڕۆژە دژوارەکاندا لاوان زوو ڕاپێچی پیربوون و سپی بوونی مووی سەریان دەکات : (الا إن اولياء الله لا خوف عليهم ولاهم يحزنون) (يونس ٦٢) واتە : دۆستان و ئەولیایانی خوا ترسیان لەسەرنییەو دڵتەنگ نابن ، خوا هانمان دەدات بۆ سەیرکردنی سەوزایی یەکان : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ الانعام ٩٩

پێغەمبەر (ﷺ) ڕاستی فەرمووە (نعمتان مغبون فيهما كثير من الناس : (الصحة والفراغ) (رواه البخاري وغيره) ، واتە : دوو بەهرە (نیعمەت) هەیە زۆر کەس تێ ی دا زەرەرمەندن ، تەندروستی و دەست بەتاڵی.

---

[116] الانسان والبيئة / ٢٥/٢٦.

جوانترین جوانی که لەو دیمەنە جوانانەی سروشتدا بەدی دەکرێ و گەورەترین خۆشی و کامەرانی بەدڵ و دەروون دەدەن بینینی جوانی کردگارە کە لە دیمەنی دروستکراوانی دا ڕەنگ دەداتەوە ، دڵی ئەویندارا ن و عاشقان دەخەنە سەرنج و رامانەوە ، وەکو شەیدایی مێروو بۆ شیلەی گوڵ و جوانی دیمەنەکانیان ، بەلاّم بێگومان ئەوانەی لە هونەری سروشتدا جوانی هونەرمەند نابینن هیچ تام و چێژەکی گیانیی لێ ناکەن دڵیان بخاتە شادی و ئاسوودەیی یەوە .

پێشەوای بڕوادان و دەرگای شاری زانستی پێغەمبەر (ﷺ)ئیمامی عەلی فەرموویەتی : بڕوانە خۆرو مانگ ، درەخت و ڕووەك ، ئاو و بەرد ، جیاوازی شەو و ڕۆژ ، تەقینەوەی ئەو دەریایانە ، زۆری ئەو چیا و لوتکە بڵندانە ، جیاوازی زمان و زاراوە ، هاوار بۆ ئەو کەسەی نکۆڵی لە بوونی خوا دەکات کە بڕیاری ئەوانەی داوەو بڕوای هەڵسوڕێنەر نیە ، پێیان وایە وەکو ئەو ڕووەکانە وان بۆ خۆیان ڕووان ، جیاوازی دیمەنیان دروستکەرییان نیە ، بۆ ئەمەش پەنایان بۆ هیچ بەلگەیێك نەبردووە ، لەو تێ گەیشتنەیان لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکردووە ، ئایا بینا بێ وەستا دروست دەبێ ؟؟[117].

(د.توماس داڤید بارکس) مامۆستای کیمیا لە ئەمریکا دەنووسێ : من لە هەموو دیاردەیەکدا زیاتر لەوە دەبینم ئەوانە دروست کراوێکی دوور لە سۆز بن ، بەڵکو لەسەروی ئەوەوە خۆشەویستی خوا بۆ دروست کراوانی و گرنگی پێدانیان لەو دیاردانەدا دەبینم[118] .

(د.روسل لویل مکستر) زیندەوەرزان دەنووسێ : ئەوەی گومانی تێدا نییە و تیۆرە مادديیەکان ناتوانن لێ ی بکەنەوە ئەوەیە : ئەو خوایەی مرۆڤ بە لێکۆڵینەوەی خۆی

---

[117] نهج البلاغة بتحقيق د.صبحي صالح/ ل: ٢٧١.

[118] الله يتجلي في عصر العلم / ل:٤٥.

له گەردوون دۆزیویەتەوە ، هەمان ئەو خوایەیە لە کتێبی پیرۆزدا باسی دەکرێت ، ئەو خوای کیتابی پیرۆزە کە شوێنەوارەکانی ئەو لە چیا و ئاسمان و دەریاکاندا دەردەکەوێ ، توانای ئەو لە لەوەڕی جوان و گەش و باڵندەی ناو هەواو تەواوی زیندەوەراندا خۆی دەنوێنێت[119] .

لێرەدا زانایان هەمان ڕای نامە ئاسمانییەکان دووبارە دەکەنەوەو جەختی لەسەر دەکەنەوە ، پێشەوا علی ﷺ فەرموویەتی : (روحوا القلوب ، فاذا اكرهت عميت) واتە : پشوو و خۆشی بەدڵ بدەن ، گەر دڵ ناچار بکەیت لە پەل و پۆ دەکەوێت.

وە (ام هولى) دەڵێ : پێکهاتەکانی جوانی ژینگە بەشێوەیێکی ئیجابی کار دەکاتە سەر مرۆڤ و ئەو پێکهاتووانە توانای نوێ بوونەوەو چالاك کردنی ، دروستی دەروونی زیاتر دەکەن ، لە ڕووی کۆمەڵایەتی یەوە دەبێتە توخمێکی گرنگی کۆمەڵایەتی مرۆڤی[120] .

## هەست کردن بە حەسانەوە لە ژینگەدا :

﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ۝٦ ﴾ (النبأ٦)

(مهد) واتە : لانك یان بێشکە ، یان شوێنی حەسانەوەو ژیان بەسەر بردن ، خوای گەورە لەگەڵ باسکردنی زەویدا کە خوای گەورە هەموو هۆکارەکانی پشوودان و حەسانەوەی تێدا داناوە ، ئاماژەی بەو هۆکارانەش کردووە ، کە حەسانەوە لە مرۆڤ تێك دەدەن و پشوی لێ تاڵ دەکەن و ئارامی لێ هەڵدەگرن ، وەکو : گەرمی زۆرو دەنگە دەنگ و سەرما و سۆڵ و ...هتد . بۆیە لەدونیای نوێ دا هەوڵدراوە لە ڕێگای تەکنیك

---

[119] الله يتجلي في عصر العلم / ل : ٥٨.

[120] آداب اسلامية / محمد خير فاطمة / ج٣ / ١٤٥.

کارییەوە لەخانوبەرەو نامێرەکانی گواستنەوە دا گەرمی باش و هەوا گۆڕکێ و فێنکی و هێمنی و دەستەبەر بکرێت ، جگەرەی تێدا نەکێشرێت ، بۆ نمونە خوای گەورە فەرموویـــــەتی :﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ١٩ ﴾ واتە : لە ڕۆیشتندا مامناوەند بڕۆ ، دەنگت نزم بکەنەوە ، ناخۆشترین دەنگ دەنگی گوێ درێژە.

(د.منصف المرزوقی) دەنووسێ : ئایا دەزانی ئێمە بەدرێژایی کات ئەرکی پیس کەرێکی تری هەوایی هەڵدەگرین ، کەمەترسییەکانی لەو پیس بوونە کیمیایی یە باسکرا کەمتر نیە ، ئەویش دەنگە دەنگ و ژاوە ژاوە ، (الضجیج) ئایا زۆر جار هەیە بێزار نابی چونکە هەندێ جار دراوسێ دەنگی رادیۆو تەلەفزیۆن بەرز دەکاتەوە ، یان هەست بە ماندووبوون و دڵەڕاوکێ و سەر سوڕکێ و گیژخوارادن نابیت ؟ لە هەمان کاتدا ئەزانێ تووش هاتنت بەو دەنگە دەنگ و ژاوە ژاوە فشاری خوێنت بەرز دەکاتەوەو زیان بە تەپڵی گوێچکەت دەگەیەنێت و لێدانی دڵت خێراتر دەکات و زیان لەگلاندەکانت دەدات ، پاشان تێکچوونی دەروونی و دەماری کە لە مەترسی دا جیان؟ کەواتە : بۆ پشوودان پێویستە دەنگەکان نزم بکرێن ، بەڵام هێوری و کش و ماتی لە ولاتی خۆماندا بەدژواری دەستەبەر دەبێت : هۆڕنی ترومبێلە ، هەڵسانی فرۆکە ، هاوارو قیژەی هونەرمەندە ناودارەکان کە بە دوورودرێژی چیرۆکی خۆشەویستی خۆ دەگێڕنەوە! ... هتد ، کێشەکان بەردەوام لەزیادبووندان لەسەر حیسابی خەڵك و حەسانەوەی ئەوان"[١٣١].

بێگومان ئامێری تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و تەجیلەکان و هۆڕن و گرەی مەکینە و ترومبێلەکان و دەنگی ناهەنگ و بۆنەکان هەموو ئەوانە ژینگە پیس دەکەن ، ئەم دیاردانە وەکو دیاردەکانی تری ژینگە پیس کردنن وەکو بڕینی دارو کوشتنی

---

[١٣١] الدلیل في التثقیف الصحي/ د.منصف المرزوقي/ ل:٥٣.

گیاندارانی کێوی و نەهێشتنی باخچەو باغەکان و ...هتد ، بۆتە مۆدێل و مـۆرکێکی کۆمەڵایەتی وەرگرتووە : بێ ئەوەی حکومەت هەنگاوی بەڕاست بۆ چارەسەرکردنیان هەڵبێنێت. ﴿ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ ﴾ ، واتە : کوێرو بینا وەکو یەك نییە ، نە تاریکی و ڕوناکی ، نە سێبەرو گەرمایی زۆر .

لێرەدا قورئان ئاماژە بە ئایین و ڕوناکی و سێبەر دەکات کە بەختەوەری و خۆشی یان بۆ ژیانی مـرۆڤ و ژینگـە هـەڵگرتووە ، پێچەوانەی کـوێری و بـێ دینـی و تـاریکی و گەرمای زۆر (گڕ) کە بێزاری و دژوارییان بۆ مرۆڤ هەڵگرتووەو خۆشییەکانی لێ تـاڵ دەکەن ، بێگومان ئەمە فەرمایشـتەکانی خـودان لەگـەڵ هـەموو کـەس و چـینێ قسـە دەکەن ، لە هەر ئاستێ دا بێت ، بەهەر زمانێ بدوێ ، هەر ناسنامەیێکی هەڵگرتبێت.

(ام هولی) دەنوسێ : هەست کردن بە حەسانەوە لـە ژینگـەدا ، هـەر چـەند پـەی پـێ بردن و بیرکردنەوەو ڕەفتاری مرۆڤ چەند کاروبارێکی ئـاڵۆزو جـۆراو جـۆرن ، بـەڵام دەتوانرێ دوولایەنی لێـك جیـا بکرێتـەوە (سـۆزی بـە ئاگـایی –العـاطفی الشعوری- و هزری (العقلانی) لە ژیانی دا ، پاشان ئاستی هۆشیاری کۆمەڵایەتی چەندە کار دەکاتە سەر ئەو لایەنە .

(ف.کـرخ) لـە سـاڵی ١٩٦٨ دا دەربـارەی هەسـت دەسـتەواژەی کـەش و هەوایـەکی حەسێنەرەوە (الاجواء المريحة) بەکار دێنێت ، کە هەست کردن بە ئاسودەیی و گەرم و گوڕی دەروونی هاتنەدی وێنە بیرەکانی هەستەکان و سۆزی بە تەواوی بەجۆرێ لە جۆرەکان دەوروژێنێت .

مرۆڤ بە گشتی هەست بە پشوو دەکات ، بەڵام هەستەکانیشی بەشداری دەکەن بەپێی کارەکەیان ، دەتوانن جیاوازی بکەن لە نێوان هەسـت کـردن بـە ئاسـودەیی و ئـارامی بەرامبەر کەشی دەنگی و گەرمی و بینایی و هەوایی دا ، تا هەست کردن بە پشوو و حەسانەوە دروست ببێ دەبێ لەو ژینگە واتایی یە دا پەیوەندی فیزیایی لەبار دابین ببێت.

ئەو دۆخە پێویستی بە گەیاندنی وزەی فیزیایی و نەهێشتنی پاشماوەکان هەیە دوای بەکارهێنانیان لە ژینگەدا ، ئامێرە تەکنیکییەکانی نوێ لە باڵەخانەکان و دامەزراوەکاندا بە پێ ی جیاوازییان لە ڕوناکی و لە گەرم کردنەوەو فێنك کردنەوەو هەوا گۆڕکێ بە بەشێکی فراوانی دابین کردنی ئەو سازانە هەڵدەستێ لە ژینگەی کارو ژینگەی ژیاندا ، گەر لە ڕووی دەنگ و هەوا دابین بکرێ چاکتر لە قسەو دیالۆگی یەکتری تێ دەگەن و دەنگە موسیقی ییەکان باشتر لەرەیان دێ ، چاکتر دەنگە ناوێرەکان و ژاوە ژاوی بێزار کەر هەڵدەمژێ ..هتد.

ئەو جۆرە حەسانەوەیە تا ڕاددەیێ دژوارو ئاڵۆزە چونکە مرۆڤ بۆ ماوەیێکی درێژ دەنگەکان وەردەگرێ ، لەسەر هەمان ئاست و ژێ ی خۆی هاوکات زۆر ماندووبێ هێزو توانای دەکات ، گەر ئەو ژاوە ژاوە (الضوضاء) دەوام بکات هەستی بیستن تووشی زیانێکی زۆر دەبێت.

سیفەتە دەنگییەکانی ژینگە کار لە ژینگە دەکەن ، بە پێ ی قەبارەو سروشتی ڕووی خودی ژینگەکە (توانای مژینی دەنگەکانی هەیە یان نا) و تێکڕای ڕێژەی دزەکردنی دەنگەکان و ژاوە ژاوەکان بەناو نەخشەکانی ژینگەی ئەندازەیی دا و بەپێ ی مەودای بەکارهێنانی بۆشایی لەناو پەیکەری بیناسازی و سەرچاوە دەنگیەکان لەژینگەدا و ڕێکی و ناڕێکی دەرچوونیان و ماوەی دەوام کردنی هەر دەنگێ ، نمونەی تری لەو شێوەیە زۆرە .

هەست کردن بە ئارامی لەناو بازنەی سیفەتە دەنگی یەکانی ژینگەدا پێویستی بە سۆراغی کاریگەری لەرزینەکان و بەرکەوتنەکانە ، هەر چەندە مرۆڤ لەو دەنگانە تێ دەگات بەشێوەیەکی لە حاڵی بوونی دەنگ و لەرەلەرە دەنگی یە ئاساییەکان ، پێوەری سەرەکی پشوودانی دەنگی دەکەوێتە سەر ئاستی ژاوە ژاوەکان و ماوەی بەردەوامی و سروشتییان ، مەبەست لە ژاوە ژاو (الضوضاء) کۆی وزەی دەنگی یە کە کار دەکاتە

سەر سەر توانای ئاگایی لە بەرامبەر دەنگەکان لەلایەن مرۆڤەوە و کاردەکاتە پیشەو تەندروستی کۆ ئەندامی بیستنی.

ژاوە ژاو لـە ڕوانگـەی دەروونـی یـەوە بریتـی یـە (لـەو دەنگانـەی کـاری سـەلبی لـە فەرمانی کۆ ئەندامی چەقە دەمار دەکەن .

لە ڕووی فیزیاییەوە ژاوە ژاو و دەنگە دەنگ (کۆمەڵە دەنگێکی نارێکە[132]).

گەر بڕوانینە قورئان ئاماژە دەکات چۆن ڕوناکی و بریسکەی زۆر سۆمای چاو دەبات و مرۆڤ کوێر دەکات ﴿ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ ﴿٢٠﴾ ﴾ البقرة ئاماژەش دەکات دەنگی بەرز زیان لە مرۆڤ دەدات و کار دەکاتە سەر هەستی بیستنی و دوورنیە تووشی مەرگی بکات ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ﴿١٩﴾ ﴾
، واتە : قامك دەخەنە گوێچکەیان لەکاتی تریشقەدا لە ترسی مردن .

قورئان ئاماژە بە دەنگی سەروی بیستن دەکات ﴿ وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾ هود ، واتە : ئەوانەی ستەمکاریيان کرد دەنگیّ گرتنی و لەماڵەکانیاندا وەکو لەشێکی بێ گیان کەوتن ، کەواتە : دەنگی گەورەو تەقینەوەی گەورە کوشندەیە .

(ام هولی) دەربارەی دابەش کردنی دەنگە دەنگە زیانبەخشەکان دەنووسیّ : لێرەدا دەبن بەچوار بەشەوە :

---

[132] الانسان والبيئة/ ل:٢٩- ٣٠.

١. كـارتێ كردنـی دەروونـی ، ژاوە ژاو خـۆی بـە ڕەهـایی زیانبـەخش نیـە ، بـەڵکو کاریگەری دەکەوێتە سەر تەندروستی و هەستیاری مرۆڤ لە ڕاست ژاوە ژاودا .

٢. پەرچە کرداری پـەیت و چـڕ ( وەکـو پەرچـە کـرداری کـۆ ئەنـدامی هـەرس و دەماریی و سوڕی خوێن و هی تر).

بۆ نمونە : پەرچە کردارەکە خوێن بەرەکان گرژ دەکات و بڕی خوێن بـە ناویـدا کەم دەکاتەوە و دڵ زیاد لە ئاسایی لێ دەدات .

٣. زیاندان لە هەستی بیسـتن ، بەپلـەی جیـا جیـا زیـان لـە هەسـتی بیسـتن دەدات ، ئەگەر بکەوێتە بەر جۆرەها جۆری ژاوە ژاو و ماومیێ بەردەوام بێت ، خانـەکانی هەست و کۆ ئەندامی بیستن لەناوەوەدا دەشێوێنن و (کەڕی پیشەیی) ڕوودەدات ، وەك تووشی کەپسکەرە زەبەلاحەکان و ئاسنگەران دەبێت.

٤. بەشی هەڕەشەکردنی ژاوەژاو بە کوشتن ، لەکاتێ دا ڕوودەدات تووشی ژاوە ژاوی تیژو پەستانێکی بەرز دەبێ ، یەکەم دیاردەی دڕاندنی پەردەی گوێچکەیە ، دوایی کار لە مێشك و خانەکانی دەکات ڕاستەوخۆ لـە ئێسقانەوە تـا تـەواوی نـاواخنی کەللە سەر ، ئـەو دۆخـە بـە زۆری بـە مـردن کۆتـایی دێـت ، ئـەم دۆخـە لـەکاتی تەقینەوەی گەورەدا ڕوودەدات [١٣]. کەواتـە کـاتێ ژینگـە ئـارام دەبـێ ، کـە گـوڵ و گژوگیاو سەوزایی و ئاو و ڕوبارەکانی لێ بێ و ، دووربێ لـەژاوە ژاو گـڕەو تـەقـەو شەڕو هەراو قەرەباڵغی ، ئەوەی دەبیسترێ تەنیا خامۆشی یە یـان هـاژەی ڕوبـارو جریوەی بولبول و خوێنـدنی باڵندەکانـە ، یـان بیسـتنی قورئـان و موسـیقایەکی هێمنی گیانی و هێواشە ، کـە لەگـەڵ ئیقاعـەکانی مێشـکدا دەسـازێت و چـالاك و گورجی دەکات و دەیخاتە ئارامی و خۆشی یەوە .

[١٣] الانسان والبيئة / ل:٣١- ٣٢.

## بەشی حەوتەم

# کێشەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی

**ئیعجازی ٤٧ پەرەسەندنی دیموگرافی و فشارخستنە سەر ژیانی مرۆڤ:**

**ئیعجازی ٤٨-٤٩ دابین کردنی خۆراك و کێشەی برسێتی:**

**ئیعجازی ٥٠ پیشەسازی و ئابوری وزە:**

**ئیعجازی ٥١ ژینگە لە حوکمی مەهدی و مەسیحدا (علیهما السلام) کە دوا حوکمی خوا لەزەویدا جێگیر دەکەن:**

﴿ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ﴾ ...... واتـه : لـه ئـادەم ژنەكـەی دروست كرد ، لەو دوانە پیاو و ژنـی زۆری دروسـتكرد ، ئێستا ژمارەی دانیشتووانی زەوی و كوڕو كچەكانی ئادەم و حەوا گەیشتۆتە نزیكەی (٧) ملیار كەس .

## پەرەسەندنی دیمۆگرافی :

(ام هولی ) دەنووسێ : سەیر كردنی پەرەسەندنی مێژووی دەری دەخات كاتێ مـرۆڤ هات بۆ ناو ژیان و یا كە ڕێگا بنەڕەتەكانی ژیانی بۆ هەموار بـوو ، بـەلأم كارەسـات و گۆڕانی كەش و ئاو و هەوایی یە گەورەكان هانی دا لە ژینگـە جۆراو جـۆردا بـژیت ، جیـا لـە ژینگـەی یەكـەم بێ ، پەرچـەكرداری مـرۆڤ بـۆ سـەر گـۆڕان بـاری فیزیـایی بایۆلۆجی لە قۆناغەكانی پەرەسەندندا بەو شێوازە هات :

- لەناوی برد .
- لەگەڵ دۆخی تازە خۆی گونجاند.
- خۆی گونجاند ، بەلأم بۆ بەدەست هێنـانی هـەل و مـەرجێ ژیـانی تـێ دا بەسـەر ببات خۆی ماندوو كرد.

وەچەكان ئـەزموون و زانسـتە داهێنراوەكانیـان بـۆ یـەكتری گواسـتەوە بـە مەبەسـتی پاراستنی مانەوە و بەردەوامی كۆمەڵگای مرۆڤی .

مـرۆڤ زۆر چـاخی بەسـەر بـردو خـۆی مانـدوو كـرد بـۆ بـەرەو ڕووو بوونـەوەی دۆزە سـەرەكییەكەی لـە ژیانـدا ، تـا بـە كـرداری بەرهـەم هێنـان سامانەكان لـە سروشـتدا بەدەسـت بێنـێ ، كـە زۆر بـە دژواری بەدەسـت دێـن ، پاشـان چـۆن لـەو شـوێنانەدا خۆراكیان زۆرە ڕەگەز بپارێزێ لە دژی گۆڕانە سروشتییەكان یان چۆنیەتی بەدەست هێنانی سامانەكان ، هەندێك گەل بەرلەگەلی تر توانیان قۆرغی بكەن .

دیسـان نـەگونجان و نـاڕێكی لـە دابەشـبوونی دانیشـتووان لـە زەوی داو گەشـەكردنی ئابووری و شارستانی نا هاوسەنگی یان بەشداری لـەو مانـدووبوون و ئەركـەدا كـرد ،

پەرەسەندنی هێزی بەرهەم هێنان کە پشت بە سەرچاوە تازەکانی وزەو پەرەسەندنی بەرهەم هێنانی ئامێرو مەکینەکان لە تەکنەلۆژیادا یارمەتیەکی بەشێکی هەرە گەورەی مرۆڤی دا لە قۆناغەکانی پشت بەستنی ڕاستەوخۆی بە سروشت هەڵگوازێت ، ئامێرە فیزیاییەکان مرۆڤی گۆڕی بۆ شێوازی تەواوتر لە ئامێرەکان و مەکینەکان و تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی بەردەوامی بە مرۆڤدا بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی سروشت [١٢٤].

خوای گەورە لە چەندان ئایەت پێشبینی دەکات لە داهاتودا مرۆڤایەتی ئامرازەکانی دەگۆڕێ لە چالاکی یەکانـدا ، باشتر بن لە ڕابردوو بۆ ئاسانکردنی ژیان و سوود وەرگرتنی زیاتر لە بەرهەمە سروشتییەکان و بەشی زۆربوونی دانیشتوان بکات ، مادام دادگەری کۆمەڵایەتی و برایەتی و پێکەوە ژیان کۆیان بکاتەوە : ﴿ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾ ، واتە : ئەسپ و ئێستر و کەرمان بۆ سواری و جوانی دروست کردووە ، داهاتوو شتی وا دروست دەکات ئێوە نایزانن ،﴿ وَلَهُ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡمُنشَـَٔاتُ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ﴿٢٤﴾ ﴾ ، کەشتی هەیە لە دەریا دروست کراون وەکو چیاکان وان .

لێرەدا قورئان ئاماژە بە داهێنانی ئامێری تازەی گواستنەوەی هاتوچۆ دەکات لە ئۆتۆمبێل و فڕۆکەو شەمەندەفەرو پاپۆڕی گەورە لە داهاتوودا ، ئاماژە دەکات چەرخی داگیر کردنی ئاسمان دێ و مرۆڤ دەتوانێ بە ئامێرەکانی سەردانی ئاسمان بکات و سنوری کێشکردنی زەوی ببەزێنێ ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾ ﴾ وەك لە کتێبی گەردووناسی دا باسمان کرد.

---

[١٢٤] البيئة والانسان / ل:٩٨- ٩٩.

دەربارەی داهاتووی شارستانی نویێ دەفەرمووێ : ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا﴾ واتـه : تاکاتێ زەوی خۆی جوان کردو خۆی ڕازاندەوە ، خەڵکی وایان زانی ئەوان بـه توانـان بەسەر زەوی دا ، ئەو کاتە فەرمانی ئێمە دێ شەوێ یان ڕۆژێ.

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات ڕۆژێ دێ زەوی بە ئامێرو ئامرازی تەکنەلۆژی کاربەرەو ئـاوەدانی و دیکـۆراتی تـازە خـۆی برازێنێتـەوە ، مـرۆڤ ئـەو کاتـە وا دەزانـێ جیهـان کۆنترۆڵی ئەوەو ژینگەی لە ژێـر ڕکێفـی خۆیدایە ، ئـەو کاتـە فـەرمانی خـوا دێ بـۆ گۆڕانی گەردوونی و هاتنی فەرمانی حوکمی خوا لە زەویدا ، کاتێ زەوی شەوەو هـەم ڕۆژە .

﴿أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ یان ئەگەر خـانووی ڕازاوەیـان هـەبێ یـان بـە ئاسمانـدا سـەر بکـەون .﴿وَزُخۡرُفٗاۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُتَّقِينَ ٣٥﴾ الزخرف: ٣٥ لێـرەدا قورئـان ئاماژە بە داهاتنی باڵاخانە بەرزو فراوان و ڕازاوە دەکات ، کە دەرگاو پەنجەرەی جوان و زۆرو شوشەیان هەیەو قەنەفە ماڵەوەو دەرەوەی پـڕ کـردووە ، نـاو مـاڵی ڕازاوەیـان هەیە ، وەکو ئیمڕۆ دەیانبینین. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (يتطاولون في البنيان) رواه مسلم، واتە : بینای بەرزو فراوان دروست دەکەن.

دەفـەرمووێ (يتقارب الزمان) رواه احمـد ، واتـه : (کـات نـزیـك دەکەوێتـەوە) . بـەهۆی ئامێرەکانی سواری تیژڕەو و مۆبایل و ئینتەرنێت و تەلەفزیۆن. (وتتقارب الاسواق) رواه احمد اسناده صحيح ، واتە : بازاڕەکان لێك نزیك دەبنەوە ، بـەهۆی ئامێرەکـانی هاتوچۆو زانینـی نرخـی کاڵاکـان لـە تـەواوی بازارەکانی جیهانـدا بـەهۆی مۆبایـل و ئینتەرنێتەوە . (لا تقوم الساعة حتى يكثر فيكم المال) متفق عليه ، واتە : قیامەت

نایەت تا سامان و دارایی و پارە لە ناوتاندا زۆر دەبێت ، کەواتە : ئەم گۆڕانە ژینگەو دیمەنی زەوی گۆڕی و چالاکی ئابووری زیاتر کرد .

(ام هولی) دەنووسێ : بەو پەرەسەندنە بە شێوەیەکی شۆڕشی وو وەرچەرخانی دیمەنی ڕووی زەوی گۆڕی ، لەهەندێ ولآتدا کە چالاکی ئابووری بەرزە ، یان لە هەندێ ناوچەی قەرەبالغدا ، دەبینی ژینگەی سروشتی وردە وردە لە کورتی دەدات لە برانەوەی خێرادایە.

قورئانیش ئاماژە دەکات : ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ ﴾ النحل ، واتە : ئەوەی لای ئێوەیە (لە مادده) لە بن دێ و کۆتایی دێت ، ئەوەی لای خوایە (لە چاکەکاری و جیهانی سەرووی ماددی) دەمێنێتەوە﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ ﴾ الرحمن ، واتە : هەرچی لەسەر زەویە لە گیاندارانی لەناو دەچێ زاتی پەروەردگاری شکۆدارو بەرێزت دەمێنێتەوە .کەواتە مردن و لەناوچوون و گۆڕان بۆ ماددە یاسایێکی مسۆگەرە ، تەنیا زاتی کردگارە گۆڕان و لەناوچوونی بەسەر نایەت ؟

عەللامە (الزمخشری) لە (الكشاف) دەڵێ : (وجه ربك : ذاته) مەبەست لە زاتی خوایە ، وەکو خەڵکی بەکاریان هێناوە وتویانە (اين وجه عربي كريم ينقذني من الهوان) زۆر لە ئەسحاب وشەی (الوجه – اليد – الاستواء – نزول – جاء - ...هتد) لە ڕاست خوادا بە مەجاز لێك داوەتەوە .

(القرطبی) لە تەفسیرەکەی دا لەسەر ئەم ئایەتە لە (ابن عباس) ی گێڕاوەتەوە : (الوجه عبارة عنه) واتە (الوجه ؛ بریتی یە لە خودا) (ابو المعالي) دەڵێ : (الوجه) لای زۆر لە زانایانمان مەبەست لە وجودی خوای کردگاری مەزنە ، شێخی خۆشمان ئەوەی بەدڵ بووە ﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الذاريات ٤٧ لێرەدا (اید – دەست) وەکو لە (تفسير الطبري) دا هاتووە ، لای (ابن عباس) و (المجاهد) و (قتادە) و (ابن زيد) و (سفيان) بە (القوة) مانا کراوە ، واتە (بەهێز) ﴿ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ

إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا ﴿٤٢﴾ ﴾ القلم: ٤٢ ، (ابن عباس و سعيد بن جبير) وتويانة (اي عن امر عظيم) ، عەرەب وتويانە (شمرت الحرب عن ساق يعني اقبال الاخرة وذهاب الدنيا) ، واتە : كارەساتى گەورە پەيدا دەبىّ . عەرەب وتويانە قاچم بۆ جەنگ هەڵكرد ، واتە هاتنى پاشەڕۆژو نەمانى دونيا لە (تفسير الدرالمنثور للسيوطي) دا هاتووە ( بوخارى) لە(ابي سعيد و ابن مندة) لە(ابو هريرة) يان گێڕاوەتەوە (يكشف الله عزوجل عن ساقە) .

(عبد بن حميد و ابن منذر) لە (سعيد بن جبير) دەگێڕنەوە : لە ئايەتى (يوم يكشف عن ساق) لێيان پرسى ؟ ئەو زۆر تورە وتى : (ان اقواما يزعمون ان الله يكشف عن ساقە وانما يكشف عن امر شديد) واتە : هەندىّ كەس پێيان وايە خوا لە قيامەتدا قاچى هەڵدەكات ، بەڵكو ماناى ئەوەيە كارەساتێكى گەورە دەردەخات .

دەربارەى ئايەتى ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾ الأعراف: ٥٤ پێشەواى بڕواداران عەلى ﷺ پێچەوانەى (الهشامية) و (الكرامية) كە دەڵێن : خوا لەسەر عەرشە فەرموويەتى : (ان الله تعالى خلق العرش اظهارا لقدرتە لا مكانا لذاتە) (قد كان ولا مكان وهو الان على ماكان) (الفرق بين الفرق / علامة ابو منصور البغدادى/ ل:٢٤٨) ، واتە : خوا عەرشى بۆ دروست كردنى تواناى خۆى دروست كردووە نەك جێگايىّ بۆ خۆى ، كاتێك جێگا نەبوو خوا هەبوو ، ئێستاش بىّ جێگايە . بەو پێيە (الاستواء) بە ماناى (إستولى) مانا كراوە ، واتە : دەسەڵاتى بەسەردا گرت. هەرچى زاناى ترە وەكو (ابن حنبل و ابن تيمية) ئەوانە ئەم وشانە بەمەجازى بەدروست نازانن و بە سيفاتى خوايان لە قەڵەم دەدەن ، بۆ نمونە (د.سليمان الاشقر) لە (العقيدە فى الله) دا دەنووسىّ : خوا لە ئاسمانىّ دايە لەسەر عەرشى خۆى ، خوا ڕووى هەيە بە ڕووى دروست كراوانى ناچىّ ، دەست و قاچى هەيە بە دەست و قاچى دروستكراوانى ناچىّ ... هتد) .

لە زانايانى تازەى خۆرئاوا (بول كلارنس ئەبرسولە) مامۆستاى سروشتى زيندەگى دەڵىّ : من ناتوانم خودا وەكو ماددەيىّ سەير بكەم كە چاوەكان پەى پىّ دەبەن و لە

شوێنەکی تر نیە ، یان لەسەر عەرش و کورسی دادەنیشێت ، کاتێ (کیتابی موقەدەس) خوامان بۆ وەسف دەکات زۆر وشەی دنیایی بەکاردێنێ ، کە بۆ وەسفی ژیان و مێژووی لەسەر زەوی دا بەکاریان دێنێ ، بەلاّم خوا بونەوەرێکی گیانی نەبینراوە ، بەڵکو لەسەرووی ئەمەوەیە هەر چەندە مرۆڤ لە جەستەو گیان پێك دێ ، ئەو ناتوانێ بە وەسفێکی ڕۆحانی رووت وەسفی بکات لە سنووری شارەزای خۆیدا نەبێ ، کەچی ئێمە دەتوانین بەو خوایە بگەین ، کە بە هزرو دانایی و ویست وەسف دەکرێت".[125]

بەو پێیە کێشەی ناو و سیفەتەکانی خوا نەك هەر لەناو موسڵمانان کێشەی لەسەر هەیە ، بەڵکو لەناو ئایینەکانی تریش بەدرێژایی مێژوو مشت و مڕی لەسەر بووە !

(ام هولی) دەڵێ : قسە کردن زیاتر لەسەر ژینگەی پیشەسازی مرۆڤ چڕ دەکرێتەوە ، ژیانی مرۆڤ لەو ژینگەیەدا سنووردارە ، نمونەی ئەوە دژواری زاڵ بوون و پیادەکردنی تەکنیکی پێشکەوتووە لە هەندێ لایەنی ژیاندا لە هەندێ ولاّتی گەورەدا ، وەکو (دابینکردنی کارەباو ئاوی پاکژ بۆ خواردنەوە).

پەرەسەندنی مرۆیی زۆر جار بە تەقینەوەی دانیشتوونی (الانفجار السکانی) وەسف دەکرێ ، ئەو کات گوازرش دەکرێ خۆراکی پێویست بۆ دانیشتووانی زەوی دابین بکرێت ، ئەو مەسەلەیە سۆنگەی گرنگی دانی دام و دەزگای نێودەوڵەتییە ، لەوانە ولاّتە یەکگرتووەکان ، وەکو ڕواڵەتێکی تایبەتی ئەو بایەخە ئامادەکردنی چەند توێژینەوەو شیتەڵکاری و پێشهاتێکی تایبەتە بەوپەرەسەندنەی داهاتوو .

خەملاّندنەکانی ژمارەی بە پێ ی زانیارییەکانی ولاّتە یەکگرتووەکان لە ساڵانی داهاتودا لە (٢٠٠٠) ز دا ئەگەر لە ساڵی (١٩٧٠) دا بەراورد بکرێ زیاتر دەبێت ، زانراوە ژمارەی دانیشتوانی گۆی زەوی بە لەباری زیاد نابێ ، لە ولاّتانی هەژاردا زۆر

---

[125] *الله یتجلی في عصر العلم / ل:٣٧.*

دەبێ ، لە وڵاتانی پیشەسازی دا بە هێواشی زیاد دەبێ ، لە ساڵی ١٩٣٠ دا ژمارەی دانیشتووانی ئەوروپا (١٠٠) ملیۆن زیادی کردووە ، کەچی لە کیشوەری ئاسیادا ملیارێ زیادی کردووە ، گەورەترین زیاد بوون لە ئەمریکای لاتینی یە ، پاشان ئەفریقیا ، پاشان ئاسیا ، بە گشتی ژمارەی دانیشتووان تا ساڵی (٢٠٠٠) دیارە .

لە ساڵی (١٨٣٠) ژمارەی دانیشتووانی زەوی (١,٥) ملیار کەس بووە ، لە (١٩٠٠) بۆتە (١,٦)ملیار ، ساڵی (١٩٣٠) بۆتە (٢,٥) ملیار ، ساڵی (١٩٦٠) بۆتە (٣,٥) ملیار ، ساڵی (١٩٨٠) بۆتە (٤,٥) ملیار ، ساڵی (١٩٩٠) بۆتە (٥,٨) ملیارو ساڵی (٢٠٠٠) گەیشتۆتە (٧,٥) ملیار کەس ، ئاکامەکانی ئەو زۆربوونە لە ڕوی کێشەکانەوە زۆرە ، لەژمارەو چڕی دا زیاتر دەبێ و ناکرێ کورت بکرێتەوە ، بەڵام زۆرترینی کێشەکان کە قسەی لەسەر دەکرێ ئەوانەن :

- قۆرخ کردن و زیانگەیاندن و بەفیڕۆدانی سەرچاوەکانی ژینگە بە چالاکی مرۆیی بەرهەم هێنانی و غەیری بەرهەم هێنانی .
- تەقینەوەی دانیشتوانی کە لە کەم کردنەوەی ژمارەی مردنی مرۆڤ و درێژکردنی تەمەنی مرۆڤەوە سەرهەڵدەدات .
- هەوڵدانی بەردەوام بۆ دروست کردنی مەڵبەندە ژیاری و شارستانییەکان و نەهێشتنی لادێیەکان ، ئەمە شێوازی ژیان دروست دەکات و ئازادی تاك بە ڕێژەیێکی دیاری کراو و گەش سنووردار دەکات .
- پەرەسەندنی گواستنەوە بەتایبەتی جووڵەی دانیشتووان بە ئارێکی (دیسان تواناکانی هاتوچۆو پەیوەندییەکان بە تەکنیکی بێ سنوور).
- گۆڕانی پێکهاتەی دانیشتووان ، بەتایبەتی گواستنەوەی دانیشتووان لە گوندەکانەوە بۆ شارەکان و دەست گرتن بە کارەکان و سوودوەرگرتن لە خزمەتگوزارییە پێش کەوتووەکانی ناوی .
- گەشەو هەمە جۆری پێویستیەکانی بژێوی تاك ، ئەمەش کارێکە گرنگی بە پێویستی چەند قاتی قەبارەی بەکاربردنی بەرهەم نەهاتوو دەدات .

- درێژ کردنەوەی تێکڕای خوێندنگاکان بەقۆناغە بنەڕەتیەکانەوەو فراوان کردنی بوارەکانی خوێندنی بالاّ (بەرز کردنەوەی ئاستی چالاکی هزری).
- گەشەپێدانی قۆناغی سێ یەم لە پێشکەوتنی کۆمەڵگا لەسەر حیسابی قۆناغی یەکەم و دووەم .
- زیادبوونی بێکاری و دەستبەتاڵی بەرامبەر کەمبوونەوەی کاتی کار ، بەکارهێنانی تەکنیکە پێشکەوتووەکان بە بەردەوامی لەجیاتی چالاکی ماسولکەیی مرۆڤی ، بەڵکو لە جیاتی زۆرێ لەچالاکی یە هزرییە شێوەییەکان ، وەکو ماتماتیك و چاودێری و ڕکێف و تەواوکارێتی ئامێری[١٣٦].

**دابینکردنی خۆراك و كێشەی برسێتی :**

﴿ فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ ﴿٣﴾ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ﴿٤﴾ ﴾ ، واتە : پەروەردگاری ئەو کەعبەیە بپەرستن ، کە لەکاتی برسێتی خۆراکی پێدان و لە ترس بێباکی کردن.

﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ﴾ ، واتە : تاقی تان دەکەینەوە بە کەمێك لە ترس و برسێتی و کەمی دارایی و کەمی گیانداران و میوە ، مژدە بدە بە ئارامگران.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئایەتە پێشبینییەکی تایبەتی یە بۆ ئەو شەڕو گەمارۆ ئابووری و ترس و لەرزەی بەسەر عێراقدا دێ ، لە هەمان کاتدا ئاماژە بۆ کێشەی زۆربوونی دانیشتوان و برسێتی و کەم بوونەوەی بەرهەمە ئاژەڵی و ڕووەکی یەکان ، پاشان پیس بوونی خاك و ژینگە ، کە بەرهەمەکانی ئاژەڵی و ڕووەکی کەم دەکاتەوە ، هەروەها نەبوونی حوکمی قورئان و دادگەری کۆمەلاّیەتی و بوونی حوکمی

---

[١٣٦] الانسان والبيئة /ل:٩٨- ١٠٤.

سەرمایەداری خەڵکی دەکات بەدوو چینەوە ، (١) دەوڵەمەند (٢) هەژار (الفقير) و نەدار (المسكين) . (ابي نضرة) لە (جابر) گێڕاویەوە وەکو لە (صحیح مسلم) دا هاتووە ، (يوشك اهل العراق الا يجبى لهم قفيز ولادرهم ، قلنا من اين ذاك؟ قال : العجم يمنعون ذاك ، ثم قال : يوشك اهل الشام الايجبى لهم دينار ولا مدي ، قلنا من اين ذاك ؟ قال : من قبل الروم ، ثم سكت هنية ، ثم قال : قال رسول الله (ﷺ) : يكون في آخر امتي خليفة يحثوا المال حثيا لا يعده عدا) (التاج الجامع للاصول/ج٥/ الشيخ منصور علي ناصف / ل:٣٤٢/ بابەت (الخليفة المهدي عليه السلام) ، واتە : نزیك دەبێ خەڵكی عێراق (قەفیزو درهەم) یان بۆ نەیێت ، وتمان لەكوێوە ئەوە دەبێت ؟ وتی : بیانیەكان ئەوە قەدەغە دەكەن ، پاشان وتی : نزیك دەبێ خەڵكی شام دینارو مودیان بۆنەیێ ، پاشان دەمێك بێ دەنگ بوو ، پاشان وتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : لەدوایەكانی ئوممەتی مـن خەلیفەیێ دێ سامان بێ شومار دابەش دەكات .

لێرەدا ئاماژە بە ڕوودانی گەمارۆی ئابوری دەكرێ بەسەر عێراق و شامدا لەلایەن بیابانییەكانەوە ، ئەوە بو لە ساڵی (١٩٩٠) كاتێ سەددامی داری شەیتان كوێتی داگیر كرد ، بە (٦٠٠٠٠) سەربازەوە ئەمریكاو هاوپەیمانان دوای سەركەشی كردنی سەددام لە كشانەوە لە (١٩٩١) دا فرۆكەكانیان بە چڕی عێراقیان بۆردوومان كردو نزیكەی (٣٠) دەوڵەت بە سوپاوە لە سوپای عێراقیانداو ڕێگای كوێت تا بەسرەو ڕێگای مردن بوو نزیكەی (١٠٠) كاتژمێری خایاند ، پاشان گەمارۆی ئابووری خرایە سەر عێراق ، دوایی لە (٢٠٠٣) دواجار لە عێراقی داو بەیەكجاری ڕوخاندی و سەرانی ڕژێمی راپێچەی زیندان و سێدارە كرد.

پێغەمبەر (ﷺ) مژدەی داوە بە هاتنی مەهدی لە خۆرهەلآت ، ئەو گەمارۆیە كۆتایی دێت و دژ بە ڕۆمەكان و بیابانەكان ڕادەوەستێ و جەنگی جیهانی سێ یەمی دەججال ڕوودەدات و بەسەركەوتنی موسڵمانان تەواو دەبێ ، ئەو كاتە حوكمی خوا سەر زەوی دادەپۆشێ و كۆتایی بە ستەم و هەژاری و خراپەكاری دێت ، هەر حەوت كیشوەرەكان

وەکـو (٧) ویلایـەتیان لێ دێـت لـەژێر حـوکمی ئیسـلامدا ، جـارەکی تـر ژینگـە دەبوژێتەوەو بەرەکەتی خـوا لـە ئاسمـان و زەوییـەوە هەڵدەقوڵێ و ئـاو و بـاران زۆر دەبـێ و ڕووەك زۆر دەبـن و سـامانەکان لـەزەوی و ئاسمانـدا بەرەکـەت و فـەڕییان دەکەوێتێ و دانیشتووان زیاد دەبێت .

﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ ، واتـە : گـەر خـەڵکی شـارەکان بڕوا بێنن و تەقوا بکەن دەرگاکانی بەرەکەت و فەڕ لە ئاسمان و زەویدا بـە ڕوویانـدا دەکەینەوە ، بەلأم بەدرۆیان خستەوە ئێمەش بەهۆی بەدرۆخستنەوە گرتمانن .

(ابو داود و ابو نعیم) گێڕاویانەوە (انە ستخرج الکنوز ویقسم المال ویلقی الاسلام بجرانە) ، واتە : مەهدی خەزێنەکان دەردێنێ ، سامان دابەش دەکات و ئیسلام بەدراوسێ کانی دەگەیێنێت. بەو پێیە مەهدی لە ئاستی دانیشتوواندا خەزێنەکان لـە ئـاو و نـەوت و سووتەمەنی و یۆرانیۆم و کانزاکانی دەردێنێ ، بەیەکسانی و بەپێی پێویست بەسـەر دانیشتووانی زەوی دا دابەشی دەکات و ئیسلام بە کیشوەرەکان دەگەیەنێت ، بەمـەش کێشەی ئایدۆلۆژیاو ئابووری چارەدەبێت و چینایەتی نامێنێ .

(ابـن ماجـة و الحـاکم) بـە (اسـناد صـحیح) گێڕاویانـەوە : (تـنعم امـتي في زمـن المهـدي نعمـة لم ينعمـوا مثلـها قـط ، ترسـل السـماء علـيهم مـدرارا ولا تـزرع الارض شـيئا مـن النبـات الا اخرجـه والمـال كـدوس ، يقـوم الرجـل فيقـول : يـا مهـدي اعطـني فيقـول : خـذ). واتـە : گـەلی مـن لەسـەردەمی مەهـدی دا دەکەونـە بەهرەیێکـەوە هـەرگیز ئـەومیان نـەبینیوە ، ئاسمـان ڕێژنـە بـاران دەبـارێنێ هەرچـی زەوی بیچـێنێ دەیڕوێنـێ ، سـامان کەڵەکـە کـراوە ، پیـاو هەڵدەسـتێ دەڵـێ : مەهـدی سـامانم بدەیـە ، دەفـەرمووێ : هـا بیگـرە ، (زیـد بـن الحـواری) کـە لـە (اسـناد) ەکەدایـە لای (ابـن حنبـل) باشـە ، بڕوانـە

(الجرح والتعديل / ابن ابي حاتم / ج٣/ ل:٥٠٣) (نعم بن حماد) گێڕاویەوە (یخرج رجل من ولد الحسین من قبل المشرق لوا ستقبلته الجبال لهدمها اول لواء

یعقده المهدي یبعثه الی الترك فیهزمهم) رواه نعیم بن حماد/ الفتن

(اولئك قوم یأتون من المشرق حردین معهم رایان السود شعارهم اقبل اقبل یعني بكوش بكوش) نعیم بن حماد

. واته : پیاوێ لەوەجاخی حوسێن دێ لە خۆرهەلأت گەر چیا بێتە پێشی پیەوە تەختی دەكات ، (عێراق) خۆرهەلأتە ، مەهدی لەنەوەی حوسێنەو حوسێنی یە .

یەكەم جەنگی مەهدی لەگەلّ تورك دەبێ ، پاشان بەرەو شام دەچێ )

وە () گێڕاویەوە اولئك قوم یأتون من المشرق حردین معهم الرایات السود شعارهم اقبل اقبل یعني بكوش بكوش) كەواتە : ئالأ رەشەكان كوردەكانن دروشمیان بكوش بكوشە ، ئەمانە نیشانەیەكی كاتی دەركەوتنی مەهیدن ، كە لە وەجاخی حوسێنە دژی سەفیانی كە لە شام دێ و دەجال كە لە عێراقدا دەجەنگێت.

بەكورتی : كێشەی ئایدەلۆژی و كێشەی ئابوری و كێشەی ژینگەو زۆربوونی دانیشتوان و كێشەی ئاسایش و كێشەی دادگەری كۆمەلأیەتی لەسەر دەستی مەهدی چارەسەر دەبن ، نەك بە ئەمریكاو ولأتە یەكگرتووەكان ، وەكو دەبینین تا ئێستا نەیانتوانیوە كەمترینی ئەو كێشانەو كێشەی كوردو ئەمنییەت و هەژاری و عەرەب و ئیسرائیل چارە بكەن ، هەر هەنگاویشیان بۆ نەناوە ، بەلّكو خۆیان پەرەپێدەری ئەو كێشانەن چونكە نانی خۆیان و بەرژەوەندی كەسایەتی خۆیان لەوەدا دەبینن.

(ام هولی) دەنووسێ : پێویستە سەرچاوەکانی ژینگە بە پەیوەندی لەگەڵ تەقینەوەی دانیشتواندا هەڵسەنگێنرێ ، ئەو سەرچاوانە بۆ مانەوەی مرۆڤ پێویستن ، لەوانە ناوی شیرین و خۆراك ، بەپێ ی سەرچاوە زانراوەکان (٦٠٪)ی دانیشتووانی زەوی لە (١٩٦٠-١٩٦٣) دا ڕۆژانە تاکێ (٢٢٠٠) کالۆری (تاوزە)ی بەدەستی نەهێناوە، کەچی لە ولاَتە پێشکەوتووەکاندا ڕۆژانە (٣٠٠٠) تاوزەیە ، بەلاَم ئەو پەڕی کەمی پێویستی مرۆڤ ڕۆژانە (٢٧٠٠) تاوزە (السعرة الحرارية) یە ، لەهەمان کاتدا کێشەکە لەبارەی چۆنیەتی دابین کردنی بەشکردنی پرۆتینات سەری هەڵدا ، کە لە هەموو ماددەکان پتر لە بەرهەمی ئاژەڵی دایە وەکو شیرو هێلکە و گۆشت ، بەلاَم لە ولاَتە هەژارەکاندا تێکڕای بەکارهێنانی ڕۆژانەی تاکێ لە پرۆتینەکان تەنیا (١٠) گم، کەچی لەولاَتە پێشکەوتووەکاندا (٤٤)گم ، بەپێ ی سەرژمێری ولاَتە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٦٣)دا تەنیا (٢٨٪)ی خەڵکی زەوی خۆراکی تەواویان دەست دەکەوێ لە (١٢٪) یان لە ئاستی هەرە نزمدان و (٦٠٪) یان لە برسێتی دان.

گرنگترین سەرچاوەکانی خۆراك ڕووەکی سەوزە ، کە وزەی خۆر بۆ وزەی کیمیایی دەگۆڕن و لە ریشاڵی تەنی ڕووەکدا کۆ دەبنەوە ، تەنیا ڕووەك خۆرەکان دەتوانن ماتە وزەی کیمیایی ناو ریشاڵەکانی ڕووەکەکان بۆ وزەی کیمیایی بگۆڕن و لە ریشاڵی ئاژەڵیدا ، چالاکی کرداری ئەو گۆڕانە لە (٢٠٪) تێ ناپەڕێت ، بەهەمان شێواز لەکاتی خواردنی ئەتەمی ئاژەلاَندا لەلایەن مرۆڤەوە وزە دەگۆڕێت ، پوختەی چالاَکی ئەو سوودەی مرۆڤ لەوزەی کیمیایی بنەڕەتی بەدەستی دێنێ ناگاتە (٦,٢٥٪).

تەکنەلۆژیای کشتوکاڵ و پیشەسازی خۆراکەکان کاریگەرییەکی ئیجابی هەیە لە برگەیێکی ئەو هاوسەنگی یەدا لە بەرامبەر ئەوەدا دوو توانای بنەڕەتی هەیە :

١. گروپی یەکەمین : ئەو پەرەسەندنە لە ئامێز دەگرێ لەبەرهەم هێنانی ئاژەڵی دا سەری هەڵدا .

٢. گروپی دووەم : دەرهێنانی پرۆتینەکانە لە ڕووەکەکان لە پێك هاتەو تامدا بە پوختەکراوی، کە هاوتەریبی ئاژەڵی بێ یان بەرزتر بێت ، هەرچی تەقینەوەی دانیشتوانە لە ولأتە هەژارەکانداو گرفتی دابین کردنی چاوگەکانی خۆراکە ، بووە هاندەر بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەیێکی زانستی بۆ چارەکردنی کێشەی خۆراك ، ئەوە بۆ ڕەشبینی رابردوو کۆتایی پێ هات لە راست سەرکەوتنداو لە مەکسیك و فلیپین دا توانرا دانەوێڵەی بەهار بەرز بەسەرکەوتوویی بەدەست بێت ، ئەو سەرکەوتنە لە ساڵی (١٩٤٤) دا مژدەی پێدراو ئێستا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە .

ڕووەکی لقی دووڕەگی نوێ ی برنج (Ir5-IR٨) توانی پێنج قاتی ئەوەندەی بەرهەمی برنجی ئاسایی زیاتر بکات ، گەنمی دوو ڕەگ (الهجینە) ی نوێ ی مەکسیکی توانی لە ساڵی (١٩٥٦) دابەشی هاوولأتیانی بکات ، بەرهەمی یەك هەکتار لەو ولأتەدا لە (٥٥٠) کگم لە ساڵی (١٩٥٠) بۆ (١٩٧٠) بۆ (٢٥٣٠) کگم بەرز بۆوە .

ئەزموونی چاندنی دانەوێڵەی نوێ لە هەر یەکێ لە ولأتانی تری جیهان وەکو هیندستان و پاکستان و سریلانکاو ئەمریکای باشوورو ولأتانی تری جیهان لە ساڵی (١٩٦٨) و (١٩٦٩) دا وەرچەرخانێکی چاوەڕێ نەکراوی لە خەملأندنەکانی ئەزموونی رابردوو پەیدا کرد ، بۆیە پسپۆڕانی ئەو بوارە ئەو ماوەیەیان بە (شۆڕشی سەوز) ناوزەد کرد، بەلأم ئەو بەرهەمە زۆرەی ئەو داهاتانە کێشەی ئابوری – ناوچەیی نوێ ی لەهەمان کاتدا پەیدا کرد ، لەبەرامبەریشدا کێشەی پێویستی زۆر بە ئاودان ، دیسان پێویستی پتر بە پەینی کیمیایی (الاسمدة) و دەرمانی پتری قەلأچۆکردنی مێروو (مبید الحشرات) و کارەساتی تری کشتوکاڵی زیاتر کرد ، ئەمەش پیسبوونێکی ئاوی فراوانی لە ئاوی سەرزەوی و ژێر زەوی دا خولقاند .

زۆر نومێدی ئەوە دەکرێ داهاتوو پرۆتین لە ڕێگای پەروەردەکردنی زیندەوەرانی میکرۆسکۆبی وەکو بەکتریا بەرهەم بێنرێت ، خانەی وەکو بەکتریاو هەوێنەکان (الخمائر) و برژانگدارەکان (الهدابیات) لە (٣٠-٦٠ ٪) یان پرۆتینەو لە پرۆتنی ئاژەڵی

جیاوازی نیه ، ئەوانه زوو زیاد دەکەن و ماوەی زیادبوونی کەرت بوونی خانەییان (۲۰-۲٤۰) خولەکه ، ئەو ژینگەییەی تێ دا گەشه دەکەن دەبێ خۆراکی سادەی تێدا هەبێ و کاربۆنی شەکرو نایترۆجین (ئامۆنیا یان گازی نایترۆجین) و هەندێ خوێی ئەندامی تێدا هەبێت ، یەکێ لەو چاوگانەی به ئاسانی ئامادە دەکرێ بۆ ئامادەکردنی ژینگەیێکی خۆراکی کاربۆنی بریتی یه له کاربۆهیدراتی شلی ناو نەوتی خاو .

ئەمەش ناکرێ ئەو دژایەتی و پێچەوانەییەی له جیهانی ئێستا هەیه له یاد بکەین له ڕاست لێکۆڵینەوەی کێشەی دابین کردنی خۆراکدا ، دەوڵەت هەیه بەرهەمی کشتوکاڵی زۆره ، دەوڵەتی تریش هەیه بەدەست برسێتی یەوە دەناڵێنێت[۱۳۷] .

بێگومان ئیسلام بۆ چارەکردنی کێشەی وڵاته هەژارەکان جگه لەو چارەسەره زانستییانەی باسکران زەکاتی پارەو ئاژەڵ و دانەوێڵەی داناوه ، گەر وڵاته دەوڵەمەندەکان زەکات کۆ بکەنەوەو ڕەوانەی وڵاته هەژارەکانی بکەن بێگومان زۆر به ئاسانی دەتوانن هەژاری و برسێتی لەو وڵاتانەدا کۆتایی و پێ بێنن و هەر نەبێ له ئازارەکانیان کەم بکەنەوە ، پاشان جگه له زەکات کۆمەکی و هاوکارییان بکەن ﴿ ۞ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ ﴿٦٠﴾ ﴾ ، واته : زەکات تەنیا بۆ هەژاران و نەدارانه .

﴿ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾ ، واته : ئەو نەچۆته ناو تەگەرەوە ، تۆ چوزانی تەگەره چیه ؟ ئازادکردنی گەردنێکه یان خۆراك دانه له ڕۆژانی برسێتی دا بەهتیوانی نزیك و هەژارانی ناو خاك ، ﴿ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ

---

[۱۳۷] الانسان والبیئة / ل: ١٠٤- ١٠٩ به هەندێ کورت کردنەوە .

﴿ يَوْمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾ ، واتـه : مافی زەکات بدەن له ڕۆژی دروونەوەی دانەوێڵەدا.

پێشەوا علی ﷺله پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە (ان الله فرض على اغنياء المسلمين في اموالهم بقدر الذي يسع فقراء هم ، ولن يجهد الفقراء اذا جاعوا او عروا الابما يصنع أغنياء هم الا وان الله يحاسبهم حسابا شديدا ويعذبهم عذابا اليما ) (رواه الطبراني في الاوسط والصغير). واته : خوا فەرزی کردووە لەسەر دەوڵەمەندانی موسڵمان زەکاتی دارایی بدەن ئەوەندەی بەشی هەژاران بکات ، کاتێ هەژاران تووشی دژواری دێن گەر برسی بوون یان رووت بوون بەهۆی کرداری دەوڵەمەندەکانەوە ، خودا ئەوانە بە توندی لێیان دەپرسێتەوەو ئازاری بە چێژیان دەدات .

(ابن ماجه) گێڕاویەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (ان في المال حقا سوى الزكاة ) ، واته : جگە لە زەکات مافی تریش هەیە بدرێ بە هەژاران ، کەواتە زەکات دەبێ ئەوەندە لەلایەن دەوڵەمەندانەوە بدرێ بە هەژاران کە بەشیان بکات و لەدەردی هەژاری و برسێتی رزگاریان بکات ، ئەم بەرپرسیارییە مەزنەش دەبێ دەوڵەتی ئیسلامی پێوەی هەڵسێ و ڕێ و شوێنی یاسایی و دڵسۆزانە بگرێتە بەر .

کەچی وڵاتانی سەرمایەدار کە سامانەکانی جیهانیان بۆ خۆیان قۆرغ کردووە نەك هەر یارمەتی وڵاتانی جیهانی سێ یەم نادەن ، بەڵکو بەهۆی قەرزی سوودارەوە زیاتر پشتی ئەو وڵاتانەیان شکاندووە ، بۆ نموونە بە پێ ی ڕاپۆرتی بانکی نێودەوڵەتی قەرزی سەر وڵاتانی جیهانی سێ یەم لە کۆتایی (١٩٩٤) دا گەیشتۆتە (١٩٤٥) ملیار ، ئەمەش برە پارەیێکی زۆرە لەسەر شانی ئەوان [١٢٨] ، کەچی تێچوون و کولفەی سەربازی وڵاتە سەرمایەدارەکان لە ساڵی (٢٠٠٧)ز دا (١٢٠٤) ملیار دۆلار بووە ، هەر ئەمریکا لە

---

[١٢٨] العالم في مطالع قرن ٢١/ ل:٩٧ / ج١

ساڵی (٢٠٠٦) دا کولفەی سەربازی و خەرجیەکەی (٥٢٨,٧) ملیار دۆلار بووە ، واتە : (٤٦٪)ی کۆی خەرجی سەربازی جیهانە [١٢٩].

بێگومان تەنیا ئەمریکا کە وەکو وشتری صالحە (د.خ) بەتەنیا دەتوانێ ژیانی ئابووری هەموو وڵاتانی هەژار ببوژێنێتەوە ، هەر تەنیا ئەو خەرجەی بۆ بەشی عەسکەری و هەواڵگری و چارەسەری ئایدزو نەخۆشی سێکسی یەکانی و مادده کەهولی یەکان و پڕوپاگەندە بۆ کردنی دایناوە گەر بیدات بە هەژارانی جیهان بەشێکی گەورەی کێشە ئابوورییەکانیان چارەسەر دەکات .

سەر ژمێرییکانی (١٩٩٤) ئەوەیان دەرخست (١٦٪)ی دانیشتوانی زەوی (٦٢٪)ی کۆی بەهرەو خێرەکانی زەوییان بەکار بردووە ، هەرچی بارودۆخی جیهانی سێ یەمە لە بەڕازیلەوە تا ئەندەنوسیا ، لە مەلاوییەوە تا هایتی و سۆماڵ و سیبریا هەموو ئەوانە لە ژیانێکی پڕ مەترسی دان کە باسی ناکرێت ، لە ژماردنەکانی بانکی دەولی دا هاتووە (٥٥٠) ملیۆن کەس داهاتی ساڵانەیان ناگاتە (٥) دۆلار ، دەوڵەمەندان زیاتر سامان کەڵەکە دەکەن و هەژاران زیاتر نەدارییان بەسەردا کۆدەبێتەوە ، لە هەر خولەکێ (١٥٣) منداڵ لە دایك دەبن و (١١٧) لەوانە لە جیهانی سێ یەمدان [١٣٠].

(بول کەنێری) لە ڕاست ئەو ململانێیە و چارەنووسی شومی ، دەنووسێ : گەر ڕەگەزی مرۆڤی لەناوچوو لەبەردەم ئەو کێشەو کارەساتانەی داهاتوو بۆی لە بۆسەدان با تەنیا سەرزەنشتی خۆی بکات [١٣١].

---

[١٢٩] هەمان سەرچاوە/ ل:١٠١.

[١٣٠] هەمان سەرچاوە / ل :١١٣-١١٤.

[١٣١] هەمان سەرچاوە / ل: ١١٤.

## پیشەسازی و ئابورییەکانی وزە:

(د.یوسف القرضـاوي) دەڵێ : یـەك لـەو ڕێزانـەی خـوا لـە مرۆڤـی نـاوە لـە ڕوانگـەی ئیسلامەوە ئەوەیـە ، تـەواوی گـەردوونی لەبـەردەم دا دەسـتە مـۆ کـردووە ، تـەواوی جیهانەکانی بە ئاسمان و زەوی و خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و شـەو و ڕۆژو و ئـاو و وشکانی و دەریا و ڕووبار و ڕووەك و ئاژەڵ و تەنی نازیندە (الجماد) هەموو ئەوانەی لە خزمەت مرۆڤدا بۆ بەرژەوەندییەکانی مرۆڤی ڕام کـردوون ، هـەم بـۆ بەختـەوەر کردن و ڕێزێ و بەهرەیێ لەلایەن خواوە بۆ ئەم .

خـوای گـەورە لەگـەڵ مـرۆڤ دەدوێ و دەفـەرمووێ ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾ واتە : خوایە ، ئاسمانەکان و زەوی دروسـت کـردووە لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە ، ئەنجا میوەی تێدا ڕوواندووە ، وەك ڕۆزییەك بۆ ئێوە ، کەشـتی بـۆ ڕام کـردوون بـە یاسـای ئـەو لـە دەریـادا دەڕوات ، ڕووبارەکـانی بـۆ ڕام کردوون ، چی داوا بکەن خـوا پـێ ی داون ، گـەر هەڵسن بـەهرەکانی خـوا بـژمێرن ناتوانن بیانژمێرن .

﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴾ ، واتە : ئایا نابینن خودا هەرچی لە ئاسمانـەکان و زەوی دایـە بـۆی ڕام کردوون بەهرەی ڕواڵەتی و بەهرەی نادیاری بەسەردا ڕشتوون ، ڕام کردن و خستنە ژێر ڕکێفی گەردوون (التسخير) بۆ مرۆڤ دوو واتای گەورە دەگەیێنێت :

١. وزەی گەردوونی هەمووی هەموارو ئامادە کراوە بۆ مرۆڤ ، گەر ڕێگای بۆ ئاسان بێ هیچ شتێکی لێ نایەت ، مادام چاودێری یاساکانی خوا بکات ، پێویستە خۆی ماندوو بکات و بیر بخاتە گەڕ بۆ کردنەوەی دەروازە داخراوەکانی و دۆزینەوەی گەنجینە شاراوەکانی تا بۆ ئەو شتانەی بۆی بە قازانج تەواو دەبێ بەکاریان بێنێت .

٢. مرۆڤ ناوەندی پەیمان بەستنە لەم جیهانەدا ، هەرچەندە لە جێگادا قەبارەی بچووکەو لەزەمەندا تەمەنی کورتە ، کەواتە دروست نیە مرۆڤ لەو جیهانەدا جگە لە خوا شتی تر بپەرستی'و بیکاتە خوای خۆی و بەترس و ئارەزووە پەرستنی بۆ بکات ، ئەوانەی هەندێ شتیان پەرستووە ، یان هەندێ دیاردەو هێزی گەردوونی لە جیهانی بالأو نزمدا ڕاستی یەکانیان پێچەوانەی کردۆتەوە ، مرۆڤیان لەسەرداری بوونەوەرەوە کە گەردوونی بۆ ڕام بووە بۆ بەندەیێکی داماو و سەر شۆڕ گۆڕی ، کە کوڕنوش بۆ ئەستێرەیێ ، دارێ مانگایێ ، بەردێ ...هتد ببات ، وەك مێژو لەو خەیاڵ و ئەندێشانەی مرۆڤ و گومڕایی یەکانی بۆ تۆمار کردووین ، پێچەوانەی ئەوەی خوا بۆ مرۆڤی دەوێ و لەمرۆڤی داخوازە [١٣٢]

بێگومان نەك هەر مرۆڤی کۆن تووشی ئەو خەیاڵە گومڕایەبوون ، کە دیاردەو ماددەکانی بوونەوەرو وزەکانی بەخوا بزانن ، بەڵکو ماتریالستی نوێش هەمان خەیاڵ و ئەفسانەکانی زیندووکردەوە ، کاتێ (مارکس و ئینگلیز) هاتن وتیان : گەردوون خوایە ، هەر هەبووەو قەت لەناو ناچێت ، بەلأم زۆری نەبرد ئەو بیرۆکەیەش وەکو بت پەرستی کۆن جارەکی تر حەواڵەی ژێر خاك کرایەوە ، تا جارەکی تر هەڵنەستێتەوە ، وەك لە کتێبی گەردووناسیدا ڕوونمان کردەوە ، یاسای دووەمی دینامیکی گەرمی توانی چەکی ئەزەلی و ئەبەدی لەدەستی مادییەکان بکێشێتەوە .

---

[١٣٢] الخصائص العامة للاسلام / د.یوسف القرضاوي / ل:٧٧- ٧٨.

(کلودم هاتاوای) ڕاوێژکاری ئەندازیاری / لە ئەمریکا دەنووسێ : ئەم گەردوونە بارستایی یە کەمل بۆ یاسای دووەمی دینامیکی گەرمی کەچ دەکات ، پێویستە ئەو هۆکارەی یەکەم مادده نەبێ لە سروشتی دا ، ئەویش خوای شارەزاو دانایە ، کە چاوەکان پەی پێ نابەن[133].

(ام هولی) دەنووسێ : سروشتی بنەڕەتی پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆیی لەم چاخەدا گەشەکردنی بەشەکانی تەکنەلۆژیای تازەیە ، لەگەڵ گەشەکردنی زۆری قەبارەی بەرهەم هێنان ، بەکارهێنانی زۆری وزەش لەگەڵیدا. پیشەسازی هەردەم پشت بە بواری دابینکردنی چاوگەکانی وزە دەبەستێت ، گرنگترین خاسیەتی شۆڕشی پیشەسازی ، ئازادبوونی پیشەسازی یە لەپشت بەستن بە بەکارهێنانی سووتەمەنی عەمبار کراو لەناوجەرگەی زەوی و هەڵم ، کرداری پەرستن لەو قۆناغە هەنووکەییە دا بەهۆی پەرەسەندنی ئابوری وزە لە ئاستی جیهانداو بەبەکارهێنانی وزەی ناوکی بەو ڕێرەوەدا بەردەوام دەبێت.

بەو چەشنەیە شۆڕشی پیشەسازی بووە گوزارشێ بۆ ئەو گۆڕانە کۆمەلأیەتی یانەی لە نیوەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا ڕوویدا، چالاکی (١٥٠-٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر بەشێوەیەکی گەشندە پشتی بە بەرهەم هێنانی پیشەسازی بەست ، ئەوەش بەرهەمێ بوو زیاتر حوکمی بەسەر دارایی نیشتیمانی دا کرد لە هەر کوێ سەری هەڵدا سروشتی خۆی بە سەر ژیانی مرۆیی دا فەرزکرد ، شۆڕشی زانستی مرۆیی تەکنیکی بالأ هیچی لەو ڕاستیە نەگۆڕی ، بەڵکو زانستی کردە هێزێکی بەرهەم هێنەرە بەهەموو دەوری و ڕەهەندەکانییەوە .

جەخت کردنی زۆر لەسەر پیشەسازی و ئەم هۆکارانەی تر کە دا بەستەن بە ئەمەوە وەکو جەخت کردن بۆ سەر هێزەکانی کرێکاری پیشەسازی و دابین کردنی

---

[133] الله يتجلى في عصر العلم/ل: ٧١.

خزمەتگوزارییەکان بۆ دانیشتوان و بەڕێوبەرایەتییەکان و ئاسایش لە ڕابردوو داو تا ئیمڕۆش کە ورژاندنیان پەیدا کردووە ، لە گەشەپێدانی شارە گەورەکاندا ، کە زۆرترینی دانیشتووانی تێدا بێت ، ئەمەش واتە دروست بوونی چەند مەڵبەندێکی شارستانی زۆر فراوان ، لە ڕاست ژینگەزانیشەوە واتە پەیتی کردنەکی لە تەواوی کاریگەرییە سەلبی و خراپەکاندا ، وەك لە زۆرێ لە ناوچەکاندا دەرکەوتوون ، لە پیسبوونی ئاو و هەواو ژاوە ژاو و دەست بەسەر داگرتنی زەوی و زاری پتر بەمەبەستی بیناسازی و بەرهەم هێنان و خنکاندنی توخمێکی پاکی زۆری سروشتی و نقوم کردنی ڕووبەرێکی فراوانی نوێ بە بەردەوامی بۆ کۆمەڵگای نیشتەجێ بوون و پیشەسازی[134] .

لێرەدا ئاشکرا دەبێ زۆری دانیشتووان و زیادەڕەوی کردن لە خانوبەرەو پێشەسازی زۆرداو زیادە ڕەوی کردن تێ یاندا خاکی بەپیتی کشتوکاڵی و دارستان کەم دەکاتەوە . ژینگە بە گشتی بە خاك و ئاو و هەواوە پیس تر دەبێت .

(د.ناصر رفیعی محمدی) دەنووسێ : گەر بیناو خانوبەرە لە خزمەت نیازو مەبەستەکانی مرۆڤدا بێ دیمەنێکی باشە ، سەحابی مەزن (ئەبو زەڕی غەفاری) کاتێ موعاوییە کۆشکی سەوزی دروست کرد بوو پێ ی فەرموو : گەر ئەو کۆشکەت بە ماڵی خوا دروست کرد بێ ئەوە ناپاکییە ، گەر بە سامانی غەیری خۆت دروست کردبێ ئەوە ناپاکییە ، گەر بە سامانی خۆت دروستت کردبێ زیادە ڕەوییەوە.

قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا ڕێگە دەگرێ لەزیادە ڕەوی کردن لەدروست کردنی کۆشکی زۆردا بۆ سوود وەرگرتن ، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً

[134] البيئة والانسان / ل:١٠٠- ١٠٢

تَعۡبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ ، واتـه : ئایـا دەتانـەوێ لەهـەر بەرزاییەکـدا کۆشـك و باڵەخانە دروست بکەن بێ هودەو سوود ، یان قەڵات بنیات دەنێن شایەد بمێننەوە[١٣٥] .

وشەی (الریع) بەمانای بەرزایی یەکان و ڕێگاو بانەکان دێ ، کە خەڵکی بۆ سەیرانگاو ڕابواردن کۆشکی تێدا بـەرز دەکەنـەوە یـان بـۆ پـارەو کـرێ ، بـێ ئـەوەی سـوودی بـۆ خۆیان و خەڵکی بێ خانووبەرەو کرێ چی هەبێ سامانی وڵات بەفیڕۆ دەدەن ، (آیـة) مەبەست کۆشکی بەرزو بالآخانەیە ، (مصانع) بەمانای قەڵات و شۆرە دێ ، ئیمـڕۆش بۆ کارگە وشەی (مصنع) بەکاردێت ، ئیمڕۆ دەیان کارگەو وەرشەی بێ سوود دروست دەکرێ لەسەر ڕێگاو بانەکاندا وەکو کارگەی بیرەو شەڕاب ، دەیان سـەیرانگاو هاوینـە هەوار دروست دەکرێ بۆ خراپەکاری و ڕابواردن و تێکەڵاوی و خـاك و ژینگـە پـیس دەکـرێ و ڕەوشـت و نەریتـە جوانـەکان لـەناو دەبـرێ زیـادە ڕەوی لـە سامانە گشتی یەکاندا دەکرێ ، یان خاکـە پەیتـەکان بـێ هـودە دابـەش دەکـرێ ، زۆربـەی ئەوانـەی وەری دەگرن دەسەڵاتدارو دەوڵەمەندو خاوەن خانوبەرن و بازرگانییان پێوە دەکەن ، ئەم دیاردانەش گەورەترین هەڕەشەن بۆ سەر ژینگەو پیسکردنی و بەسوودو قازانجی کەس تەواو نابێت ، (لعلکم تخلدون) یـەکێ لـە ماناکـانی ئەوەیـە ئـەم زیـادە ڕەوییانـە تەمەن و ئاسودەیی تان زیاد ناکات ، بەڵکو ژینگـە پـیس دەبـێ و تووشـی مەترسـی و نەخۆشـی دەبـن و تەنـدروسـتیتان دەکەوێتـە مەترسییەوە ، ئەوانـە نـەك شارسـتانی دروست دەکەن بەڵکو وێرانی دەکەن .

(ام هولی) دەنوسـێ : کـرداری پیشاسازی دروسـت کـردن (التصـنیع) و شارسـتانی زۆر کێشەی نوێ لەگەڵ خۆیاندا دێنن ، کە ڕابـردوو زانـراو نـەبوو یـان وەکـو ئیمـڕۆ بـە دیارەوە نەبوون بیانبینین ، مەبەست لەمەش پاکژ کردنەوەی ئاوە لە پاشماوە و پاکژ

[١٣٥] اسراف وتبذیر ، تباهي سرمایه ها / د. ناصر رفیعی محمدی / ل:٨٠.

کردنەومیەتی لە پاشماوە رەقەکان و پاکژ کردنەوەی شارەکان و رێکخستنی رێگاو بانی هاتوچۆیە ...هتد[١٣٦].

گەر لە ئیسلام بڕوانین زۆر گرنگی بە پاکوخاوێنی داوەو لە چەندان ئایەتدا ئاماژە بە پاکژی و گرنگی پاکژی دەکات لە: لە ئاسمانەوە ئاوی پاککەرەوەمان بۆ باراندن .

وشەی (الطهور) دژی هەموو پیسی یێکە ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ ﴾ الفرقان، پێچەوانەکەی واتە : (التلوث)، واتە : پیس بوون ، باران بە پێ ی قورئان پاکژەو خوداوەند پالأوتویەتی لە رێگای دلۆپاندنەوەو خوێ ی ناو دەریاکانی دوای بە هەڵم بوون جێ هێشتووە ، پاشان ژینگە زانان دەڵێن : یەك دلۆپە ئاو لە کێشی (٥٠) مگم داو لە بەرزایی (١٠٠٠) م دێتە خوارەوە (١٦,٣) لیتر هەوا پاکژ دەکاتەوە[١٣٧].

پسپۆرانی بواری تەندروستی دەڵێن : بەکارهێنانی ئاوی پاکژ بۆ شوشتنەوە (٩٠٪)ی میکرۆبەکان لادەبات و دەسڕێتەوە[١٣٨]، بەو پێ یە ئاو پاکژەو پاککەرەوەیە ، بۆیە نابێ هەوڵی پیس کردنی بدرێ نە کەلە زەویدا نە لە ئاسماندا ، وەکو فەرموویەتی :﴿ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ الواقعة ٧٠ ، واتە : گەر بمانەوێ ئاوی باران ترش و تفت دەکەین ئەی بۆ سوپاسگوزاری ناکەن ؟

پاشان خوا فەرمانمان پێ دەکات شارو ولأتمان پاك رابگرین و لە پیس بوون بپارێزین و رێگاو شەقامەکان خاوێن بکەینەوە ﴿ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى

---

[١٣٦] الانسان والبيئة / ل:١١٠.

[١٣٧] هەمان سەرچاوە/ ل:١٣١.

[١٣٨] الطب الوقائي في الاسلام / ل:٤٧.

خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ﴾ [illegible] واتـه : شـاری پـاك ڕووەكـەكانی بـه ویستی پەروەردگاری دەڕوێنێت ، چونكه ژینگەی پیس كه خاك و هەواو ئاوی پیس بوو دارو درەختـی لـەناو دەچێت ، وەچـەكەی قـڕی تـێ دەكـەوێ ، (نبـات) مەبەسـت مـرۆڤ و ڕووەك و گیاندارانه .

(ام هولی) دەنووسێ : چونكه زۆربەی ولآتانی دنیا هێشتا لەدەوری جێ بەجێ كردنی كرداری پیشەسازی بنەڕەتی فراواندان ، زۆربەی جار بەبێ بەرنامەیی دام و دەزگاكان و ئابووری هەندێ ولآتانی بچوك و هەژار دژوار دەبـێ بۆیـان بـەرەنگارییان ببنـەوە ، چارەسەری بنەڕەتی و چالاك دەبـێ لـەماوەی یارمـەتی دانێكـی فراوانـی جیهانییـەوە دەبێت ..

هەموو لقێكی ئابووری له واقیعدا كاریگەرییەكی دیاریكراوی بۆ سەر ژینگـه هەیـه ، بـه پێـی پـۆلێنكردنی ئەنجومـەنی ئـابووری ئـەوروپی چـالاكی یـەكانی لقـه ئەوروپییەكان پەیوەندییان به دروستكردنی كێشه ژینگەییەكانەوە هەیه ، وەك ئـەو لقه ئابوریيانەی خوارەوە :

- بەرهەم هێنانی وزە ، له بەرهەم هێنانی سەرچاوەكانی وزەوە بیگـری تـا دابـەش كردنی بەسەر تۆڕەكانی بەكاربردنی جۆراو جۆردا .
- دەرهێنانی كانزاییەكانی ئاسن و كانزاكانی تر .
- كارگەكانی كیمیایی و پەترۆ كیمیاوییەكان.
- پیشەسازییەكانی كەرستەكانی دروست كردن و خانوبەرەو بیناسازی.
- ژمارەی تریش له چالاكی وەكو گواستنەوەو ئابووری شارەكان و هتد .

ئاشكرایه ئاماركردنی چالاكییەكانی ئابووری سـەرەوە تـەواو نیـه ، چـونكه كێشـەكان خـۆی لـه چـالاكی لقـەكانی تـرەوە سـەر هەڵدەدات ، وەكـو پیشەسـازی مەكینـەكان و بەرهەم هێنـانی خـۆراكی بـەقتوكردن (التعلیب) و پوختەكارییـەكان ...هتـد ، بۆیـه پێویسته چاودێرییەكی زۆری بارو دۆخ و خاسیەتی دەفەری و خۆجێ یـی بكـرێ بـه

واقیعی و پێشهاتەکانی گۆڕان و پەرەسەندنی لە ئەنجامی پەیدابوون و گەشەکردنی لقە پیشەسازییەکان وزەی کارەبایی لەناو جۆرەکانی وزەدا بۆ کۆمەڵگای هەنوکەیی بەگرنگترین وزە دادەنرێت.

قورئان ئاماژە بەو کارەبایە دەکات ، کە شەوانە جیهان دەکات بە ڕۆژ ، گەر شەوانە بڕوانیە بۆ نمونە (نیوۆرك) دەڵێی ڕۆژەو هەست ناکەی شەوە ، ئەو ولاتە لە دوورەوە وەك یەك جیهانی ڕۆژە دەرەخشانی کردووە ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾
واتە : زەوی بە ڕوناکی پەروەردگاری ڕوناك بۆوە . بێگومان کارەباش وەکو خۆرو سووتەمەنی و وزەکانی تر بەشێکن لە ڕوناکی پەروەردگار زەوی تاریك ڕوناك دەکەنەوە .

(ام هولی) دەنوسێ : بەلاّم گەشەکردنی بەکارهێنانی وزەی کارەبایی زۆر کێشەی ئاڵۆز دروست دەکات ، کە پەیوەستن بە دابین کردن و بەکارهێنانی چاوگە یەکەمینەکانەوە ، لەوانە ڕزگاربوون لە پاشماوەکانی کرداری سوتان لە وێستگەی کارەبایی گەرمی دا ، کە بە خراپی کار دەکاتە سەر ژینگە .

ئێستا بەکاربردنی سووتەمەنی ڕەق بۆتەوە (٥,٠٪) و نەوتی خاو (١٠٪) و گاز (٩٪) و وزەی کارەبایی بەرهەم هاتوو لە چاوگەکانی ئاوی و ئەتۆمی و گەرمی ناخی زەوی گەیشتۆتە (٣٪) لە ساڵێکدا ، بێگومان ئەم ڕێژەیە لە بەرکاربردنی سوتەمەنیدا ولاّتە پێشکەوتووەکان دەگرێتەوە .

وزەی ئاو لە ئاستی جیهانیدا بەکارهێنانەکەی لە ساڵی (١٩٢٩) وە تا (١٩٦٧) لە (١٪) بۆ لە (٢٪) بەرزبۆتەوە ، هەرلە فرەنسادا ئەم ڕێژەیە گەیشتە (٢,٧٪) .

(وزەی ناوکی) ، کە گرنگی یەکەی بەرز بۆوە ، لە هەر یەکێ لە بەریتانیاو ئەمریکاو ڕوسیا و ئیتاڵیاو فەرەنساو ئەڵمانیای یەکگرتوودا دا دەمەزرێت ، بەلاّم بەشی هەرە زۆری چاوگەکانی وزە لە جیهاندا بۆ خودی بەرهەم هێنانی کارەبا بەکاردێت ، ئێستا

تاقی کردنەوە دەکرێ چۆن وزەی سەرەتاییەك و تەکنەلۆژیا بەکاربێ و بۆ وزەیێکی نوێ بگۆڕێ ، لەڕوانگەی ئابووری ڕۆڵی یەکەمی تێدا دەگێرێت ، تێچوونی بەرهەم هێنانی کارەبایی لە وێستگەکانی ناوکی دا لەم چاخەدا گەیشتۆتە ئاستی تێچوونی بەرهەم هێنان لە وێستگەکانی گەرمی ئاساییدا .

بە پێ ی خەملاندنەکانی ئاژانسی جیهانی و وزەی ناوکی بەکارهێنانی وزەی ناوکی لە ساڵی (٢٠٠٠) چوار ئەوەندەی ساڵی (١٩٧٠) بووە ، لە زۆر وڵاتدا لەو (١٠) ساڵەی دوایی دا بەکارهێنانی چەند قات بووە ، هەر چەندە لە جیهاندا یەك ملیار کەس بێ کارەبان ، ئاسیا خۆی نیوەی جیهان دەبێ کەچی (١٠٪)ی وزەی کارەبایی جیهان پێك دێنێت[١٣٩] ، ئاشکرایە ئێستا ئێرانیش خەریکە بۆ سود وەرگرتن لە یۆرانیۆم وزەی کارەبایی دروست بکات ، بەڵام جیهانی خۆرئاوا کۆسپی دەخەنە بەردەم ، چونکە پێیان وایە ئێران دەیەوێ چەکی ناوکی بەدەست بێنێ ، بوونی ئەم چەکەش بۆ ئێران دەبێتە هەڕەشە بۆ سەر دراوسێکانی و خۆرئاواو جیهان ، دوورنیە ئەم کێشەیەش لە داهاتوودا جەنگی کاولکاری ژینگەیی و ژیانی لێ بکەوێتەوە .

لە فەرموودەکاندا باسی خوراسان و تالیقان کراوە لە ئێراندا ، کە داهاتوو دەبن بە یاریدەدەری ئازاد بەخشی جیهان و گۆڕان دروست دەکەن ، (ویحا للطالقان فان لله عزوجل بها کنوزا لیست من ذهب ولا فضة ولکن بها رجالا عرفوا الله حق معرفته).

---

[١٣٩] الانسان والبیئة / ل:١١٣- ١١٤.

# بەشی هەشتەم

# ( پیس بوونی ژینگە ) ( تلوث البیئة )

## پیسبوونی ژینگە :

قورئانی پیرۆز وەکو دواترین پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ مرۆڤ ، بەر لە زانستی نوێ زۆر گرنگی بە ژینگە داوە ، لە دەیان ئایەتدا وەکو زۆرێکمان باسکردن ئاماژەی بە ژینگەو بەشەکانی و گرنگی و پەروەردەی ژینگە کردووە ، دواجاریش ئاماژە بە مەترسییەکانی پیسکردنی ژینگە دەکات لەلایەن مرۆڤەوە ، پێشبینی دەکرێت داهاتوو مرۆڤ ژینگە پیس بکات و ژیانی خۆی و گیانداران و ڕووەك دەخاتە مەترسییەوە ، وەکو نیشانەیێکی گەورەی قیامەت ڕوودەدەت : ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ لێرەدا قورئان ئاماژە بەدەستی وێرانکاری مرۆڤ دەکات لە تێکدانی کشتوکاڵ و ڕووەك و وەچەی گیانداران و مرۆڤ ، لەکاتێکدا خودا حەز بە وێرانکاری ناکات بەڵکو حەز بە ئاوەدانی و چاکسازی کردن دەکات . ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ ﴾ - ، واتە : خراپەکاری و وێرانکاری لە وشکانی و دەریا دا بە دەرکەوت بەهۆی کردەوەکانی دەستی مرۆڤ ، ئەمەش ئاماژەیە بۆجەنگ و زیانی گیانی و دارایی و ژینگەیی.

ژینگە زانی (علم البیئة – Ecology) لەزمانی یۆنانیدا (oikos) واتە : ماڵ و خانووبەرەو جێگا (logos) واتە : توێژینەوە و لە ساڵی (١٨٥٨)وە بەکارهاتووە ، بەلام (هیکل) زانایەکی تری ژیانزانی ئەڵمانی یە ، یەکەم جار لە (١٨٦٦) دا بۆ یەکەمجار پێناسەی کرد وتی : (بریتی یە لە کۆمەڵە زانیارییەك پەیوەندی بە ڕێکخستنی سروشتەوە هەیە).

(چارلس ئیلتۆن) لە ساڵی (١٩٢٧) دا بە مێژوویەکی سروشتی زانستی وەسفی کرد ، چونکە وابەستەیە بە کۆمەڵناسی و ئابوری ناسی گیاندارانەوە .

ژینگەناسی ئەمریکی (فردریك کلیمنتس) لە ساڵی ١٩١٦ دا بە زانستی کۆمەڵگا وەسفی کرد ، (ودبری) لە ساڵی (١٩٥٤) دا بەو مانایە مامەڵەی لەگەڵدا کرد ، کە زانستێکە لە زیندەوەران و پەیوەندییان بە ژینگەوە دەکۆڵێتەوە ژینگە زانی تازەی ناسراوی ئەمریکی (پ.ئەیوجین) وتی : بریتی یە لە توێژینەوەو پیشەی ژینگە ، ژینگە زانی ئیسپانی لە (١٩٦٨)دا (د.مارکلیف) وتی : تاووتوێ کردنی سیستەمی ژینگەیە[١٤٠].

قورئان بەر لە زانستی نوێ ئاماژە بە وشەی ژینگە (البیئة) دەکات : (وبوأكم في الارض) ﴿وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا﴾ (٧٤) ، سەیر بکە قورئان وشەی (البیئة) بەکار دێنێت !

(بریج کوبال) دەڵێ : هەر لە کۆنەوە مرۆڤ گرنگی بە ژینگە داوە و هەوڵی داوە ڕازەکانی هەڵبێنێ و ژیان لە تاقیگەدا بەرهەم بێنێت. ئێستا مرۆڤ سەرداری جیهانەو توانای هەیە سروشت لە چەند بوارێکی فراواندا بگۆڕێ و دەسەڵاتی بەسەردا بگرێ ، تا مرۆڤ گەیشتە مانگ و لەبەرنامەی دایە لە هەسارەی مەریخ و زوهرەش بکۆڵێتەوە . هەموو ئەو گوشادییە لە زانست و تەکنەلۆژیادا یارمەتی دا هەندێ کێشەی بۆ چارەسەر بکات ، بەڵام کێشەی تازەی بۆ مرۆڤایەتی پەیدا کرد ، ڕێژەی مردن بەهۆی نەخۆشییەکان و برسێتی گەیشتە ئەو پەڕی ، لەلایەکی تریشەوە زۆربوونی دانیشتووان وای لە مرۆڤ کرد لە داهاتووی خۆی بکەوێتە دوو دڵی یەوە ، ئەو سامانە سروشتییەی بەکاری هێنا زۆر کەم بۆوەو ژینگە پیس بوو ، ئاو و هەوا پیس بوون ، پێویستە مرۆڤ بەر لەبەکارهێنانیان پاکژیان بکاتەوە ، زۆر لە گیانداران و ڕووەکەکان یان بزر بوون و شوێنە ون بون ، یان شوێنی خۆیان لە باخچەکان و مۆزەخانەکاندا

---

[١٤٠] مبادي علم البيئة / بريج كوبال/ ان بهار دواج / ل:١٨ سەیر بکە.

گرتووه ! هەر کام لەم کێشانە لەبەردەم هەمووماندا پێشنیاز کراوە ، بۆیە ڕۆژانە وشەی ژینگەو دەوروبەرو پیس بوون دەخوێنینەوە ، یان دەبیستین[٤١] .

(ام هولی) دەنووسێ : هەڕەشەیەکی مەترسیدار لە ژینگەدا : بەرزبوونەوەی چالاکی ئابووری کۆمەڵگای مرۆیی لەم چەند ساڵانەی دواییدا کاریگەرییەکی ڕاستەو خۆی کردە سەر ژینگەی ژیان ، مرۆڤ ساڵانە ملیۆنەها تەن لە کەرستەو ماددەی خاوی کانزایی و ئەندامی لە سروشت وەردەگرێت ، دوای بەکارهێنانی وەکو (پاشماوەو پاشەڕۆك)ی پیشەسازی و نا پیشەسازی بۆ زەوی دەگەڕێتەوە ، توێکڵی سروشتی زەوی دەگۆڕێت ، لێرەدا گۆڕانی واتایی لە ژینگەدا پەیدا دەبێت ، گۆڕانی پێکهاتەی (توخم)ە کانی ژینگە (خاك – ئاو – هەوا) کاریگەرییەکی گەورە دەکاتە سەر زیندەوەران و چاوگی خۆراکیان ، بەم شێوەیە لەگەڵ فراوانبوونی کەرتی شارستانی و کرداری پیشەسازی و تەکنیکی ژینگەی سروشتی ژیانی بەردەکەوێت ، ئەو زیانەی بەر لایەنی کۆمەڵایەتی ژینگە دەکەوێت بەهۆی پەرەسەندنی تەکنیکی لە شانی دێ کاریگەری پێچەوانەی بۆ سەر مرۆڤ هەبێت ، ئەمەش پێچەوانەی ئامانجە سەرەکییەکانی کرداری پەرەسەندنی شارستانی و پیشەسازییە ، ژینگە ئاسەواری سەلبی زۆر هەڵدەگرێ لە ئاکامی چالاکییەکانی مرۆڤ لە هەموو بەشەکانیدا ، لە توێکڵ و ناخی زەوی و خاکدا ، لە ژینگەی ئاو و هەوادا.

گەر پەنامان بردە بەر سادەکردنێکی دیاریکراوی کێشەکە ئەوە دەتوانرێ سۆراغی کاریگەرییە سەلبی یەکانی سیستەمی خاك و ئاو بکرێ ، کە ڕێسایەکی نەگۆڕی تێدا دەردەکەوێ ، ئەویش ئەوەیە : یان گەیاندنەکان بە خاك و ئاو پێویستە هەبێ و هەمان ژیانیش بەر ئاو دەکەون ، دوایی هەردوولایان خاك و ئاو کار لە هەوا دەکەن . دوورنیە مەترسیدارترین کاریگەری ئەوەیان بێ لە بەکارهێنانی چاوگە وزە سەرەتاییەکانەوە و بەکارهێنانی کانزا و پیشەسازی قورس و کیمیا خستنە ناو

---

[٤١]مبادي علم البيئة / بريح كوبال/ ان بهار دواج / ل:١٧ .

کشتوکاڵەوە و زۆربوونی بازرگانی و گواستنەوەی جیهانی یەوە پەیدا ببێت ، بەڵام سەرجەمی کێشەکان زۆر لەوە گەورەترن.

وێستگەی کارەبا لەگەڵ بەرهەم هێنانە سەرەکیەکەیدا چەند پاشماوەو پاشەڕۆ (الفضلات) یێ لەدوای خۆی دا بەجێ دێڵێ کێشەی ترسناك دروست دەکەن ، بەتایبەتی گەرمی قۆرغ نەکراو ، زیانی لاوەکی بەهۆی گەرمییەوە پلەی گەرمی دەوروبەر بەرز دەکاتەوە ، بەهۆی پاشماوە سووتاوەکان و پاشماوە تیشکدەرەکانەوە پیسی دەکات ، بەلام پیشەسازی لە ڕێگەی بەرنامە بەرهەم هێنەرە فراوانەکەیەوە بڕێکی فرە لە چاوگە سروشتی یەکانی پێویست دەبێ ، بەتایبەتی چاوگەکانی وزەو ئاو . پیشەسازی بەهۆی پاشە ڕۆکانی لە زۆر لاوە ژینگە پیس دەکات ، بەتایبەتی ئاو و هەواو خاك.

دیسان کشتوکاڵ گەورەترین هۆکارە بۆ پیس بوونی خاك و ئاو ، ئەمەش لەڕێگای پاشەڕۆك و زیلی گیاندارانی بەرهەم هێنرا و بڕێکی زۆر لە کەرستەی کیمیایی وەکو پەیینی دەستکردو هۆکارەکانی پاراستن و قەلاچۆکەرەکانی بژارو مێروو ، دیسان هۆکارەکانی گواستنەوە سەرچاوەیەکی تری پیسکردنی ژینگەن ، بۆ نمونە : فڕۆکەی (فیشکەدار — النفاثة) لەکاتێکدا بەسەر ئۆقیانوسی ئەتلەنتی دا دەفڕێ (٣٠) تەن ئۆکسجین دەسوتێنێ ، گەرمایی یەکەی بەرزو ژاوە ژاوێکی بەرز پەیدا دەکات ، ئەو ئۆتۆمبێلەی (١٠٠٠) کم دەبڕێت ئەندازەی تەمەنی مرۆڤێك ئۆکجسین بەکاردێنێت ، پاشان پاپۆڕو بەلەم و دەریاچە و ڕێڕەوەکانی ئاوی بەهۆی پاشەڕۆکی نەوتی ، ئاو پیس دەکەن ، مەترسیدارترینییان فراوانی چینی نەوتی یە ، کە ڕوی حەوزی ئاوی دادەپۆشێت.

پیسبوونی ژینگە دەبێتە هۆی لەناو بردنی زۆرێ لە زیندەوەران ، سەرژمێرەکان و خەملاندنەکان بۆ ئەوە دەچن (١٠٧) جۆر ئاژەڵ و (١٠٠) جۆر باڵندەو (٣٨٥) جۆر ڕووەك قڕیان تێ بکەوێت ، (٢٠٠) جۆر لەوانە ئاوی و ئەو ڕووەکانەن لەناوچە

شێدارەکان گەشەیان کردووە ، هەرچی زیانی زیندەوەرە وردو میکرۆسکۆبییەکانە ناژمێردرێت"[142].

(بریج کوبال) دەنووسێت : (پیسبوون – polloution) دەشێ پێناسەی پیس بوون بەو مانایە بکرێ : بریتی یە لە گۆڕانێکی نەویستراو لە سیفەتی فیزیایی و کیمیایی و بایۆلۆجی و هەواو و ئاو و خاك ، کە زیان بە مرۆڤ و زیندەوەرانی دەگەیەنێت.

هەموو ئەو کەرەستانەی تووشی پیس بوون (التلوث) بوون پێیان دەگوترێ : پیس بووەکان (الملوثات – pollutants) ، پیس بوون شتێکی نوێ نییە بۆ مرۆڤ ، کردارەکانی شی بوونەوە کە لە سروشتدا ڕوودەدا چەند گازێکی زیان بەخش دەخاتە ناو ژینگە ، چەند زیندەوەرێکی ژەهراوی بەرهەم دەهێنێت ، دیسان تۆزو گەرد بەهۆی باو دەنکە هەلاڵەی ناو هەوا زیان لە مرۆڤ دەدات ، زۆر کەرەستە هەیە گەر بە ڕێژەی کەم هەبن سوود بەخش دەبن ، بەلاّم زۆربوونیان زیانیان لێ دەکەوێتەوە ، بۆ نمونە : تیشك بۆ گەشەی ڕووەك و مرۆڤیش بە سوودە ، بەلاّم ڕووناکی بەبڕێکی زۆرو چڕ زیان لە چاو دەدات .

ئاگر گەر لە کۆنترۆلی تۆدا بێت سوود بەخشە ، بەلاّم گەر لە جلەو چووە دەر وێرانکار دەبێت ، ئۆزۆن دەورێکی بالاّ دەبینێ لە پاراستنی ژیاندا لە تیشکی (سەربنەوشەیی) لەناو چینی (ستراتوسفیر) ی دەرەوەدا ، بەلاّم هەبونی لەهەوادا ڕووەك و گیانداران دەکوژێت.

بەم شێوەیە پیسبوون لەکاتێکدا ڕوودەدات کەرستەکان لە جێگای خۆیان نین و لە ڕێژەی سروشتی خۆیاندا نین"[143].

---

[142] البيئة والانسان / ل:١١٧- ١١٨.

[143] مباديء علم البيئة/ ل:٢٦٦.

قورئانی پیرۆزیش وەکو نامەی ئاسمانی و دوا دەستوورو پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ ئادەمیزاد ، مەسەلەی ژینگە پیسبوونی پشت گوێ نەخستووە ، بەڵکو هەموو ئەو هۆکارانەی ژینگە پیس دەکەن بۆ مرۆڤی باس کردوون ، تا ئەوان لە هەموو بوارێکدا بۆ قورئان بگەڕێنەوەو ئەو ڕێگای ڕاست و ڕێگا پیشاندەریان بێ ، بۆ گەیاندنی مرۆڤ بە لوتکەی پێشکەوتن و بەختەوەری !

پێغەمبەر ﷺ دەربارەی تۆزو خۆڵ فەرموویەتی : کە (با) دەیهێنێ (تنكبوا الغبار فان منه تكون النسمة) واتە : خۆتان لە تۆزو خۆڵ بپارێزن ، چونکە زیندەوەری وردی تێدایە (الخطابي) لە (غرائب الحديث) لە (النهاية/ ابن الاثير) دا هاتووە (النسمة) بە مانای نەخۆشی و هەناسە تەنگی ، زیندەوەری ورد دێت ، هەرسێ ماناکانیش ڕاستن.

لە ساڵی ١٩٥٢ دا تەمێکی چڕ لەندەنی داپۆشی و هەوای بە تەواوی پیس کردو (٤٠٠٠) کەس بەهۆی هەوی بۆڕیچکەکان و نەخۆشی یەکانی سی یەکان و دڵ مردن ، دیسان دوکەڵی ئۆتۆمبێل ، کە لە ئاوێتەی قورقوشم (الرصاص) پێك دێ نەخۆشی مێشك پەیدا دەکات و مێشك بەتەواوی وێران دەکات ، ئەو منداڵانەی تووشی دێن هەندێکیان تووشی دەبن ، دوکەڵی ئۆتۆمبێلەکان ژینگە بە یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن پیس دەکات ، ئامێرەکانی جیهان ساڵانە زیاتر لە (٢٠٠) ملیۆن تەنی لێ دەهاوێژن ، ساڵانە بەهۆی ئیجازەدان بە کرێکارەکان بەهۆی نەخۆشی یەوە هەر لە ئینگلتەرادا دەگاتە (٣٠) ملیۆن ڕۆژە عەمەلەو تێچوونی لەسەر دەوڵەت دەوڵەت (٦٥) ملیۆن پاوەندە ، هۆکاری ئەو نەخۆشییانەش بۆ پیس بوونی ژینگە دەگێڕنەوە[١٤٤] .

لەبارەی زیانەکانی تیشك بۆ تۆڕی چاو ، قورئان فەرموویەتی :﴿ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ﴾ البقرة: ٢٠ ، واتە : نزیکە بریسکە سۆمای چاویان ببات ، لەبارەی زیانی

---

[١٤٤] الطب الوقائي في الاسلام / د. عمر محمود عبدالله / ل:٤٣- ٤٥.

ئـاگر بـۆ ژینگـە فەرموویـەتی : ﴿ فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ ﴾ واتـە : ئـاگر باخچەکەی کـردن بـە خـەڵوز ، ﴿ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ﴿٢٦٦﴾ ﴾ . واتە : گەردەلولێکی ئاگرینی لەگەڵدا بوو سووتاندی .

هەندێ لە زانایان وەکو (د.عادل مشعان ربيع) و هاوڕێکەی نووسیویانە : پیس بـوون دەکەن بە چەند بە شێکەوە :-

١- پیسبوونی ماددی : ئەو پیس بوونەیە تووشی یـەکێ لـە توخمـە سـەرەکی یـەکانی ژینگە دەبێ و ڕاستەوخۆ کار لە مرۆڤ دەکات ، ئەویش چەند جۆرێکی هەیە : (پیس بوونی هەوا ، پیس بوونی ئاو ، پیس بوونی خاك) .

٢- پیس بوونی نا ماددی : ئەو پیس بوونەیە هەستی پێ ناکرێ و ئاسەوارەکانی بۆ سەر مرۆڤ ناڕاستەوخۆیە ، ئەویش دوو جۆرە : (پیس بوونی ژاوە ژاوی و دەنگە دەنگە ، پیس بوونی تیشکی) وەك لێرەدا باسیان دەکەین .

## پیسبونی بەرگە هەوا :

قورئان ئاماژەو پێش بینی بە هاتنی نیشانەیێکی گەورەی قیامەت دەکات

﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾ ، واتـە : چـاوەڕێ بکـە ڕۆژێ ئاسمان دووکەڵێ دێنێ ، خەڵکی دادەپۆشێ . ئەمەش سزایەکی بە ئازارە .

لێرەدا قورئان ئاماژە بـە پیسبوونی هـەوا دەکـات بـە دووکـەڵ و گازەکـان ، کـە ژیـان دەخاتە مەترسییەوەو نەخۆشی و ئازار تووشی دانیشتووانی زەوی دەکات .

قورئان ئاماژە دەکات دەتوانرێ ئاوی شیرینی باران کە لە هـەورەوە دەبـارێ بگـۆڕدرێ بە بارانێکی خوێ یی و تـرش و تفـت: قَالَ تَعَالَى: ﴿ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ

 ، واته : ئەو ئاوەتان بینیوە ئێوە دەیخۆنەوە ، ئایا ئێوە لە هەوری بە تریشقە باراندوتانە یان ئێمە باراندوومانە ، گەر بمانەوێ ترش و تفتی دەکەین ئەی بۆ سوپاسگوزاری خوا ناکەن ؟

زانست لەو دوایانەدا سەلماندی مرۆڤ لەدەستی دێ تێکەڵەی ئۆکسجین و نایترۆجین بە تێ پەڕاندنی پریشکی کارەبایی بەناوی دا بگۆڕێ بۆ ئۆکسیدەکانی نایترۆجین ، ئەو ئۆکسیدە نایترۆجینانە توانای توانەوەیان هەیە لە ئاودا بۆ پێك هێنانی ترشە ئازۆتی یەکان وەکو (ترشی نتریك) کە خوا فەرموویەتی ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾ ﴾ ، واتە : ئایا نابینی خودا هەور لێ دەخورێ ، پاشان کۆیان دەکاتەوەو پێکیان دێنێ ، پاشان دەیانکاتە کەڵەکە هەور ، باران دەبینی لەناویەوە دەردەچێت ، وە لە ئاسمانەوە لە چیاکانی ناویدا تەزرە دەبارێنێ ، کێی مەبەست بێ تووشی دەکات و کێی مەبەست بێ لێی لادەدات ، نزیکە ڕوناکی بریسکەکەی سۆمای چاو ببات ، لێرەدا قورئان ئاماژە بە پەیوەندی نێوان تەزرەو بروکە دەکات.

## پەیوەندی نێوان بروسکەو تەزرە چیە ؟؟

وەك لە گەردووناسیدا باسمان کرد لەم دوایانە زانست سەلماندی پەیوەندی هەیە لەنێوان تەزرەو بروسکەدا وەك قورئان پێش (١٤٠٠) ساڵ فەرموویەتی ، ئەو پەیوەندییە ئەوەی لێ دەخوێندرێتەوە کە تەزرە (البرد) پریشکی کارەبایی پەیدا دەکات لەسەر چینەکانی هەوردا لەکاتی دابەزینی دا ، یان لەنێوان دوو چینی بارگاویدا دەیخاتە لەرینەوە ، ئەمەش بڕی کارەبا لەسەر ئەو هەورە کەڵەکەیە بەرزتر دەکاتەوە تا پلەیێك بەتاڵ بوونەوەی کارەبایی و شۆرتەکی فرە ڕوودەدات ، پلەی

**گەرمی دەگاتە ئاستی سپێتی و خەریك دەبێ ئاوی چاو ببات ، لەیەك چرکەدا (٤٠) جار لەناو هەورەکە (المزن) دووبارە دەبێتەوە .**

**کەواتە : بروسکە پریشکێکی کارەبایی ترسناکە [١٤٥] دەبێتە هۆی کارلێکردنی ئاوی باران و نایترۆجین و ئۆکسجین و بەرهەم هێنانی ترشی (نیتریك) ، کە ئاوی باران بۆ ترش دەگۆڕێ ، هەمان ڕێگای زانستی یە بۆ ئامادەکردنی ترشی (نیتریك) لەکارگەدا...**

**ئەوەی لە تاقیگەدا ڕوودەدات بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی خوا لە ئاسۆداو بۆ فێرکردنی هەندێ زانست بە مرۆڤ ﴿ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾ ، پاشان (پلاس n.plass) هات لە ساڵی (١٩٦٥)دا دوای کۆمەڵە ئەزمونێ بۆی دەرکەوت : زۆربوونی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە هەوادا پلەی گەرمی زەوی بە پلەی (٦,٥)° فەهرنهایتی بەرزدەکاتەوە ، لە ساڵی (١٩٦٣) دا (فریتز مولەر) رایگەیاند زیادبوونی ئەو گازە لە هەوادا بەڕێژەی (٢٥٪) پلەی گەرمی (١-٧) پلەی فەهرنهایتی بەرزتر دەکاتەوە .**

**بارودۆخی تری هەوایی کار لە زیادو کەمیەکەی دەکات ، گرنگترینیان هەڵمی ئاوە ، بەڵام وردترین دەقیان ئەو ژمارەیە (سیوکورماتابی) ئاماژەی بۆ کردووە ، کە دەڵێ : (بەرزی پەیتی ئەو گازە لەو کاتەدا دەگاتە (٢٠٠-٦٠٠) بەشی لە ملیۆنێك ، واتە : هەندەی تێکڕای بڕی ئێستاکە ، پلەی گەرمی زەوی (٤,٢٥) پلەی تر زیاد دەکات**

---

[١٤٤] قورئان بەر لەزانستی نوێ ئاماژە بە پریشکی کارەبایی تیشکی خۆری و تەقینەوەی خۆری و ئەتۆمی و تەقینەوەی بروسکەیی دەکات (**انها ترمي بشرر كالقصر ، كأنها جمالة صفر**) (**المرسلات ٣٢- ٣٣**) ، واتە خۆر پریشکی وەکو کۆشك دەهاوژێژێت ، وەکو کاروانی وشتر زەرد وایە ، بێگومان زانست سەلماندویەتی پریشکی خۆری و کارەبایی وەکو کاروانی وشتری زەرد وایە بەدوای یەکتری دا دەردەچن ، یان لە ئایەتی تردا ئاما بە شەپۆلی دەریاکان دەکات : (**وهي تجري بهم في موج كالجبال**) (**هود٤٢**) واتە : ئەوان لە شەپۆلی شێوەی چیاکاندا دەڕوێنێت، شەپۆلەکان لە پێناسەی زانستی فیزیایی دا وەکو زنجیرە چیاکان و کاروانی وشتری زەرد وان بەدوای یەکتری دا .

لەکاتی بوونی هەورێکی مام ناوەندا ، گەر سامالٚ بوو بۆ (٥,٢٥)°س پتر دەبێت ، چونکە هەور بەشێك لەو گەرمی یەی بەرەو زەوی دێ پێچەوانەی دەکاتەوە .

بەهەرحالٚ زیادی بەردەوامی پەیتی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لەئەنجامی کرداری سووتاندنی (سووتەمەنی) دا بەهۆی رابوونی تەکنەلۆجیاوە بۆ (١,٨) بەشی ملیۆنێ سالآنە بەرز دەبێتەوە ، بەلآم ئەو زیادەیەی زانایان ئاماژەیان بۆ کردووە لە (٠,٧) بەشی ملیۆنێ سالآنە زیاد دەکات ، ئەو جیاوازییە بۆ کوێ ڕۆیشت؟ جیاوازی لەو برە دایە کۆ دەبێتەوەو دەمێنێتەوە (واتە : ١,٨ — ٠,٧=١,١) بەشی ملیۆنێك لەبەر هەوادا دابەش بەسەر ئەوەندەی ڕووەکەکان هەڵی دەمژن و ڕووبەرە کشتوکاڵییە باشکراوەکان و ئەوەی دەریا و ئۆقیانووسەکان دەیمژن ، بەلآم خێرایی مژینی ئەو گازە بەپێی بەزربوونەوەی پلەی گەرمی کەم دەبێتەوە ، گەر ئەو گەرمییە لە تێکڕای ئێستا بەرزتربێتەوە ، ئەو کاتە ڕێژەی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لەناوەوە بۆ هەوا بەرزتر دەبێتەوەو لە بەرگە هەوادا بە پیتییەکەی زیاتر دەبێت ، بەمەش پلەی گەرمی هەسارەکەمان بەرزتر دەبێتەوە ، لەوانەش ئاو (الماء) ئەویش بە دەوری خۆی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بەرزتر دەکاتەوە ، کردارەکە لە شێوەی چەند ڕووداوێکدا ڕوودەدات ، چەند نارێکییەك پەیدا دەکات ، ئاستی ئاو لە ئۆقیانووسەکاندا بەرزتر دەکاتەوەو هەندێ ولآتە کەنارەکان نقوم دەکات .

ئەو کەرستانەی لە چوارچێوەی زیندەگی زەویدا زیاتر پەیت دەبنەوە کامانەن ؟ ئیمڕۆ پەیتی و خەستی کەرستە زیان بەخشەکان لە ژینگەی زیندەگی زەوی دا زیادی کردووە ، کەواتە : تۆزو گەردە بلآوەکانی ناو هەوا دیسان دووەم ئۆکسیدی گۆگردو یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئۆکسیدی نایترۆجین و هایدرۆکاربۆنات و گۆگردیتی هایدرۆجین و فلوریدو ئەو ماددانەی هەستەوەری (الحساسیة) پەیدا دەکەن ، پاشماوە گەردەلولە لاوییەکان و دەریایی یەکان و ئەو ماددانەی وردو بچوکن لەکارگەکانی وەکو : خۆڵەمێش و مەنگەنیزو ئیسبەست و فافۆن و دەرمانی قەلآچۆکردنی کشتوکاڵییەکان و مێرووە بلآوەکانی ناو هەواوە دەردەچن ... دیسان

پاشماوەکانی سووتاندنی خەڵوزو چەوری لەیەکەکانی گەرم کردنەوەی ناو ماڵ و وێستگەکانی وزەو پاشماوەکانی کارگەکانی پەڕەو کاغەزو کانزاکردن و نەوت ، ترسناکترینیان دووەم ئۆکسیدی گۆگرد (کبریت)ە.

## ئاسەواری خراپی پاشماوە پیشەسازییەکان چی یە ؟

جگە لەوەش پاشماوە پیشەسازییەکان لە دووەم ئۆکسیدی نایترۆجین گەر لە هەوادا لەگەڵ هەڵمی ئاو یەکی گرت چەند جۆرێکی تەواو ڕووەك لەناو دەبات و کۆتایی لەزۆرێ لە بیناکان و شوێنەوارەکان دێنێت ، خوداوەند حوکم دەکات بەسەر بڕی شۆڕتی کارەبایی هەورو ماوەکی و دووبارە بۆ ئەوەی لە هەوردا ، تا ئۆکسیدی هایدرۆجینی کار لە باران نەکات و نەیگۆڕێ بە سوێرێکی ترشەلۆکی ، ئەمەیە جێگای بەهرەی خوا بەسەر خەڵکەوە ، کاتێ فەرموویەتی قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ . لێرەدا تاوانی مرۆڤ ئاشکرا دەبێ لە فڕێدانی بڕێکی ترسناك لەو ئۆکسیدانە ، کە لە سەرووی توانای ئەو هاوسەنگی یەدا بێ خودا دایناوە بۆ دروستی دیاردە هەواییەکان و ڕام کردنی یان لە خزمەت مرۆڤدا ، گەر بەردەوام بێ لەو کارەیدا بە ئەنقەست و دەستی تاوانکاری ئەو ئایەتەی بەسەردا پیادە دەبێت ، ﴿ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ ﴾ محمد ، واتە : ئاوێکی گەرمیان خواردەوە ڕیخۆڵەکانی بڕین .

## نیشانە بەرجەستەکانی سووڕە سروشتییەکان چییە؟

نیشانەی دەرکەوتوی سووڕە سروشتی یەکان ئەومیە بەیەکتریەوە وا بەستەن ، بۆ نمونە : باران بارین و داخورانی خاك (تآکل التربة) لەیەکتری جیاواز نین ، بەزۆری سووڕە سروشتیەکان ئاڵۆزن و چەندان قۆناغیان هەیە ، سووڕی نایترۆجین لەسروشتدا ئاڵۆزەو لەگەڵ سووڕەکانی تردا بەشداری دەکات ، کرداری لێك

هەڵوەشاندنی گەردی نایترۆجین بەهۆی شۆڕتی کارەباوە لەکاتی جوڵەی بارستایی هەواییدا بەسووڕی هەواوە لەبەرگە هەوادا دەبەسترێتەوە[١٤٦] .

## جووتە سی یەکانی مرۆڤ چەند کگم ئۆکسجین وەردەگرێت؟

لە قورئاندا لە دوو ئایەتدا گرنگی ئۆکسجین بۆ ژیانی مرۆڤ و گیانداران باس دەکات ﴿ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ ﴾ ، واتە : سوێند بە بەرەبەیان کاتێ هەناسە دەدات .

ئاشکرایە ڕووەکەکان لەکاتی بەرەبەیاندا هەناسە دەدەن بۆ گۆڕینی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بۆ ئۆکسجین، ئۆکسجین بەشێکە لە پێکهاتەی ئاو لە زەویدا ، گیاندارانی ئاو لەو ئۆکسجینە تواوەیە سوود وەردەگرن . خوا فەرموویەتی ﴿ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ لێرەدا دەردەکەوێ ئۆکسجین و ئاو گرنگترین هۆکاری ژیانن ، پاشان بەرگە هەواو خۆراك و تیشك و ڕوناکی و خاك .

بڕی ئاوی سەر زەوی بە (١٥٠٠) ملیۆن کم$^3$ مەزندە کراوە ، مرۆڤ ئاوی ئۆقیانوسەکان تەنیا بۆ چالاکی و ئابوری و گواستنەوەو ڕاو بەکاردێنێت ، تەنیا ئاوی شیرین بۆ خواردنەوە بەکاردێنێت ، (سی . أ . دووج) لە ساڵی ١٩٧٣ دا رایگەیاند مرۆڤ تەنیا (١٪) ی ئاوی یەدەگی زەوی بەکاردێنێ و (٩٩٪) ی ئەو ئاوە ئاوی ژێر زەوییە ، کە دەگاتە قوڵایی نزیکەی (١٠٠٠)م لەژێرخاکدا ، (١٪)ی ئاو لەسەر ڕووی زەوی بەکاردێ و ئاوی ڕووبار و حەوزە سروشتی یەکان و دەریاچە و زەلکاوەکان ... هتد پێك دێنێت .

---

[١٤٦] الموسوعة العلمية في اعجاز القران الكريم والسنة النبوية / د.هاني بن مرعي القيسي /ل:٣٨٣ – ٣٨.

(٩٠٪)ی ڕووەك ئاوە ، هەندێ ڕووەكی نیمچە وشك (٥٪)ی ئاوە ، گیانداران (٨٠٪)ی لەشیان ئاوە، كاتێ منداڵ لە دایك دەبێ تا سێ ڕۆژان (٩٨٪)ی ئاوە ، دوای (٨) مانگ دەبێتە (٨١٪) لەتەمەنی (٦٥) ساڵیدا دەبێ بە (٧٠٪) ، ڕۆژانە مرۆڤ پێویستی بە (٢،٥ - ٣) لیتر ئاوە بیخواتەوە ، لە ڕووی بایۆلۆجی یەوە گرنگی خۆی هەیە ، لەوانە پێك هێنانی خۆراك لەلەشدا ، ڕۆژانە مرۆڤ (٣٥) گم لەبەرامبەر هەر گرامێكی لەشی دا ئاو بەكاردێنێت ، مرۆڤ ڕۆژانە (٣٠٠-٤٠٠) گم ئاو تەنیا لە ڕێگای هەناسەدانەوە لەدەست دەدات .

مرۆڤ لەناو ئۆقیانوسێ هەوا دایە (٩٠٪) ی ئەو هەوایە لەبەرزایی (١٥)كم دایە ، بۆیە تا بەرزدەبێتەوە فشاری هەوا دا دەبەزێ و زۆر توخمی فیزیایی دەگۆڕێن وەكو : گەرمی و شێداری و ئایۆن و تەوژمی هەوایی مرۆڤ ڕۆژانە (٢٠م$^3$) هەوا بە كاردێنێ واتە (١٥)گم (الانسان والبيئه / ام هولي) سەیر بكە).

قورئانیش فەرموویەتی : ﴿ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿١٢٥﴾ ﴾ ، لێرەدا قورئان ئاماژە دەكات ئۆكسجین بۆ هەناسەدان گرنگە لە ژیانداو تا مرۆڤ بەرزبێتەوە پەستانی هەوا كەم دەبێتەوە ، بۆیە هەناسەی تەنگ دەبێت.

وەكو (د.هانی بن مرعی) نووسیویەتی : هەوا توخمێكی بنەڕەتی و پێویستی هەموو زیندەوەرانە ، هەمو ڕۆژێ سییەكان (١٥)كگم لەهەواوە وەردەگرن ، كەچی لەش تەنیا (٢،٥) كگم ئاو و كەمتر لە (١،٥) كگم خواردن دەمژێت[١٤٧] .

گەر سەیری سوڕەتی (هود) بكەین ئاماژە دەكات لە دونیای تریشدا هەناسەدان هەیە ، بۆ نمونە لە ڕاست دۆزەخیەكان فەرموویەتی ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ

---

[١٤٧] الموسوعة العلمية / د.هاني بن موعى / ل:٣٨٧.

﴿ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ واتـه : ئەوانـەی خراپـەکار بـوون لـە ئـاگر دان ، لەوێـدا هەیـە بۆیـان هەناسـە دانـەوەو هەناسـە وەرگـرتن. (الـزفیر) واتـە : هەناسـەدانەوە (الشهیق) واتە : هەناسە وەرگرتن.

خـوا فەرموویـەتی : ﴿ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ ﴾ واتـە : لەبـەرزایی دا ماندووی دەکەم ، یـەکێ لـەماناکانی ئەوەیـە تـا مـرۆڤ بەرزبێتـەوە هەناسـەی تـەنگتر دەبێت ، ئەم دیاردەیە لە جیهانی دۆزەخیش دا هەیە .

## گرنگی هەوا چیە؟؟

هەوا گرنگترین هۆکاری هەوایی جیا جیایە ، ئەو لەتوانایدایە هۆکارەکانی پیس بوون لە ناوچەیێکی دیاری کراودا بلاوبکاتەوەو بیباتە ناوچە دورەکان ، دیسان گۆڕانی پلەی گەرمی زۆر گرنگە بۆ پیسبوونی هەوا لـە شـارەکاندا ، هەنـدێ جـار دەبینـین هـەوای گـەرم لـە چینە بەرزەکانـدا هـەوای ساردی نزیـك لـەزەوی لەبەرزبوونـەوەو دابـەش بوونی هۆیەکانی پیس بوونی قەدەغە دەکات .

## هەندێ لەو هۆکارانەی کار لە پیسبوونی هەوا دەکەن :

هەر لەکۆنەوە مرۆڤ پەی بە مەترسییەکانی پیسبوونی هەوا کردووە ، کە بورکان و تۆزو گەردی هەوا پەیدای دەکات ، کە هەندێ وەرزی دیـاری دیـاریکراو وا لـە ئاکامی پەڕینی هەڵاڵەکانەوە پەیدا دەبێت.

لەهەموو دۆخێکدا کاتێ مرۆڤ ئاگری دۆزییەوە، هەمان مەترسی بۆ هەوا گوازرایەوە، هەرکاتێ ئاگری بەرداوەتە دارستانێ یـان بـۆ روناککردنـەوەی ئەشکەوتەکەی ئـاگری کردۆتەوە هەوا پیس بووە.

لێرەدا هۆکـاری تـر هەیـە کارلـە پـیس بـوونی هـەوا دەکـات، تیشـکی خـۆر کاریگـەری گەورەیان هەیە لە دروستکردنی (نیتراتی بیرا سیتیلدا) ، دوکـەڵی (سـەمۆج smog)

بەگشتی هەوا پیس دەکات ، شێداری بەشداری دەکات لە گۆڕینی (ئینهیدریدی گۆگردی) بۆ ترش[148] .

(بریج کوبال) دەنووسێ : هۆکاری سەرەکی پیس بوونی هەوا بەهۆی زیادبونی گارە ژەهراوییەکانەوەیە ، یان چەند کەرەستەیێکی دیاریکراوە ، زۆربەی ئەو گازانە سووتەمەنی ئۆتۆمبێل و ئامێرەکانی ماڵەوە دروستی دەکەن ، ئەو گازانە ئاوێتەی ئۆکسیدەکانی کاربۆن و نایترۆجینین ، سەرباری هایدرۆکاربۆنەکان) دیسان لەکاتی سووتاندا بڕێکی زۆر گەردی کاربۆن و قورقوشم بەرهەم دێت.

سروشتی یە ئەو گازانە بە هەوادا بلاّوببنەوەو بۆ بڕێکی هەست پێ نەکراوە لە خەستییەکەیان کەم بێتەوە ، شارستانی و پیشەسازی لەهەندێ ناوچەدا پیس بوونی گەورەی پەیدا کردووەو زۆر لەمێژە لە خەستییەکەی کەم نەبۆتەوە ، گازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن زۆر ژەهراوییە بۆ مرۆڤ چونکە توانای خوێن گواستنەوەی (ئۆکسجین) کەم دەکاتەوە ، گەر بە خەستی (١٠٠) بەش لە ملیۆنێ تووشی ببێ زۆر جار کاتژمێرێ تووشی سەر لە گێژەوە هاتن و سەر ئێشە دەبێت ، ئەگەر زۆر چڕ بوو مرۆڤ و گیانداران دەکوژێت ، (ئۆزۆن) هۆکارێکی ئۆکسید کەری بەهێزە ، لەسروشتدا ڕێژیێکی کەمی هەیە لە پەیتی دا ، (٢٪) بەشی ملیۆنێکی گەلاّی کشتوکاڵ لەناو دەبات وەکو توتن و تەماتەو ماشە سپی یە (لۆبیا) و کاژ (سنەوبەر) ، وە لاستیك ڕەق دەکات و ڕەنگەکانی شانە لادەبات ، ئەگەر ڕێژەی (یەك لەسەر ملیۆن)ی چڕی کەمتر بوو ئازاری لینجە پەردە دەدات .

گازی دووەمی گۆگردو گۆگردیتی هایدرۆجین زیان لە داهاتی دەغڵ و دان و دارستانی کاژ و دار سێو دەدات ، ئەو گازانە سروشتێکی ترشەلۆکییان هەیە ، ئەمەش لەکاتێ دا دەبێ لەگەڵ شێ دا یەکتر دەگرن ، کار دەکەنە سەر کانزا و شانە و گیانداران ،

---

[148] الموسوعة العلمية / د: هاني بن مرعی / ل:٣٧٨ / ٣٨٨) بە هەندێ دەسکارییەوە .

ئۆکسیدی نایترۆجین ئۆکساندنی بەهێزەو ڕووەك و گیانداران دەکوژێت، گەورەترین ڕۆڵی پێك هێنانی دوکەڵ و تەمە ، لەباری ساردی شێداردا (هایدرۆکاربۆنات)ی جیا جیا لەکاتی بوونی ڕوناکیدا لەگەڵ (ئۆکسیدەکانی نایترۆجین) یەکتر دەگرن (نتراتی ئۆکسیدی ئەستیل) (PNA) و ناوێتەی تری هاوشێوەی ئەو پێك دێنێت ، ئەو کەرستە کیمیاییانە لە ڕۆژانی تەم و مژدا لە هەوادا دەمێنێتەوەو لەدەوری گەردەکاندا دەمژرێ و کار لە تەواوی زیندەوەران دەکات .

دەبینرێ لە سەرووی (ئۆکسیدی ئەسیتیل) بەشداری کارلێکردنی (Hill) دەکات و زیان لە ڕووەکی گژو گیاو فاسۆلیا دەدات ، هەروەها چاو و بۆڕیچکە هەواییەکان دەڕوشێنن و تووشی سوتانەوەو خرویان دەکەن ، گازی تریش وەکو (فلوریدات) پەیدا دەکات کە لە پیشەسازی (ئەلەمنیۆم) بەرهەم دێت ، (فلۆریدات) زیانێکی مەترسیدار بەگەلا پێ گەیشتووەکان و دارو درەختەکان و میوەکان دەگەیێنێت.

دیسان ئەو تۆزو گەردانە کەرستەی کیمیای جیاوازو قەلاچۆکەرو ژەهراوییان لەناودایە وەکو ناوێتەکانی ئەندامی (فافۆن و ئارسینیك و قورقوشم و کادیۆم) کە مرۆڤ تووشی (سیل) و (شێرپەنجە) دەکەن[149] .

قورئانی پیرۆز بەر لە زانستی ژینگەزانی ئاماژەی کردووە بە کاریگەری بروسکەو سووتان و کەم بارانی و پیس بوونی هەوا بۆ سەر لەناو بردنی ڕووەك و باخچە و گەرمبوونی زەوی و شکبوونی گۆم و کانیاوەکان .﴿ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ﴿٤١﴾ ﴾ ، واتە : شایەد پەروەردگارم باشتر لە

[149] مبادیء علم البیئة / ل: ٢٦٧ – ٢٦٨ ، بە کەمێ کورت کردنەوە .

باخچەی تۆ بەمن بدات و لە ئاسمانەوە کارەساتێ بنێرێ باخچەکەت بکاتە خاکێکی ڕووت ، یان ئاوەکەت ڕۆ چوێنێ و نەتوانی داوای بکەیەوە .

بێگومان پیس بوونی هەوا بەهۆی ماددەی ڕەق و شل و گازی زیانێکی فسیۆلۆجی و ئابووری و زیندەگی لە مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك و کەل و پەلەکان دەدات ، زیانی ساڵانەی جیهان بەهۆی پیسبوونی هەوا بۆ سەر داهاتەکانی ڕووەك و سەوزایی دەگاتە (٥٠٠٠) ملیۆن دۆلار[١٥٠].

فلوریدات ئێسکی ئاژەڵ تووشی شەلین و گێڕی دەکات ، خوێی فورقوشم ئاژەڵ و گیانەوەر پێیان تووشی ژەهراوی کردن دەکات ، ڕووەکەکان لە هەوای پیسدا دەخنکێنن، تەم و مژو خۆر بەرایی خۆر دەگرێ و بڕی ڕوناکی کەم دەکەنەوەو کار لە گەشەی ڕووەك و داهاتی دەغڵو دان دەکات ، دیسان گازە ژەهراوییەکان کۆ ئەندامی هەناسەو بینین تووشی نەخۆشی دەکات ، ئۆکسیدەکانی گازی نایترۆجین زیان لە کۆئەندامی دەمار دەدات ، هەروەها تیشکە ئەتۆمییەکان یان مردن یان شێوانی (سك مانگی) تووشی زیندەوەران دەکات ، هەڵمی ئەمینە ئەندامییەکان هەندی جۆر شێر پەنجە دروست دەکات ، بۆ زانستی پتر بڕوانە (التربیة و البیئة) کە لە پەراوێزی خوارەوەدا ئاماژەی بۆ کراوە .

لە فەرموودەدا هاتووە : (تنکبوا الغبار فان منە تکون النسمة) (الخطابي) لە (غرائب الحدیث)دا هێناویەوە ، واتە : خۆتان لەتۆزو خۆڵ بپارێزن نەخۆشی تێدایە ، (النسمة) وەکو لە (النهایة ابن الاثیر /) دا باسکراوە بەمانای هەناسە تەنگی و ڕەبوەو نەخۆشی دێت.

---

[١٥٠] التربیة والبیئة / د.عادل مشعان ربیع/ ل:٣٧.

## كون بوونی چینی ئۆزۆن و مەترسییەکانی:

یەکێ لە دیاردەکانی پیسبوونی هەوا کونبوونی چینی ئۆزۆنە ، کە پارێزەری زەوییە لە تیشکە زیانبەخش و کوشندەکانی وەکو ژێربنەوشەیی.﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ﴾ الأنبياء: ٣٢ ، واتە : ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی پارێزراو .

﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ ﴿٢٥﴾ ﴾ الفرقان: ٢٥. واتە : رۆژێ دێ ئاسمان بە هەورێ کەرت و کون بوو ، بێگومان خوای گەورە چینی ئۆزۆنی خستۆتە ئاسمان ، چونکە گەر لە نزیك زەوی بوایە کوشندە دەبوو .

(د.عادل مشعان) دەنووسێ : کاتێ ئۆزۆن لە زەوییەوە نزیك بوو دەگۆڕێ بە پیس کەرێکی زۆر ترسناك ، کەچی ژیانی مرۆڤ و گیانداران لەسەر ڕووی زەویدا پەیوەستە بەو گازەوە ، چینی ئۆزۆن لە بەرزایی (٢٠-٥٠) کم دایە ، ئۆزۆن ($O_3$) لە ئۆکسجینی هەوایی پێك دێ ، جیاوازی لەگەڵ ئۆکسجین ($O_2$) ئەوەیە ئەو لە سێ گەردیلە پێك دێت ، زۆر لەو تیشکانەی لە خۆرەوە دێن بۆ سەر ژیان ترسناکن ، بەلآم لە سایەی ئۆزۆن مەترسی ئەو تیشکانە لا دەچێت ، نەمانی یەك بڕی کەم لەو گازەیە تیشکە زیانبەخشەکان مرۆڤ توشی شێرپەنجەی پێست دەکات و ڕێژەی نەخۆشی یەکان فسیۆلۆجی ڕوومەکان پتر دەکات .

دیسان بینراوە ئەو فرۆکانەی لەسەرووی دەنگەوە دەڕۆن گازەکانی (ئۆکسیداتی نیترۆجین) و (هەڵمی ئاو) فڕێ دەدەن ، کە یارمەتی لە ناوبردنی ئەو گازە دەدات ، یەکێ لەو کەرستە کیمیاییانەی شی نابێتەوە (فریونات)ە ، توێژینەوەکان دەریان خستووە کاریگەری خراپی بۆ سەر ئۆزۆن هەیە ، دوا زانیاری پیشان دەدات کونبوونی

چینی ئۆزۆن لەسەرووی جەمسەری باشورەوە گەیشتۆتە (٩) ملیۆن میل دووجا ، واتە : سێ ئەوەندەی ڕووبەری ئەمریکایە[٥١].

قورئانی پیرۆز ئاماژە بە مەترسییەکانی پریشك و تاوێرەکان و تیشکەکانی خۆر دەکات ، کە لەدەرەوەی زەویدا بۆ هەموو لایەکدا پەل دەهاوێژن :﴿ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ ﴾ واتە : ڕەوانە دەکاتە سەرتان گڕو بڵێسەی ئاگری بێ دوکەڵ و سەرناکەون ، خۆر لەدەرەوەی زەویدا پارچە گڕاوی (شواظ)ی بۆ دووری (٥٠٠) هەزار کم لێ دەبێتەوە ، ڕەشەباو گەردەلولی بەرەو بۆشایی هەڵدەکات کار لە کەش و زۆربوونی گەردەلول کەشتییەوانە ئاسمانیەکان چینی ئۆزۆن دەکات ، وەکو لە کتێبی (گەردووناسی و زەوی ناسی) دا باسکراوە.

## گەرمبوونی گۆی زەوی و مەترسییەکانی:

لێرەدا خەریکە هەموو زانایان یەك دەنگ ببن لە چل ساڵی داهاتوودا جیهان بەرەو گەرمییەکی بەرز بڕوات ، بەهۆی زۆر بەکارهێنانی بەرهەمی پیشەسازی و دوکەڵی تەکنەلۆجی و دوکەڵی ترومبێل و گازە ژەهراوییەکان و پلەی گەرمی (٨)° س بەرز دەبێتەوە ، ئەو پلە گەرمییەش لەسەرووی ئاستی مرۆڤەوەیە ، مەگەر خوای بەبەزەیی ڕای بگرێت ئەگەرنا بەکەس ڕاناگیرێت ، وردترین وەسف بۆ پیس بوونی زەوی (الفساد) ە ، واتە خراپەکاری و گەندەڵکاری و تێك دان ، کە قورئانی پیرۆز بەکاری هێناوە﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾

ئاگری دنیا لەئاستێ دایە مرۆڤ و زیندەوەران بەرگەی ناگرن ، ئاگری پەسلانیش هەر بە خەیاڵیش هەڵت دەلەرزێنێت ، هەموو بەڵگەکان ئەوە پیشان دەدەن وشکایی و بە

---

[٥١] التربية و البيئة / ل: ٤٩- ٥٠.

بیابان بوون له ڕابردوو پترەو باران له جاران کەمتر دەبارێ و جیاوازییەکی بەرچاو دەبینرێ لەدابەش بوونی ڕووەك لەزەوی دا ، لەدابەش بوونی بەستەڵەك و ، ئەمەش زەنگی مەترسی لێ دەدات ، کە گۆڕانی گرنگ له هاوسەنگی گەرمی زەوی دا ڕویداوە[152] .

قەتیس بوونی گەرمی (الاحتباس الحراري – global warming) دیاردەی قەتیس بوونی گەرمی دیاردەیەکی ژینگەیی یە ، گەر دەوام بکات له زەوی دا بۆ ژیانی سەر زەوی باشە ، قەتیس کردن و گلدانەوەی گەرمی بوار نادات ئەو گەرمی و وزەیەی له خۆرەوە بەزەوی دەگات پەرت بێت و بەفیرۆ بڕوات ، گەر وا نەبوایە پلەی گەرمی زەوی له سنووری (١٨°)س له ژێر سفردا دەبوو نەك (١٥°)س له ژێر سفردا.

ئەو گەرمییە بەهۆی کۆمەڵێك گاز بە ڕێژەیێکی سروشتی قەتیس دەبێ ، ئەمەش یارمەتی دەر دەبێ بۆ گونجاندنی کەش و هەواییکی لەبار بۆ زەوی ، بەلام چالاکی مرۆیی کاریگەرییەکی گەورە دەکاتە سەر ئەم دیاردەیە ، بەهۆی زۆر بوونی ئەو گازانەوە ، کە بەشداری دەکەن له گلدانەوەی گەرمیدا ، ئەو گلدانەوەیەش بەزۆری زیان له هاوسەنگی سروشتی ئەو دیاردەیە دەدات و هەڕەشەی گەورە دەکات ، بە کێشەو ئالۆزی ژینگەیی و تەندروستی ئەو پەڕی ترسناك ، دیارترینی ئەو گازە مەترسیدارانەش (هەڵمی ئاو و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و گازی میسان و گازی فلۆریدی کلۆر)ە ، ئەو گازانەش له سووتاندنی ئەو ماددانە پەیدا دەبن توانای سووتانیان هەیە و بەکاردێنرێن ، وەکو (پترۆڵ و گازی سروشتی و خەڵوز) ، ئەمانە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەسەر زەویدا .

گازی (دووەم ئۆکسیدی کاربۆن) له هەوادا له دیاردەی خانووی شوشەیی و نایلۆنی (البیوت الزجاجیة – Green house effect) دەچێت ، کە ڕێگا بە (بەرگە

---

[152] الموسوعة العلمية / د.هاني بن مرعي.

هەوا) دەدات بەهەمان ڕێگای ئەو نایلۆنانەی کشتوکاڵیان لە ژێردا دەکرێ تیشکی خۆر بڕواتە ناویانەوە ئەو گەرمییەی بەهۆی دابارینی تیشکەکانەوە پەیدا دەبێت ، بەربەستی لەبەردەمیدا پەیدا دەبێ و بەهۆی بەرگە هەواوەو ناتوانێ بیبڕێ ، وەکو چۆن ناتوانێ نایلۆنی یان پلێتە شوشەیی پیەکان بە تەواوی ببڕێ ، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی .

گەرمی (الحرارة) بریتی یە لە : تیشکی ژێر سووری شەپۆل تا ڕاددەیێك درێژو ناتوانێ پلێتە شوشەیی و نایلۆنەکان ببڕێ ، یان بەچینی دووەم ئۆکسیدی کاربۆندا گوزەر بکات ، بۆیە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و گازەکانی تر گەرمی گلدەدەنەوەو زەوی گەرم دەکەن.

زیاتر بوونی پلەی گەرمی زەوی بە ($5^{\circ}$)س دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی دەریاکان بۆ (١٠)م زیاتر لە جاران ، ئەمەش دەبێتە هۆی نوقم بوونی زۆربەی پایتەختەکانی جیهان و خاکە کشتوکاڵییەکان و زۆربوونی گەردەلولی دەریایی گێژەلولەکان و لافاوەکان ، لەبەر ئەوە لە پێشهاتەکانی شارەزایانی جیۆلۆجی و ژینگەدا هاتووە : ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر زەویدا دێن لەماوەی (٥٠) ساڵی داهاتوودا بە ئەندازەی ئەو گۆڕانانە دەبێت لەماوەی (٤) ملیۆن ساڵی ڕابردوو بە هۆکاری سروشتی بەسەری هاتووە ، ئەمەش قەبارەی خێرایی و شێوانی ئەو گۆڕانانە بۆ خوێنەرو لێکۆڵەر دەخاتە ڕوو کە بە هۆکاری مرۆیی بەسەر زەویدا دێن زیاد لە هۆکاری سروشتی[١٥٣]. هەر بۆیەش خودا (الفساد) لە قورئاندا دەداتە پاڵ مرۆڤ (ظهر الفساد في البر والبحر بما كسبت أيدي الناس ...) (الروم : ٤١)

لەمێژ نییە لەخەوندا بە خزمەت خۆشەویستم گەیشتم (ﷺ) گەیشتم کەشتی نوحی بەدەستەوە بوو بەمنی فەرموو : ئەم ئومەتە بە لافاوان لەناو دەچێ .

---

[١٥٣] التربية والبيئة / ل: ٤٧– ٤٩ بەکورت کردنەوە .

بێگومان (لافاو) ئاماژەیە بۆ لافاوی ئاسایی و پەلاماری ستەمکاران بۆ سەر دنیای ئیسلامی ، پاشان چوو ڕایەخێکی هێناو فەرمووی بۆ تۆم هێناوە لەسەری دانیشیت.

(ابن مسعود وەکو ابن جریر) گێڕاویەوە : (الارض کلها نار یوم القیامة) ، واتە : لە پەسلاّندا زەوی هەمووی دەبێتە ئاگر .

خوای گەورە ئاماژە بە زۆربوونی لافاو و تسونامی و بورکان و بومەلەرزەی زۆر دەکات ، کە داهاتوو زەوی دا دەپۆشن :﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ۝١ ﴾ ، واتە : ئەی خەڵکینە لەخوا بترسن بومەلەرزەی قیامەت شتێکی گەورەیە. (الشعبي) و (علقمة) پێیان وایە ، ئەم بومەلەرزەیە لەدنیادا ڕوو دەدات پێش هاتنی قیامەت ، (الدر المنثور / ج٦ / ل:٦) سەیر بکە .

ڕۆژانە نزیکەی (٣٠٠٠) بومەلەرزە لەزەویدا ڕوودەدات ، زۆربەیان دەکەونە ناوچەی پشتێنەی ئاگر (حلقە النار)ەوە (Ring of fire) و (٨٠٪)ی بومەلەرزەکان لەوێ دا ڕوودەدات و دەکەوێتە ناوچەی لێوارەکانی زەریای هێمن (الهادىء) و لە هەموو شوێنی پتر بورکانی تێدا دەقەومێت ، بەچاوی خۆمان تسونامی (شەپۆلی دەریایی) ساڵی (٢٠٠٤) مان بینی لە تەلەفزیۆنەکان لە ئیندۆنیسیا) ، کە (١٦٠) هەزار کەس بوونە قوربانی و چەندان ملیۆن کەس ئاوارە بوون، لە تسونامی یەکاندا شەپۆلەکان (٦٠)م زیاتر بەرز دەبنەوە ! وەکو خوا لە ڕاستی یان فەرموویەتی ﴿ وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ ﴾ بۆ زانستی پتر بڕوانە : (الزلازل والبراكين/ د.ايمن الاسكندرى) و (زەوی ناسی) نووسەر.

گەرمبوونی گەردوونی (ئەو کێشەیە بریتی یە لە گەرمبوونی زەوی ساڵ بەدوای ساڵدا ، ئەمەش بەهۆی زۆربوونی ترومبێلە ، کە سووتەمەنی دەسووتێنن ، هەروەها بەهۆی زۆربوونی کارگەکانە ، کە دوکەڵ دروست دەکەن ، پاشان ئەمانی

دارستانەکانو زۆربوونی بارانی ساڵانە و کون بوونی چینی ئۆزۆن هتد هۆکاری سەرەکی ئەم کارەساتەن .

گۆڤاری (فیطارو / ژ :١٥٧١٦ / شوبات / ١٩٩٥) لەزمانی لێکۆڵینەوەی تاقیگەی چاودێری جەمسەری باشوورەوە لە زانکۆی (کامبریدج) لە بەریتانیا بلاوی کردەوە ، بارستاییەکی گەورەی سەهۆڵ بەندانی ئۆقیانووسی بەستوی باشوور تواوەتەوەو خزیوەو بەرەو کەناری ئەمریکای باشوور و دوورگەکانی (فوکلند) دەڕوات و کەشتی یە وانی ئەو ناوچانە دەخاتە مەترسییەوە ، لەمەش مەترسی تر توانەوەی هەموو بەستەڵەکی سەهۆڵ بەندانی ئەو ئۆقیانووسەیە ، بەهۆی ئەو گەرمییەی دەیان ساڵ ورده ورده زیاد دەکات لەگۆی زەمیندا[١٥٤].

بەهۆی ئەم گەرم بوونە کەش و هەوای زەوی دەگۆڕێت و هەندێ ناوچەی وەکو خاکی عەرەبستان جارەکی تر دەگەڕێتەوە بەمێرگ و ڕووبار (لا تقوم الساعة حتى تعود ارض العرب مروجاوا نهارا) (رواه مسلم) .

(خير شاهين) دەنووسێ : پیس بوونی ژینگە یەکێکە لە ئاکامەکانی پێش کەوتنی تەکنەلۆجیاو بەکارهێنانی نادروستی خێرو بێرەکانی زەوی ، خێرو بەرەکەتەکانی زەوی ڕووەکی و ئاژەڵی و کانزایی بە ڕێگای نادروست و بێ گوێدان بە ژینگە بەکارهاتووە ، یان بێ گوێ دان بە وەچەکانی داهاتوو ،

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ ﴾

ئێمە دەزانین دەوڵەتانی تەکنەلۆجیا سەرچاوەی پیس کردنی ژینگەن ، بەتایبەتی ئەمریکا ، کە تا ئێستا ڕازی نییە زۆرێ لە ڕێك کەوتنەکانی پاراستنی ژینگە مۆر بکات ، بەلام ئێمەی موسڵمان نابێ زیادەڕەوی بکەین و پێویستە پابەند بین بە

---

[١٥٤] العالم في مطالع القرن / ٢١ ، العميد الدكتور : سامي ريحانا /ج١/ مطبعة نؤبليس/ ل:٦٣.

پاراستنی ژینگەوە بە هەموو شێوەکانی یەوە ، خوای گەورە لە زۆر ئایەتدا فەرمان بە ئێمە دەکات زیادەڕەوی نەکەین ﴿ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾ . کاتێ باسی ژاوە ژو و دەنگە دەنگ (الضوضاء) دەکەین هۆکارەکەیان هەندێ سەرچاوەیە ، کە ئێمە ناچارین سوودیان لێ وەربگرین ، بەڵام هۆکارەکانی تر هەندێ کەسی نەزان دروستی دەکەن ، بۆ نمونە : بەکارهێنانی فڕۆکە و کارگە ناچارییە ، بەڵام هۆڕنی ترومبێلەکان و لێدانی گۆرانی و مۆسیقای تیژی کاسێتەکان نەزانەکان دروستی دەکەن ﴿ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ﴿١٩﴾ ﴾ ڕابردوو مانا کراوە .

فەرمووده لە ڕاست ژینگە پارێزی گەلێ زۆرن ، لابردنی ئازار لەسەر ڕێگەو شەقامەکان بەشێکە لە بڕوا ، پاکژی لە بڕوایە ، فێری کردووین گەر لەسەر ڕووبارێ بین ئاوی زیاد بەکارنەهێنین[١٥٥] .

بەم پێیە ژینگە سەرەتای هەیەو بەرەو لەناوچوونێکی مسۆگەری دەڕوا ، پێچەوانەی بۆچوونی ماتریالیستەکانی وەکو (دیموکریت) و (ئبیقور) و (لافوازییە) و (مارکس) کە وتویانە (گەردوون هەر هەبووەو لەناو ناچێت ، هیچ شتێ لەنەبوونەوە پەیدا نابێت) ، یان لافوازییە دەڵێ : (هیچ شتێ دروست نابێ و هیچ شتێ لەناو ناچێ ، بەڵکو هەموو شتێ دەگۆڕێت[١٥٦] ، بەڵام بێگومان زۆری نەبرد یاسای دینامیکای دووەمی گەرمی و تیۆری تەقینەوە گەورەکەی گەردوون و تیوری دروست بوون کۆتایی بەو گریمانکارییانە هێناو تا سەر خستنیە ناو زبڵدانی مێژووی ئەفسانەکانەوە وەکو لە کتێبی گەردووننناسی و زەوی ناسی گەردیلە ناسی دا باس کرا .

---

[١٥٥] علوم الارض والبيئة للهواة / خير شاهين/ ل:٢٣١- ٢٣٢.

[١٥٦] اضواء قرانية على ظواهر كونية في الافاق والانفس / د.محمد سعيد مولاي / ٢٠٤- ٢٠٧.

(جون كليفلاندكوتران)پسپۆڕی كیمیاو ماتماتیك له ئەمریكا دەڵێ:(كیمیا پێمان دەڵێ : هەندێ لە كەرستەكان بەرەو لەناوچوون دەڕۆن ، هەندێكی تر بە خێراییەكی زۆرترو هەندێكی تر بە هێواشی بەرەو لەناو چوون دەچن ، بەو پێیە ماددە ئەبەدی نییە ، واتە ئەزەلیش نییە ، زۆر بەڵگەی كیمیایی هەیە ، دیسان بەڵگەی زانستی تریش زۆرە دەری دەخەن سەرەتای پەیدابوونی ماددە بەهێواشی نەبووە ، یان پەیتا پەیتایی نەبووە ، بەڵكو لە هیكرا پەیدا بووە ، زانست دەتوانێ ئەو ماوەیەش دیاری بكات ماددەكانی تێدا پەیدا بووە ، بەو پێیە دنیای ماددی دروست كراوەو هەر لەو كاتەوەی دروست بووە مل بۆ چەند یاسایێكی گەردوونی كەچ دەكات و ڕێككەوت شوێنەكی نییە لە نێوانی دا[157].

## پیسبوونی ئاو و مەترسییەكانی:

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴿٦١﴾ ﴾ هود ، واتە : خودا ئێوەی لەزەوی دروست كردووە و زەوی پێ ئاوەدان كردوونەوە ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنبياء: ٣٠ ، واتە : هەموو شتێكی زیندوومان لە ئاو دروست كردووە . (كورد) وتویەتی : ئاو و ئاوەدانی ، واتە : ئاو لە هەر كوێ هەبێ ئاوەدان دەبێتەوە چونكە ئاو سەرچاوەی ژیانە .

ئەگەر سەیری قورئان بكەین سوورە لەسەر پاك ڕاگرتنی ئاو ، چونكە ئاو خۆی پاكژە ، لە فیقهی ئیسلامی دا ئاوی پاك و خاوێن ئەو ئاوەیە تام و ڕەنگ و بۆنی نەگۆڕا بێت ، ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئاوی بەفرو باران و تەزرە بە پاكژترینی ئاوی سەر زەوی دادەنێ ، كە سازگار بێ و بۆ بەكارهێنان سوودی لێ وەربگیرێت ، چونكە كاتێ بەهۆی تیشكی خۆرەوە بەهەڵم بووە بەكرداری پالاوتن و هەڵم كردنی سروشتی دا تێ پەڕیوەو خاڵی یە لە خوێیەكان و خڵتەو میكرۆب

---

[157] الله يتجلى في عصر العلم/ ل:٢٥.

﴿ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ ﴾ ، واته : له ئاسمانهوه ئاوتان بۆ دهبارێنێ ، تا بهو ئاوه پاكژتان بكاتهوه .﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴾ الفرقان ، واته : له ئاسمانهوه ئاوێكی پاكژ كهرهوهمان بۆ باراندوون.

لێرهدا قورئانی پیرۆز بهر لهزانستی پزیشكی و ژینگه زانی نوێ ئاماژه دهكات ئاوی پاكژ ئهو ئاوهیه دڵۆپاوهو پیسایی و ماددهی زیانبهخشی تێكهڵ نهبووه ، پاشان پێغهمبهری پێشهواو گهورهترین مامۆستاو پزیشكی مرۆڤایهتی (ﷺ) نۆمهتهكهی قهدهغهكردووه میزو پیسایی بكهنه ئاوهوه ، تا تووشی زیان و نهخۆشی نهبن ، هاوهڵی مهزن (جابر بن عبدالله) فهرموویهتی (نهى ان يبال في الماء الراكد والجاري) (رواه احمد والنسائي وابن ماجة) ، واته : پێغهمبهر (ﷺ) قهدهغهی كردووه میز بكرێته ئاوی وهستاو و ڕۆیشتوو (مهند و ڕهوان)هوه ، بێگومان ئاوی پیس كه به میزو پیسایی و زبڵ پیس دهكرێ ، دهبێته مۆڵگهی زۆرێ له پهتاو نهخۆشی یه كوشندهكان وهكو (د.عبدالحسين بيرم) باسی كردووه : (كۆلێرا ، تیفۆئید ، پاراتیفۆئید ، زهحیری ئهمیبی ، ههوی ڕیخۆڵه ، سك چوونی هاوینهیی ، ئیفلیجی مندال)[158] .

پاشان (د. عمر محمود) ئاماژه دهكات ئهو ئاوانهی میزو پیسایی یان تێ دهكرێ ، یان زێراب و ئاودهستیان دهكهوێته سهر ئهو خهڵكانهی لهو ئاوه بخۆنهوه تووشی (بهلهارزیا) و جۆرهها كرم دهبن ، وهكو (ئهنگستوما) و (ئهكسیورس) ، بۆ نمونه زیانی ساڵانهی دارایی (میسر) تهنیا بۆ چارهكردنی بهلهارزیا (٥٠٠) ملیۆن جنێهی میسرییه[159] .

---

[158] في صحة المجتمع / د.عبدالحسين بيرم / ل:٢٦.

[159] الطب الوقائي في الاسلام /د.عمر محمود عبدالله / ل:٣٨.

(د.منصف المرزوقی) : ئاوی پیس سەرچاوەی زۆر لە زیندەوەرە وردەکانە ، وەکو ڤایرۆس و میکرۆب و مشە خۆرەکان کەمرۆڤ تووشی نەخۆشی دەکەن ، ئەمانەش گرنگترینی ئەم نەخۆشییانەن :

١. هەوی درمۆخ : بەتایبەتی پەلەکانی خوارەوە توشی شەپلەو ئیفلیجی دەکات، لەسورِی توندی دا گەر تووشی ماسولکەکانی هەناسەدان بێ کوشندە دەبێت.
٢. هەوی جگەر (verus A) .
٣. تیفۆئید (Tyhoide) .
٤. سلمونیلات.
٥. زەحیری ئەندامی.
٦. کۆلێرا(الهیضة).
٧. مەلاریا (داء البرداء) کە مێشوولەی ئەنوفیلس دەیگوازێتەوە .
٨. بەلهارزیا : سالأنە لە ولأتانی هەژاردا (٤٠٠) ملیۆن کەس توشی دەبێت .

هەموو ئەو نەخۆشییانە بەهۆی ئاوی پیس دەگوازرێنەوە لە رێگای خواردنەوەو مەلەکردن و شوشتنی جل و بەرگ لەو ئاوە[١٦٠]

ئیمام سەججاد عەلی کوری حوسێن (سەلامی خوایان لێ بێت) لە پارانەوەکانی دا لە (الصحيفة السجادية) دا کاتێ دوعا لە دوژمنانی دەکات دەفەرمووێ : (واخرج مياء هم بالوباء واطعمتهم بادواء) (الدعاء / ٢٧) ، واتە : خوایە ئاوەکانیان تێکەڵی پەتاکان بکەو خۆراکیان تێکەڵ بە نەخۆشییەکان بکە ، لێرەدا دەبینی ئیسلام بەر لە زانستی نوێ ئاماژە بە بوونی میکرۆبەکان و ڤایرۆسەکان کردووە ، پاشان ئاماژەی کردووی ئاوی پیس نەخۆشی دەگوازێتەوە .

---

[١٦٠] الدليل في تثقيف الصحي / د: منصف المزروقي (ل:٥٧- ٦٢) بەکورتکردنەوەو دەستکارییەوە .

له کتێبی (التربية و البيئة) زۆر نمونەی هێناوەتەوە کە ئاو پیس دەکەن لەوانەش :

١. پەیینەکان : خوێیە کانزاکانن لەوانەش خوێی (نایترۆجین) و (فۆسفۆر) کە بۆ زۆربەی ڕووەکەکان پێویستن ، ئەو پەینانە کە خۆراکی ڕووەکەکانن بە زۆر ڕێگا دەگەنە ڕووبار و دەریاچەکان ، گرنگترینیان لە ڕێگای بارانەوەیە ، ئەو ماددانە سوود بە گەشەی ڕووەکی ئاوی دەدەن و چالاکییان دەکەن ، بەلام لەکاتی شیبوونەوەی ئەو ڕووەکانە بەکارهێنانی ئاوەکە خراپ دەبێ ، چونکە ئۆکسجینی تەواوە بە ئاودا دەڕوات و کاری تێ دەکات و بۆنێکی ناخۆشی لێ دێت ، خۆشبەختانە (نترات) لەناو خوێیەکاندا بۆ کەسانی گەورە زیانیان کەمە ، بەلام زیان لەمندالان دەدات ، چونکە ڕیخۆڵەی مندالان بەکتریای تێدایە نترات بۆ نتریت دەگۆڕێت.
٢. دەرمانی قەلاچۆکردنی مێرووەکان و بژار (المبيدات) : چەند کەرستەیێکی ژەهراوین بۆ قەلاچۆکردنی ئەو زیندەوەرانە بەکار دێنرێن زیان بە مرۆڤ و داهاتەکەی دەگەیێنێت ، دەتوانێ بەزۆر ڕێگا بگاتە ئاو و کاریگەری بخاتە سەر زیندەوەرانی ئاوی، ئەو دەرمانانە دەتوانن چەندان سال بمێننەوەو شی نەبنەوە !
٣. پیسبوونی ڤایرۆسی و میکرۆبی : وەکو باسکرا.
٤. پاشەڕۆو زبلی ئاژەلان : جاران ئاژەلانی کێلگەو خۆمالی لە دەشتایی دا دەژیان و سەرچاوەیەکی سەرەکی بە پیت کردنی خاك بوون ، بەلام ئیمرۆ گرنگی دان بە ئاژەل و پەلەوەرو مەڕو مالات زۆر بووە ، ئەمەش جوتیارانی هانداوە حەوشەی تایبەتی یان بۆ بکەن لە گۆشەی کێلگەکانیانەوە .

پاشەڕۆی ئاژەلان چاوگێکی سەرەکی پیس بوونی ئاو و خاکە ، وەکو پیسایی مرۆڤ ، بەلام گەر پیسایی مانگایێ لەگەل پیسایی مرۆڤێ بەراورد بکەین ، دەبینین بڕی پیسایی مانگایەك بە ئەندازەی پیسایی (١٠) مرۆڤ و (١٠) مریشك دەبێت ! لە بەریتانیادا ئەو گیاندارە مالییانەی دەولەت بەخێوییان دەکات (٣) ئەوەندەی ژمارەی کەسانی ئەو ولاتەیە.

٥. پیس بوون بە پترۆل (نەوت) : نەوت هۆکارێکی ترە بۆ پیسکردنی دەریا و زیاتریش بەهۆی کارەساتی هاتوچۆوە ڕوودەدات ، واتە : ئەو پاپۆڕانەی تانکی نەوتیان هەلگرتووە زۆر جار دەتەقن و پارچە پارچە دەبن ئەو نەوتەی هەڵیان گرتووە دەپرژێتە ناو دەریاکانەوە ، کاتێ بەرپرسیاران پاشماوەکانی بە پرژاندنی هەندێ ماددەی کیمیایی پاکژ کەرەوە دەیانەوێ پاکژی بکەنەوە ، زیان بە ڕووەك و گیاندارانی ئەو دەریایانە دەگەیەنن ، لە کەنارەکانیش باڵندەکانی وشکانی تووش دەکات و لە برسان یان بە نقوم بوون دەمرن ، چاوگێکی تری پیس بوونی دەریا بە نەوت ڕژانی نەوتی تێکەڵە بە ئاو لە پاپۆڕی نەوت هەلگر کاتێك لە بەندەرەکانەوە لەنگەر دەگرن ، ئەو پاشماوانە لە شێوەی زفتدا لەسەر کەنارەکان کۆدەبێتەوە .

٦. پاشماوەی پیشە سازی : کارگەکان بە هەموو بەشەکانیانەوە پاشماوەو پاشەڕۆی بێ شومار بەرهەم دێنن ، وەکو : پیشەسازییەکانی : خۆراك و ڕستن و چنین (تەون) و پەڕەو کیمیاو نەوت و کانزاکردن و لاستیك و فلزەکان ، ئەو پاشماوانە بە ڕێگای جیا جیا دەگەنە ئاو و ئۆکسجینی ناو ناو لەناو دەبەن ، دەبنە هۆی کوشتنی گیانداران و مرۆڤ.

## دەرمانی قەلاچۆکردنی گیا بژارەکان و ڕووەکە زیانبەخشەکان

ئەو دەرمانانەن بۆ لەناو بردنی کارەساتە جیاجیاکانی کشتوکاڵ بەکاردەبرێن، چونکە گەورەترین ئاسەوارن کار لە مرۆڤ دەکەن ، بە گشتی ئەو دەرمانانەی قەلاچۆکەرن سێ بەشن :-

١) دەرمانی لەناو بەری بژار (الادغال Herbicides) بۆ لەناو بردنی بژارو ئەو گژو گیایانەی بەکاردێنرێت لەگەڵ بەرهەمە کشتوکاڵییەکاندا دەڕوێن ، ئەو دەرمانە زیانی بۆ پیسبوونی ژینگە کەمە بۆیە زۆرتر بەکار دەبرێ ، بۆ نمونە بۆ بژاری گەنم وا چاکە قەلاچۆکەرە هۆرمۆنییە بژارەکان بەکاربێنرێ ، چونکە سەلماوە بەکارهێنانی بۆ بژارە گەلا پانەکان بە سوودەو زیانی بۆ مرۆڤ نیە و کەم

دەمێنێتەوە ، بەشێکی تری دەرمان بژار (T-٥-٤-٢) و دایۆکسینە ، ژەهراویین و هەندێ شێوانی بۆ ماوەیی دروست دەکەن و لە جەنگی ڤێتنامدا بەکارهێنراوە!

٢) دەرمانی قەلاچۆکردنی کەڕووەکان (الفطریات) : وەکو (کالومیل الزئبقیة — HACl) کە لە ڕاست مرۆڤدا زیان بەخش نییە ، هەرچی ئاوێتەی جیوەی (الزئبقیة) ئەندامییە لە شێوەی هەویردا لەگەڵ تۆوی گەنم و جۆدا بەکاردێت ، جیوە گرنگترین هۆکاری پیسکەری ژینگەیەو لەناو لەشی گیانداره کێلگەیی یەکاندا کۆدەبێتەوە ، کاتێ مرۆڤ ئەو گیاندارانە دەخوات ئەویش دەبێتە وێستگەی دوایی ئەو کەرەستە ژەهراوییانە ، زۆر جار تۆمار کراوە ، ئەوانەی ماسی ژەهراوی بەجیوەیان خواردووە ، یان نەرمۆڵەکان تووشی مردن هاتوون ، هەتا ئەو جیوەیەی پێکهاتەکانی ژەهراوی نیە وەکو (کالومیل) هەندێ لەو بەکتریایانەی لەخاکدا دەژین دوای شی کردنەوەی بۆ (مەتیل)ی ژەهراوی دەگۆڕن ، کە زیندەوەرانی جیا جیا تووش دەکات .

٣) دەرمانی قەلاچۆکەری مێروو : واتە : ئەو مێرووانەی زیان بەخشن ، وەکو پێکهاتەکانی فۆسفۆڕی ئەندامی و ئاوێتەکانی کلۆری ئەندامی ، قەلاچۆکەری فسفۆڕەکان زۆر ترسناك و ژەهراویین بۆ مرۆڤ و گیانداران و لە قەلاچۆکەری کلۆری جیانە ، زوو شی دەبنەوەو گیانداران تووشی شەپلەو ئیفلیجی دەکەن و دەیانکوژن ، چونکە ئەنزیمێکی ژەهراوی دەڕێژێ و کار بۆ جیاکردنەوەی تەزووی ئەندامی دەکات ، بەناوی (Acetylee haline Esterase) ، هەندێ لە ئاوێتەکانی فۆسفۆڕی بۆ مرۆڤ و گیانداران ژەهراوین ، بۆ نمونە (تراتیون) ڕێژەی ژەهراوی کردنی بۆ مرۆڤ زۆرە ، هەر چەندە سەلماوە زۆر نابات بۆ پێك هاتەی غەیرە ژەهراوی شی دەبێتەوە ، بۆیە (ملاتیۆن) بەکاردێ لەجیاتی (براتیون) ، چونکە ڕێژەی ژەهراوی کردنی زۆر کەمترە. قەلاچۆکەرێکی تر (کاربامیاتس) ەو زۆر نامێنێتەوە ، بۆیە بە ماددەیێکی پیسکەر ناژمێردرێت .

پێك هاتەکانی کلۆری ئەندامی لەوانە (D.D.T) هەر چەندە بۆ قڕ تێ خستن لەمێرووەکان گرنگە ، بەلاّم بەکتریا سوود بەخشەکانی ناو خاك دەکوژێ ، کە ماددە

ئەندامییەکان بۆ پێکهاتەی کیمیایی دەگۆڕن و ڕووەکەکان هەڵیان دەمژن ، ئەمەش وردە وردە لە بەپیتیی خاك کەم دەکاتەوە ، بەلاّیەکە کاتێ گەورەتر دەبێ کە ئەم مێروانە لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو دەرمانە قڕتێ خەرانە (المبیدات) بەرگری پەیدا دەکەن و دەبنە مێرووەکی بەهێزو لەناو بەر ، واتە : سەوزایی و شینایی لەکاتی پەلاماردا لەناو دەبەن .

کاتێ مرۆڤ لەو ڕووەکانە دەخوات ئەو ماددە ژەهراوییانە لە چینە چەورییەکانی لەشی دا کۆدەبنەوەو ژەهراوی دەکات ، ئەو ماددەیە زۆر لە زەوی دا دەمێنێتەوە بۆیە جارێ زۆر درا لەو ماوەیەی ڕابردودا ، وەکو لەناوبەر بەکار نەهێنرێت ، بەداخەوە بەرپرسیارانی نوێ بۆ قەلاّچۆکردنی مێروو پەنادەبەنە بەر بەکارهێنانی کەرستە کیمیاییەکان ، ئەوەی زیاتر قورێ بۆ دەگرێتەوە بەکارهێنانی فڕۆکەکانە بۆ ڕشاندنی دارستان و ڕووەك و بەروبوومە کشتوکاڵیەکان ، ئەمە نەك هەر گوڵ و گەلاّو گژو گیا هەڵدەوەرێنێ ، بەڵکو خودی بەروبوم و سەوزەکان و خاکیش پیس دەکات .

**ئەم پیسکردنە دوو جۆرە :**

١- ڕەنگە مرۆڤ ڕاستەوخۆ ئەو دانەو میوەجاتە پیسانە بەکاربێنێت .
٢- ڕەنگە ناڕاستەوخۆ مرۆڤ بەکاریان بێنێ ، وەکو خواردنی گۆشتی ئەو باڵندانەی ئەو مێرووە پیس بووانە یان بەو ماددانە خواردووە ، گەر مرۆڤ ژەمێکی کەم بخوات تا ئەو برە ژەهرە پتر بێ و جۆرەکەی سامناك بێ زووتر بەرەو مردنی دەبات .

یان لەوانەیە مرۆڤ گۆشتی ئەو ئاژەلاّنە بخوات لەو ڕووەکە پیسانە یان خواردبێت .

دوور نیە دوای ئەوەی ئەو دەرمانە ژەهرانە بەر خاك کەوتن و ڕووەکەکان هەڵیان مژتبێت ، کاتێ مرۆڤ لەو ڕووەکانە بخوات تووش دێت .

زانای بایۆلۆجی (راسیل کارمینس) دوای تاقیکردنەوە بینی ئەو دەرمانە قەلاّچۆکەرانە کاریگەری گەورەیان هەیە بۆ سەر ژینگەو مرۆڤ ، ئەمەش لەکاتێ دا

بوو بینی لەکاتی ڕاوکردندا ماسی مردار سەر ئاو کەتوون ، پاشان بینی ژمارەی باڵندە کۆچکەرەکان ساڵ بە ساڵ کەم دەبنەوە ، چونکە ئەو ناوچە بە دەرمان بژار دەرشێنرێت بۆ نەهێشتنی گژو گیاکان ، قەلاچۆکەری کلۆری تا ۳۰ ساڵ کاریگەری ژەهراوی یەکەی لە خاکوئاو دا دەمێنێتەوەو توانای هەیە لە چەوریدا بتوێتەوەو وردە وردە بڕواتە لەشی مرۆڤ و گیانداران و ڕووەکەوەو پەیتییەکەی لە زیندەوەردا زیاتر بکات[161] .

گە ر تەماشای قورئان و فەرمووده بکەین چەندان ڕاستی لەم بارەیەوە کە باسکرا دەبینین و وەکو موعجیزەیێکی تەندروستی و ژینگەیی بەهای خۆیان دەنوێنن و هزری زانایان دەخاتە ورمانەوە :

(۱)ئاماژە بەبونی کارەساتی ژینگەیی و کشتوکاڵی دەکات (فأرسلنا عليهم الطوفان والجراد والقمل والضفادع والدم ....) واتە : ناردمانە سەر گەلی فیرعەون لافاو و کوللەو ئەسپێ و بۆق و خوێن ، ئاشکرایە بە لافاو و کوللەو ئەسپێ و تەپۆو مێشولەی زۆر هەبو ئەوانە بەلاو کارەساتی ژینگەیی و تەندروستی و کشتوکاڵین.

بێگومان (الجراد) ناوی ڕەگەزی (اسم الجنس) کۆمەڵێ بە مێرووە بەناوی پلەی باڵ ڕاستەکان (orth opera) وەکو : (کوللەو جۆبرکە –الحفار- و سیسرکە (الصرصار) و هتد) دەناسرێت ، ئەم سوپایە توانای ڕۆیشتنیان زۆرەو دەگاتە (۱۰۰) کم لە ڕۆژێکدا و ڕوو لە هەر ناوچەیێکی کشتوکاڵی بکەن وەکو سن و کیسەڵۆکە وێرانی دەکەن.

بۆق بەکەمی سود بەخشەو مێرووی زیان بەخش دەخۆن ، بەلاَم زۆربوونیان ژینگە پیس دەکات و دەنگی یان بێزارکەرەو هەندێ ڤایرۆس هەڵدەگرن جگەرو گورچیلەی ئەو مرۆڤانە توش دەکەن گۆشتی بۆق دەخۆن ، وەکو لەفەرەنسادا ، بۆ زانستی پتر بڕوانە (الحيوان في القران الكريم/ د.زغلول النجار) .

---

[161] التربية و البيئة / ل:٥٩- ٧٤ بەکورت کردنەوەو دەستکارییەوە .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ)قەدەغەی کردووە ئەو ئاژەڵانەی پیسایی و گەندە دەخۆن گۆشتیان بخورێ ، یان سواریان ببین ، لە (غريب الحديث)ی (الخطابي) دا هاتووە ، پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوێ دەفەرمووێ : (لا تصحبني على الجلال) ، واتە : لەسەر ولاخی پیسایی خۆر هاوڕێتی مـن مەکە ، (نهى عن الجلالة ان يركب عليها او يشرب من البانها) رواه الحاكم وصححه وابو داود. واتە : پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە سواری ولاخی پیسایی خۆر ببی و شیرەکەی بخورێت ، (نهى عن اكل الجلالة) رواه ابو داود، واتە : قەدەغەی کردووە گۆشتی پیسایی و گەندە خۆر بخورێت.

ئاشکرایە ئەو ئاژەڵانەی پیسایی دەخۆن زیان بە گۆشت و شیریان دەگات بۆیە خواردنی گۆشت و شیریان زیان لە مرۆڤ دەدات ، فرە کرم و میکرۆب و مشەخۆریان هەلگرتووە ، لەگیاندارانەوە بەهۆی خواردنی بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە"[١٦٢].

## پیس بوونی خاک و مەترسییەکانی:

﴿ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ﴾

، واتە : ولاتی پاك ڕووەکەکانی بە ویستی پەروەردگاری دەڕوێنێ ، ئەو ولاتەی پیسە تەنیا کەمێك نەبێ ڕووەك نا ڕوێنێت.

شاری خاوێن ئەو ولاتەیە (خاك و ئاو و هەوا)ی خاوێنە ، شاری پیس ئەو ولاتەیە (خاك و ئاو و هەوا)ی پیسە . بێگومان وەکو باسکرا خاك جیهانێکی پڕ لەسەیرو

---

[١٦٢] لە (الموسوعة الذهبية/ د.احمد مصطفى متولي/ ل:١٠١٨ دا هاتووە سەلماوە : پیسایی و زبڵ و ڕیخی مانگاو قشپل و تەرس و هتد ، ژینگەیێکی لەبارە بۆ گەشەی کرم و مشەخۆر و میکرۆبە زیانبەخشەکان ، لە (اگم) دا زیاتر لە (١٠٠) بلیۆن میکرۆب هەیە ، پاشان پیساییەکان ژەهرێکی زۆریان تێدایە کاتێ باڵندە و گیانداران دەیخۆن و تێکەڵ بە خوێن و گۆشت و شانەکانیان دەبێ ، گەر مرۆڤ لە گۆشت و شیر یان بخوات تووشی نەخۆشی دەبێت .

سەمەرەیە ، سەرچاوەی خۆراکی ئەو ڕووەکانەیە لەناوی دا سەرھەڵدەدەن و گەشە دەکەن و لە خاکدا قایم و توندو تۆڵیان دەکات ، ساڵانە خوداوەند (١٠) ھەزار ملیۆن تەن نایترۆجین بەھۆی بەکتریای نایترۆجینەوە بەخاك دەدات تاببێ بە پەیین بۆ زەوی ، سەرباری ئەوەش لە ڕێگای بارانەوە دوای بەتاڵ کردنەوەی کارەبایی ھەورو پەیدابوونی بروسکە ئۆکسیدەکانی نایترۆجین پەیدا دەکات و لەگەڵ بەفروباراندا بۆ ناو خاك دەبارێتە زەوی لە شێوەی نتراتداو ساڵانە یەك دۆنم زەوی پێنج ڕیتڵی دا دەبەزێتە سەر ﴿ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ ، (اجاج) نتریتە لەباراندا.

## چۆن پارێزگاری لە بە پیتیی خاك دەکەین؟

جووتیاران ھەر لە دێر زەمانەوە زانیویانە چۆن پارێزگاری لە بەپیتی خاك دەکەن ، تا داھاتێکی باش بەدەست بێنن ، ئەوان پێویستە ھەمان بەرھەم ساڵ بە ساڵ نەچێنن ، بەڵکو بیگۆڕن ، دەبێ کاتێ گەنم و جۆیان چاند زەوی بۆ لەوەڕی ئاژەڵان لێ بگەڕێن ، پاشان ئەو داھاتانە بڕوێنن ڕەگیان ھەیە (Root Grops) وەکو گێزەرو کەڵەم و چەوەندەر.

چاندنی ئەو داھاتە کشتوکاڵیانە بۆ بە پتیی خاك گرنگن ، چونکە ئەو بەکتریایانە لەدەوری ڕەگەکانیاندا ئیدارە دەکەن و دەحاوێننەوەو لەگەڵ نایترۆجیندا یەك دەگرن و ترشی ئەمینی وەکو (DNA-RNA) پێك دێنن.

## چۆن دەتوانرێ بێ پیتی خاك قەرەبووبکرێتەوە؟

ئەو جوتیارانەی وەرچەرخان ناکەن لە داھاتی کشتوکاڵی دا پێویستە بێ پیتی خاکەکەیان بە پیتی کیمیایی قەرەبوو بکەنەوە ، لەگەڵ زۆر بەکارھێنانی ئەو پەینەدا داھاتێکی زۆر بەدەست دێنن ، بەڵام لە ڕەگەزێکی باش نابێت ، لێرەدا جۆرە قەوزەیێ (الطحالب) ھەیە (Algae) سەوزە (خۆرییە جندە) لەئاودا دەڕوێ و

گەشە دەكات ، یان لەخاكی شێ دارو تەڕدا ، ئەو كەڕووە كە هەمان پیشەی بەكتریاكان ئەنجام دەدات، ئەم ڕاستی یە لای جوتیارانی برنج (مەرمزە) لە خۆرهەلاتی خوارو زانراوە ئەو جۆرە قەوزەیە دەدەنە كێلگە برنجی یەكانیان ، تا ئەو خاكە لەناو نەچێ ، كە هەمیشە یەك بەرهەمی تێدا دەچێنرێت.

لەكاتی زۆر بەكارهێنانی پەیینی كیمیایی نایترۆجینی دا بۆ خاكی كشتوكاڵی زۆری لەو پەیینە دەڕواتە ناو جۆگەلەكانی بەكارهێنانەوەو ئەو قەوزەیە زیاتر گەشە دەكات و (Algae blooms) بەرهەم دێت ، بەلام بانگێشەرانی پێشكەوتنی زانستی لە بەكارهێنانی قەلاچۆكەرە مێرووەكان زیادە ڕەوییان كرد، بەو پاساوەی ئەوان ڕووەكەكان لەكارەسات و بەلاكان چەپاڵە دەدەن و خاكەكە بەپیت تر دەكەن و بەرهەمەكە زیاتر دەكەن . قورئان دەربارەی ئەمانە فەرموویەتی : ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ ، واتە : ئەگەر پێیان بگوترێ لەزەوی دا خراپەكاری مەكەن وتیان : ئێمە چاكسازی خوازین ، بێگومان ئەوان خراپكارن ، بەلام هەست پێ ناكەن .

قورئانی پیرۆز لە بەتاڵكردنەوەی بانگێشەیان ڕاستی پێكاوە ، واقیعیش ئەوەی سەلماندووە لە بەریتانیادا بەهۆی زیادە ڕەوی كردن لە پەیینی كیمیایی دا بەرهەمی كشتوكاڵی كەم دەبێتەوە !

## ئاسەوارە خراپەكانی پەیینی كیمیایی چییە ؟

سەلماوە پەیینی كیمیایی بە چینەكی لووسی بێ كەللە بەر خاك دادەپۆشێ و دەیگۆڕێ بەخاكێكی ڕووت و بوار نادات بە ڕووەك گەشە بكات و بژێت ،

سەلماوە ئەو كەرستە كيمياوييەی خاك پيس دەكات پێكهاتەی ميكانيكی يەكەی وردو خاش دەكات ئاسانی دەكات بەهۆی باوە توشی ڕووت بوونەوەو ڕامالين ببێت و كشتوكاڵ و ڕووەكی لەسەر نەمێنێت"[163].

پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە بە پيسبوونی خاك دەكات ، كە فەڕو پيت و بەرەكەت ناهێڵێ : (وتمطروا ولا تنبت الارض شيئا) رواه مسلم ، واتە : بارانيان بۆ دەبارێ و خاك هيچ ناڕوێنێت.

ديسان خاك بە فڕێ دانی ماددەی كيمياوی و كانزايی پيس دەبێ لە ڕێگای ئاودان و باران و ڕەشەباوە دەگوازرێنەوە ، پاشماوەی گازەكان و كارگە و تيشكەكان خاك پيس دەكەن ، ئەو شوشەو كاغەزو نايلۆن و پلاستيك و تەختەو پەڕۆو قوماش و قتووانەی مرۆڤ فڕێ ی دەداتە سەر خاك وەكو لە كوردستانی خۆماندا باوە ، كاريگەری گەورە دەكە سەر پيس بوونی خاك ، دوای ئەوەی ئەو ماددانە لەخاكدا شی دەبنەوە ڕووەكە شانەكان هەڵی دەمژن ، دوايی گيانداران لێی دەخۆن و گۆشت و شيريان پيس دەبێت ، يان مرۆڤ لەو ڕووەك و گۆشت و شيرە دەخوات و تووشی زيانی دەكات ، دوور نيە هەندێك لەو ماددانە بۆ بەكتريا و گڵ خۆركەكان (كرمی زەوی) بەزيان بن ، ئەمەش كار دەكاتە سەر پيتی خاكەكە و كەم كردنەوەی ڕاددەی ($O_2$ – $N_2$) لە ناويدا ، گرنگترين كانزا قوڕسەكان بۆ پيس كردنی خاك و ئاو و جيوەو زەرنيخ و كاديۆم و فورفوشم و سيلينيۆمە ، كە كارگەكان و سووتاندنی خەڵووزو ترومبێل دروستی دەكەن .

يەكێ لەو كارەساتە ناودارانەی بەهۆی پيس بوونی ڕوويدا بەهۆی جيوەوە ئەوەيان بوو لە ساڵی (١٩٥٦) دا لەكەنداوی (ميتانا) لە ياباندا ڕوويدا ، كارگەی (ئەسيال دايهد) كە دوانە (ميستيل) ی (جيوەيی) لەبەرهەمەكانی دا بەكاردەهێنا خەڵكێكی زۆری

---

[163] الموسوعة العلمية / د. هاني بن مرعي القيسي / ل:٣٩٥ – ٣٩٦.

خۆر ئاوای ئەو کەنداوەی کوشت ، یان ساڵی (١٩٧٥) دا عێراق برێ گەنم و جۆ لە مەکسیك دەهێنێ ، پاشان زانرا ئاوێتەی (میتیل جیوە)ی بووە ، بۆیە بووە هۆی ژەهراوی کردنی (٦٥٣٠) کەس و نزیکەی (٥٠٠) کەس گیانیان لە دەستدا ، کادمیۆ کە خاك و ئاو پیس دەکات بە زۆری بۆ برنج و گەنم بەکاردێ ، لەدوای جەنگی جیهانیی دووەم خەڵکی یابان بەم ماددەیە ژەهراوی دەبێ بە (ئەی) ناوی دەبەن و نەخۆشی (روماتیزم) پەیدا دەکات و کار لە برِی کالسیۆمی لەش دەکات و مرۆڤ تووشی ئێسکە نەرمەو نەخۆشی گورچیلەکان و سی یەکان و دڵ و ئێسقان دەکات .

قورقوشم (الرصاص) گرنگترین سەرچاوەیە بۆ پیس کردنی خاك و ئاو بەهۆی ئەو کارگانەی پاتری بەرهەم دێنێت ، پیس بوونی خاك و ئاو و بەرهەمی کشتوکاڵی بەو قورقوشمە مرۆڤ تووشی کۆئەندامی دەماری و هەرسی و گورچیلە دەکات و تووشی ژەهراوی بوونی و فێداری و بوورانەوەی دەکات ، زەرنیخ ئەو خاك و ئاوە پیس دەکات لە نزیك کارگەکانی تواندنەوەی کانزاکانی وەکو مس و قورقوشم و زینگن ، سووتاندنی خەڵوزو بەکارهێنانی دەرمانەکانی قالاچۆکردن ، کە لە قورقوشم پێك دێن گەورەترین هۆکارن بۆ پیسکردنی خاك و ئاو و ئەو ماددەیە ئازارو لاوازی ماسولکەیی و نەخۆشی پێست و نەخۆشییەکانی هەرس و گورچیلە و جگەرو دەماریی تووشی مرۆڤ دەکات ، بۆ زانستی پتر بڕوانە (التربیة و البیئة / ل: ٨٤-٨٨)

جار هەیە بروسکە دارستانەکان دەسووتێنێ ژینگە پیسدەکات ﴿ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا ﴿٦٦﴾ ﴾ ، جار هەیە بومەلەرزەو بورکان دارستانەکان لەناو دەبەن و خاك پیس دەکەن .

**پیس بوونی خۆراکی:**

﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ﴾ واتە : سەیری خواردنەکەت بکە نەگۆڕاوەو تێك نەچووە . ئێستا بۆ پاراستنی خۆراك لە بۆگەن بوون بە قتوکردن و دانانی لەناو بەفرگرەو یەخچاڵدا بەکاردێنرێت ، بۆ پاکژ

کردنەوەی ئاوی خواردنەوە لەشارەکاندا کلۆر (chloirnatet) لە پالأوگە بەکاردێ و دەخرێتە ناو تانکی ئاوەوە یان حەوزەکانەوە بەرێژەیێکی دیاری کراو ، بەلأم ناتوانرێ بخرێتە ناو ڕووبارەکانەوە ، چونکە جۆرەها زیندەوەر لەناویاندا دەگوزێت ، بێگومان خودا ئاو و خاك و هەوای بە پاکژی پێداوین ، بەلأم ئێمە پیسی یان دەکەین ! : ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا (٤٨) لِّنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا (٤٩) ﴾ ، واتە : لەئاسمانەوە ئاوی پاکژ کەرەوەمان باراندووە ، تا شارێکی مردووی پێ زیندوو بکەینەوەو ئاژەڵ و مەڕو مالأتی پێ ئاو بدەین ، خەڵکێکی زۆریش دوای ئەوەی مرۆڤ ئاو و هەواو خاك و خۆراك و هەموو شتێکی پیس ئەوانەی کردنە سەرچاوەی نەخۆشی و لەناوبردن. ﴿ وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ (١٥) ﴾ ، واتە : لە ئاوێکی گەرمیان خواردەوەو ڕیخۆڵەکانی پچڕاندن .

ئاشکرایە کلۆری زۆر هەوی جومگە (ورم المفاصل – Fluorosis) دروست دەکات ، ڕاستە ماددەی (فلورید) ددان کلۆربۆن کەم دەکاتەوە ، کەچی لە ڕاست کێشەکانی زۆر تێبینی هەیە .

ئیسلام سوورە لەسەر پاراستنی خواردن و خواردنەوە ، دوور لە پیس بوون ، هۆی گواستنەوەی نەخۆشییەکان زۆرن ، لەوانەش پیسبوونی خواردن و خواردنەوە ، ژەهراوی بوون ، کە بە زۆری سك چوون و ڕشانەوەو لەدەست دانی شلەکانی بەدواوەیە ، هەندێك جار مردن . سەیر بکە پێغەمبەر ﷺ ئاماژە دەکات خواردن و خواردنەوە دەبێ داپۆشرێ و سەری کوندە و قاپ و مەنجەڵ قەپات بکرێ و نابێ بەشەو سەری بە بەتاڵی بهێڵرێتەوە ! (غطوا الاناء واوكئوا السقاء ، فان في السنة ليلة ينزل فيها وباء لايمر باناء ليس علية غطاء وسقاء ليس عليه وكاء الاوقع فيه) رواه مسلم. واتە : قاپ داپۆشن و سەری کوندە سەری قەپات بکەن ، لەساڵێ دا شەوێك هەیە پەتای تێدا دێتە خوار ، بەهەر قاپێ دا ڕەت ببێ پەردەی لەسەر نەبێ ،

هەر كوندەیێ قـەپات نـەبێ و دەم بەسـت نـەكرابێ دەكەوێتـە ناوییـەوە ، بـەو پێیـە پەتای وەرزی هەیە ، شێداری و گەرمی و ئاو و هەوا یارمەتیـدەردەبێ بـۆ زۆربـوونی میكرۆب و چالاكییان.

سـەوزەی پـیس كـە بـە ئـاوی پـیس تێـراو كـراوە زۆر نەخۆشـی دەگوازێتـەوە وەكـو (تیفۆئید) و كۆلێراو زەحیری و هەوی بە سەلمونیلات ، بۆیە پێویسـتە ئـەو سـەوزانە بە ئاو و تایت و خـوێ بشۆردرێنەوە ، سالآنە هـەزاران منـداڵ لـە فەرەنسادا بـەر لـە (١٩٢٤)دا بەهۆی نەخۆشییەكانی هەرس دەمردن ، وەكو چۆن ئێسـتا ئـەو ڕێژەیـە لـە ولآتە هەژارەكاندا دەمـرن ، دوای ئـەم ساڵە كـرداری پاكـژ كردنـی (التعقـیم) ی شـیر سەری هەڵدا ، هەرچەنـدە شیر خاسیەتی بایۆلۆجی و خۆراكی گرنگی هەیەو پـڕە لـە پرۆتین و نیشاستەو چـەوری و ڤیتامینـات و خـوێ ی كـانزایی ، كەچـی بـەهۆی زوو پیس بوون و هەڵگەڕان مەترسی زۆری بەدواوەیە! پێویستە شیری دروست خـاڵی بـێ لە ڤـایرۆس و مشـەخۆرو میكـرۆب و مـاددەی كیمیـایی ناسروشـتی ، شـیر دوای (٣-٤) كاتژمێر دەبێتە مۆڵگەی میكرۆب و زۆرێ لە نـە خۆشـییەكانی هـەناو و ژانـە سـك و ڕشانەوەو سـك چـوون پەیـدا دەكـات ، دەتـوانێ تیفۆئیـدو كـولێراو نەخۆشـی تـریش بگوازێتەوە ، باشترین چارەسەر شیری پاكژ كراوە ، چونكە كولآنـدنی شـیر بـا بـۆ (٥) خولەكیش بێ ئەو گەرمی یە ناتوانێ میكرۆبی وەك سیل بكوژێت.

قورئـان فەرموویـەتی : ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ ﴾ ، لێـرەدا قورئـان گۆشـتی مـردارو خـوێن و گۆشـتی بـەرازی حـەرام كـردووە ، بێگومـان ئـەو ئاژەڵانـەی بـاش سـەر نـەبڕاون یـان بـاش خوێنیـان لێ نەڕۆیشـتبێ گۆشتەكەیان سوور هەڵدەگەڕێ و بۆنی ناخۆشەو بەكەڵكی هەڵگرتن نایـەن ، چونكە زوو تێك دەچن ، یان گەر گۆشت دوای سەر بڕین درایە بـەر هـەوا بـێ گـوێ پێـدان ، ئەو كاتە دەبێتە مۆڵگەی میكرۆ بۆیە دانانی لەناو بەفرگرەدا ساردییەكە بـەرایی لـە زۆر بوونی میكرۆبەكان دەگرێت ، بەلآم بە تەواوی قەدەغەیان ناكات ، بۆیە پێویستە (یۆد)ی پێدا بكرێت تا بەر لە بەكارهێنان پاكژ بێتەوە .

ئەوانەی شتی پیس و مردار دەخۆن ، یان گۆشتی گەنیو تووشی ژەهراوی بوون دەبن ، ڕشانەوە سك چوون و ژانە سكی لەگەڵدایە ، مەترسی یەكەی دەكەوێتە سەر جۆری میكرۆبەكەی ، مرۆڤ تووشی میكرۆبی هێشوویی (العنقودي) و (سالمۆنیلات) و كرمەكانی وەكو (ساجیناتا) دەكات ، لەڕیخۆڵەدا گەورە دەبێ و دەگاتە پێنج مەتر ، گۆشتی بەراز كرمێكی دیاری كراو هەڵدەگرێ (تیناسولیۆم) و گەراكانی ، مرۆڤ تووشی نەخۆشی ترسناك دەكەن ، چاو و دڵ و مۆخ لەناو دەبەن ، ئەو گیاندارانەی نەخۆش بوون لە چوار پێ یەكان و مەڕو مالأت نەخۆشی سیل و نەخۆشی تریان تووش هاتووە ، مرۆڤیش تووشی نەخۆشی دەكەن ، بڕوانە (الدلیل في التثقیف الصحي/ د.منصف المزروقي/٩١) و (خۆ پاراستن و تەندروستی گشتی / كۆمەڵی پسپۆڕو پزیشك / كۆمەڵەی A.S.k/ ل:٢٥) ، هەر لەبەر ئەمەشە قوربانی ئەو چوار ئاژەڵانە دروست نیە ، كەواتە خواردنیشیان یان فرۆشتنیان دروست نییە ، چونكە بۆ تەندروستی باش نین ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (اربع لا تجزئ في الاضاحي : العوراء البین عورها ، والمریضة البین مرضها ، والعرجاء البین ظلعها ، والعجفاء لتي لا تنقی) رواه الترمذي. واتە : چوار ئاژەڵ بە كەڵكی قوربانی نایەن ، كوێرە ئاژەڵ ، ئاژەڵی نەخۆش كە پێوەی دیارە ، شەل ، ئەو ئاژەڵەی لەبەر لاوازی مۆخی نەماوەو گێژە.

**پیسبوون بەژاوە ژاو ( الضوضاء:**

﴿ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾ ، واتە : دەنگت نزم بكەوە ، ناخۆشترین و بێزارترین دەنگ دەنگی كەرە .

(د.زغلول) دەڵێ ئەمە ڕاستییەكی زانستی یە لە (١٠)ساڵەكانی كۆتایی سەدەی بیستەمدا پەی پێ برا ، ئەمەش دوای زنجیرە تاقی كردنەوەیێ لەسەر دەنگی ئاژەلأن و بینرا دەنگی كەر لە سەرووی (١٠٠) دیسیبلەوەیەو لەرەلەری دەگاتە (٣٥٠) هیرتز ! ئەمەش بەرزترین دەنگی گیاندارانی وشكانییە ، چونكە دەنگی (نەهەنگی شین) دوو

هەندەی دەنگی گوێدرێژە و دەگاتە (١٨٨) دیسیبل ، بەڵام لەرەلەری کەمترە زۆربەی ئەو دەنگەش ناو دەیمژێ ، گەر نەهەنگەکە سەری لەناو دەرنەهێنێ مرۆڤ ناتوانێ بیبیستێت ، هەر چەندە نەهەنگەکان لە دووری دەیان میلدا دەنگی یەکتریان لەناو ئاودا گوێ لێیە [١٦٤].

## ڕاڤەی زانستی:

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات دەنگ پێویستە لە ژیانی مرۆڤدا بۆ پەیوەندی و گفتوگۆکردن و لێك حاڵی بوون ، وشە زادەی مێشکی مرۆڤە ، بە دەنگە خۆشەکان وەکو مۆسیقای هێمن و دەنگی مەل و باڵندەو بولبول و قاسپەی کەو و هاژەی ڕوبار ، خشەی گەڵای درەختەکان ، بەڵام دەنگی ناخۆش و ناڕێك و بەرز وەکو دەنگی کەرو دەنگی بەرزی مرۆڤ و مۆسیقاو گۆرانی بەرزو بڵند بێزاری دەکات .

دیسان دەنگ ئامێرێکە بۆ وشیار کردنەوەی مرۆڤ وەکو زەنگی ماڵ و زەنگی مۆبایل و تەلەفۆن و فیتەی وریاکردنەوە ، دەنگە خۆشەکان وەکو دەنگی قورئان و ئاوازی هێمن و مۆسیقاو دەنگی بانگ ... هەتوانی هزرو دەروونی مرۆڤن ، قورئان فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ ، واتە : گەر قورئان خوێنرا گوێ ی بۆ بگرن و بێ دەنگ بن بەڵکو خوا ڕەحمتان پێ بکات .

بێگومان تەندروستی دەروونی لەم چاخەدا بەشێکە لە زانستی پزیشکی تازەو ئەوەی زیاتر هاندەر بووە لەم چاخە زۆر گرنگی پێ بدرێ ، دوو خاڵە :

یەکەم / لە (٨٠٪)ی نەخۆشییەکان بۆ نەخۆشی دەروونی دەگەڕێتەوە .

---

[١٦٤] الحيوان في القرآن الكريم / د.زغلول النجار/ ل:٤٨٥- ٤٨٦.

دووەم/ لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژیدا زۆر نەخۆشی دەروونی سەری هەڵداوەو زیادی کردووە لە نائومێدی و خەمۆکی و دڵتەنگی و خەم و دڵە ڕاوکێ و خەو زڕان و بیر بلاوی و تێك چوونی میزاژو تورەیی ...هتد ، وەکو لە کتێبی (في صحة المجتمع/ د. عبدالحسین بیرم) و (دع القلق وابدأ الحیاة/ دیل کارنجی)دا باسکراوە .

(بول ئیرنست) ئەدولف) دەڵێ : (ئەو ئاکامەی من پێی گەیشتووم بە تەواوی لەگەڵ تیۆرەکانی پزیشکی نوێ دا دەربارەی گرنگی سایکۆلۆژی لەچارەکردنی نوێ دا یەکە ، سەرژمێرە وردەکان ئەوە دەردەخەن (٨٠٪)ی ئەو نەخۆشییە جۆراو جۆرانەی تەواوی شارە گەورەکانی ئەمریکایان گرتۆتەوە تا ڕاددەیێکی گەورە هۆکاری نەخۆشیەکانیان دەروونی یە ، نیوەی ئەوانە هیچ نەخۆشییەکی ئەندامییان نیە . دەڵێ : لەشی مرۆڤ کاتێ ڕێك دەبێ گەر لە دروستکەریدا ڕێك بێ ، بەبێ ئەوە تووشی تێك چوون و نەخۆشی دەبین)[١٦٥] .

بێگومان ئیسلام و قورئان شیفای دڵ و دەروون و جەستەو کۆمەڵگایە ، ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾ طه ١٢٤ ، واتە : کێ پشت لەیادی من بکات ئەوە ژیانێکی پڕ لە ئەشکەنجەی هەیە . ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾ الاسراء ٨٢ ، واتە : ئەو ئایەتانە دا دەبەزێنین کە شیفاو چارەسەری بڕواداران.

بێگومان قورئان وشەی خودایە ، هەموویان ڕووناکین ، پاکترین ڕووناکین ، هەموویان لەسەر خۆشترین و ڕێك ترین نۆتەی مۆسیقا (سول لاسی دوری می فا) ڕێك خراون و لەگەڵ ئیقاعەکەی مێشکدا ڕێك دەکەون ، چونکە یەك دروستکەر داناون و ڕێکیان

---

[١٦٥] الله یتجلی في عصر العلم/ ل:١٣٧- ١٣٨.

دەخات و شیفاو چارە بەلەش دەدات ، ئەو مۆسیقا قورئانیانە پڕ لە مانای قوڵن، موسیقایەکی دەروونی و ڕواڵەتین ، هێمنی و ئارامی بە دڵ دەدەن و گەورەترین ئیجاو تێفرۆسماندنن بۆ لابردنی نەخۆشی یە دەروونی یەکان لە هەست و نەستداو پاکژ کردنەوەیان ، کتێبی (الشفاء بالقرآن الكريم / د.محمد الهادی) لەم بارەوە بخوێنەوە زۆر بە سوودە .

لەوێ دا هاتووە قورئان خاوەن وزەیە ، بەرزترین ڕامان (التأمل) بەمرۆڤ دەدات ، زانست ئەوەی سەلماندووە ڕامان (التأمل) و بیر کردنەوە نەخۆشییەکان چارە دەکات و زاکیرەو یاد بەهێز دەکات و خۆڕاگری و ئارامی پتری پێ دەدات ، وە توێژینەوەکان لە ئەمریکا سەلماندوویەتی : ڕامان و بیرکردنەوەی قوڵ و ڕێك و درێژ فشاری خوێن چاك دەکات ، دڵ لە ماندووبوون ڕزگار دەکات ، کە سەر دەکێشێ بۆ دڵە کوژێ (الذ بحة) ، ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ الرعد ٢٨

زانایان سەلماندوویانە مێشك لەرە لەرو نیقاعی کەهرۆموگناتیسی هەیەو بەپێی چالاکی یەکانی مرۆڤ دەگۆڕێن ، لەکاتی چالاکی و کارو بیر کردنەوەو ڕامان (التفكر – التأمل) دا شەپۆلی (بێتا) ڕەوانە دەکات لەرەلەریان (١٥-٤٥) هرتز دەبێ لە چرکەیەکدا ، لەباری خۆ خاو کردنەوە (الاسترخاء) و ڕامانی ئاسایی دا مێشك شەپۆلی (ئەلفا) دەهاوێ بە لەرەلەری (٩-١٤) هرتز لە چرکەیەکدا ، لەکاتی خەوی قوڵدا مێشك شەپۆلی (بیتا) دەهاوێ (٥-٨) لەرەلەر ، لەو حاڵەتەدا خەون دەبینێت ، لە خەوی قووڵی بێ خەوندا مێشك شەپۆلی (دەلتا) کەمتر لە (٤) لەرەلەر دەهاوێژێت ، بەو پێیە تا مێشك ئارام بێ و دوور بێ لە گڕەو بێزاری شەپۆلەکانی لەرەلەریان کەمترەو ئەویش ئارام ترە ، بۆ هەڵچوون و مێشك ماندوو دەکات و تەمەن کورت دەکات ، کەچی ڕامان مێشك ئارام دەکات و تەمەن درێژ دەکات وە بە پێی لێکۆڵینەوەکانی (توێژینەوەرانی William cromie) لە کۆلێژی (هارفارد) ی پزیشکی تازە بینییان ڕامان کاریگەری هەیە بۆ سەر زیادبوونی قەبارەی مێشك .

دیسان دوای ئەوەی کیمیای پزیشکی لە ئاست چارەکردنی هەندێ نەخۆشی دژوار دەستە وەستان داما ، پەنای بردە بەر ڕامان ، چونکە ڕامان و گوێبیر ئازارە درێژخایەنەکان لادەبات و کۆئەندامی بەرگری بەهێز دەکات ، ڕامان و یادو نوێژ زۆر نەخۆشی سەخت وەکو شێر پەنجە چارەسەر دەکات ، لەم کتێبەدا واتە (الشفاء بالقران الكريم / ج٢ / ل:١٥١) دا زۆر بەسەرهاتی واقیعی گێڕاوەتەوە ، لە ڕاست ئەوانەی تووشی نەخۆشی دژوار هاتون وەکو شێر پەنجەو ماسولکە ڕەقەو وەسوەسەو سستی گورچیلە ، هەموو ئەوانە بەگوێ گرتن لە کاسێتی قورئان چاك دەبنەوە ، بۆ نمونە : لە ئیتالیا لەیەکێ لە نەخۆشخانەکاندا (٧) پزیشکی پسپۆڕ هەڵدەستن کۆمەڵێ نەخۆشی ئیتالی دەهێنن کاسێتی دەنگی دەنگ خۆشی بەڕەگەز کورد (عبدالباسط عبدالصمد) یان بۆ هەڵدەکەن ، دوای ماوەیێ دەبینن ڕێژەی چاك بوونەوەیان (٩٥٪)ە دوای ئەوەی دەبینن بەدەنگی مۆسیقا چاك نابنەوە . لە ئەڵمانیاو ئەمریکاش هەمان تاقیکردنەوە ئەنجام دەدرێ و بە سەرکەوتوویی بەڕێژەی (٩٧٪) سەرکەوتن بەدەست دێنن ...[١٦٦] .

بەڵام دەنگە ناخۆشەکان و تیژەکان تێکەڵەکان و بەژاوە ژاو و گرە گرەکان وەکو دەنگی (کەر) و هۆڕنی ترومبێل و زوڕناو دەهۆڵ و مۆسیقای تیژو خۆرئاوایی بە پێچەوانەوە ئیاقاعەکانی مێشك تێك دەدەن و زاکیرە لاواز دەکەن و پەستی و خەمۆکی پەیدا دەکەن ، بە تایبەتی کار دەکەنە سەر کۆ ئەندامی چەقە دەمار (الجهاز العصبي المركزي) و کۆئەندامی بیستن (گرەگر – الضوضاء) کۆمەڵە دەنگێکی ناخۆشن و بەرزو نارێکەو کار لە هێزی بیستن و مێشك دەکات ، مرۆڤ ئەو دەنگانە دەبیستێ لەنێوان (٢٠-٢٠٠٠٠) هرتز دایە .

---

[١٦٦] الشفاء بالقران الكريم / د.محمد الهادي / ج٢/ ل:٩٢/ ١٥٩ سەیر بکە.

(د.عادل مشعان) ئاماژه بەکرداری دەنگە ناخۆشەکان دەکات وەکو هۆڕن و دەنگی ترومبێل و گرەی فرۆك و غلبە غلب و دەنگە دەنگی خەڵك و گرەی مەکینە و کارگە و دەنگی مۆسیقای تیژو کاسێتە حەرامەکان ، پێچەوانەی مۆسیقاو سروودی حەڵاڵ ، کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕاستیان فەرموویەتی : (ماكان معهم اللهو ، فان الانصار يحبون اللهو) رواه البخاري. واتە : ئایا ئامێری ژەنین و سروودیان پێیە ، ئەنسارەکان حەز بە ئامێری مۆسیقا و گۆرانی دەکەن ، بێگومان (دەف) خۆشترین ئامێری مۆسیقایە ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر کەیفی پێ هاتووە ، بەتایبەتی لە ئاهەنگەکان و بۆنەکاندا (واضربوا عليه الدفوف) (رواه احمد).

قورئان فەرمانی کردووە قورئان بەدەنگی خۆش و ئاوازەوە بخوێندرێ ﴿ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ ، پێغەمبەر (ﷺ) بە (ابو موسى الاشعري) کە دەنگی خۆش بووە فەرموویەتی (لقد اوتيت مزمارا من مزامير داود) رواه البخاري ، واتە : شمشاڵێ لە شمشاڵەکانی داود بەتۆ دراوە (زينوا القران باصواتكم) ، واتە : قورئان بە دەنگەکانتان خۆش بکەن .

**کاریگەرییە خراپەکانی ژاوە ژاو و گرە گر بۆ سەر دەروون :**

وەکو : زۆر ماندوو بوون و بێ توانای دەماریی و تەنگ بوون و زوو تورە بوون و زۆری سکاڵا و کارتێ کردنی دەماری فسیۆلۆجی و کار دەکاتە سەر بەرهەم و ڕێژەی هەڵەو تاوان کەمتر دەکات و توانای بیر پەیتی و زەینی کەم دەکاتەوە .

- کاردانەوەی بایۆلۆجی : وەکو خێرایی لێدانی دڵ و گرژبوونی خوێن بەرەکان و بۆرییەکانی خوێن و بەخێرایی رژانی هەندێ گلاند لە لەشدا ، ئەمەش کاردەکاتە سەر بەرزبوونەوەی شەکر لە خوێندا ، پەرچە کردارێکی تری تووش هاتنە بە برینی گەدە (قرحة المعدة) و کەم بوونەوەی بەرگری پێستی کارەبایی و فراوان بوونی بیلبیلەی چاو .

- زیان دان له کۆئەندامەکان : وەکو کۆئەندامی بیستن و هەستۆکەکانی بیستۆکی تەنی لولپێچی گوێچکەی ناوەوە ، هەندێ جار کەڕ بوون.
- ڕوودانی مردن : بەهۆی گرەو ژاوە ژاوی بەرزو تەقینەوەی گەورەو فشاری هەرە بەرز.
- ئەو دەنگانەی (٤٠-٥٠) دیسیبله منداڵ تووشی شڵەژان دەکات .
- ئەو دەنگانەی (٦٠-٨٠) دیسیبله کاری خراپ له کۆئەندامەکان دەکات .
- ئەو دەنگانەی (٩٠-١١٠) دیسیبله توانای بیستن کەم دەکاتەوە .
- گەر له (١٢٠) دیسیبل پتر بێ ، ئازار لەگوێ دا پەیدا دەکات و زیان له بۆڕیه دڵ (الجهاز القلبي الوعائي) دەدات .
- خشەی گەڵای دارەکان (١٠) دیسیبله.
- قسەی بە چرپەی نێوان دوو کەس (٢٠) دیسیبڵه.
- دەمەقاڵێیەکی توند (٤٠-٦٠) دیسیبڵه.
- گۆرانی تیژ له تەجیلەوە (ڕیکۆردەر) (٧٠) دیسیبڵه.
- گرەی ترومبێل (٧٨) دیسیبڵه.
- گرەی فرۆکەی جەنگی (١٤٠) دیسیبڵه.
- کەواتە ئەو گرە گرانە بە هەمیشەیی زۆر ترسناکن و ژینگە پیس دەکەن و زیان له تەندروستی مرۆڤ دەدەن[١٦٧].

قورئانی پیرۆز ئاماژە دەکات دەنگی بەرز مرۆڤ دەکوژێت : ﴿يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ ﴿١٩﴾﴾ البقرة ١٩ ، واتە : پەنجە دەخەنە گوێچکەیان لەکاتی تریشقە دا له ترسی مردن ، خودا ئاماژە دەکات هەندێ گەل بەدەنگی بەرزو هەیانە بە بورکان و بومەلەرزە لەناو براون.

---

[١٦٧] التربية والبيئة / ل:٥١- ٥٨ بەکورت کردنەوە .

﴿ وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ ﴾ ، دیسان لەولاتی ئێمە دا دەنگی تەجیل و تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ئاهەنگ و زەماوەندەكان بە گۆرانی و ڕەشبەڵەك و هەڵپەڕكێ ی بێ سوود ژینگە پیس دەكەن[168] . بێگومان گۆرانی و ڕەشبەڵەك و دەهۆڵ و كاسێتی گۆرانی و مۆسیقای حەرام چەندە زیانی بۆ سەر ڕەفتار و كردەوەكان هەیە كۆمەلگا تووشی لادانە جنسییەكان دەكات وەكو لە كتێبی (ڕێنومایی سێكسی ئیسلامی)دا باسكرا ، ئەوەندەش زیانیان بۆ پیس بوونی ژینگە هەیە ، كەچی ئەم جۆرە پیس كردنە لە كوردستانی خۆمان وەكو بڕینی دارو درەخت بووە بە مۆركێكی كۆمەلایەتی .

## پیس بوونی تیشكی و مەترسییەكانی

قورئانی پیرۆز لە چەندان ئایەتدا ئاماژە دەكات تیشكەكان ژینگە پیس دەكەن و كاریگەری خراپ بۆ سەر زیندەوەران دروست دەكەن ، (د.مصطفى محمود) دەنووسێ وەكو لە كتێبی (گەردیلە ناسی)دا باسمان كرد ، دەنووسێ : ئەو كارەساتانەی بەسەر گەلی (عاد) و (ثمود) هات و قورئان بە درێژی باسی مێژووی ئەوانی گێڕاوەتەوە ، دوور نیە ڕووداوێكی لە شێوەی جۆری تەقینەوەی ئەتۆمی بووبێت و زۆربەیان بە تەقینەوەیەكی گەورە دەست پێ دەكەن ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ ﴾ ، ئێمە دەنگێكی گەورەمان نارده سەریان وەكو پووشی ناو تەوێڵەمان لێ كردن. ئەو دەنگە بەرزو تیژە بە شەپۆلی سەرووی دەنگی دەچێت كە ماددەو گەردیلە لەت دەكات و گورج تەقینەوەیێك ڕوودەدات .

كورتەی ئەو كارەساتە وەكو قورئان وەسفی كردووە ، وەكو ڕووداوی (هێرۆشیما) و (ناگازاكی)یيە لە یابان ، لێرەدا زەمین لەرزە هەیەو زەوی ناوەژو دەكاتەوە گەرمی

---

[168] علوم الارض والبيئة / ل:٢٣٢.

زۆرو گەردەلولی وێرانکەر هەیە ، تیشك هەیە سۆمای چاو دەبات و خەڵکی تریشقە دەیانگرێت﴿ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ﴾ ، واتە : تریشقەی سزا دەیان گرێت .

پێویستە ڕاکردووان تەماشای دوای خۆیان نەکەن ، چونکە تیشکی تەفینەوەکە چاوی سەیرکەران کوێر دەکات! ﴿ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَٱتَّبِعۡ أَدۡبَٰرَهُمۡ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٞ ﴿٦٥﴾ ﴾ الحجر: ٦٥ ، واتە : با هەندێ شەو بڕوا بەخۆت و خاو و خێزانت بڕۆ شوێنیان بکەوە ، با کەس لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە . زیاتر لەمەش کارلێکردنەکان و پاشماوە بلووری و کریستاڵییەکان کە لە خاکی هێرۆشیمادا دۆزرانەوە دوای ئەوەی بە بۆمبای ناوکی لێ ی درا وەکو خاکی (سەدوم) و (عەمودە)ی بەسەر هاتووە لەفەلەستیندا ، کە (لوط) پێغەمبەرایەتی کردوون[169] .

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە دەکات بێ بڕوایان لە ژیانی بەرزەخیشدا بەسزای تیشکی وەکو تیشکی ئەتۆمی سزا دەدرێن ، کە بە تیشکی ئەتیر (گیانی) ناسراوە (يسلط الله على الكافر في قبره تسع وتسعون تنينا تنهشه وتلدغه حتى تقوم الساعة ، فلو ان تنينا منها نفخت في الارض ما انبتت خضراء) (رواه احمد وابو يعلي). واتە : خوا لە گۆڕدا (٩٩) ئەژدیها دەنێرێ دەیگەزێ و پێوەی دەدات تا قیامەت دێ ، گەر یەکێ لەو ئەژدیهایانە فووی (ئاگرینی) بکاتە سەر زەوی هەرگیز سەوزایی ناهێنێتەوە .

لێرەدا دەردەکەوێ چۆن دووپشك و مارو میکرۆب و کرم لاشەی مردووان دەخۆن و شی دەکەنەوە ، زیندەوەرانی ئەتیریش ئازاری گیانیان دەدەن لە گۆڕدا ، واتە : لە زەویدا ، ئەو گیاندارە ئەتیریانە تیشکی ئەتیر دەهاوێژن ، کە لە سەرووی تیشکی ناوکی و هایدرۆجینی یەوەیە ، گەر تیشکی ناوکی و هایدرۆجینی بەر خاکێ بکەوێ

---

[169] القرآن كائن حي / د. مصطفى محمود/ ل:٩٤- ٩٧ بەکورتکردنەوە.

به تیشك پیس دەبێ و ئەو خاکە پیس دەبێ و ڕووەك ناهێنێتەوە سزای دۆزەخیش تیشکی یە ، شەپۆلەکان وەکو سینی و گاما دەچنە ناو لەشی مرۆڤی بێ بڕواوە ﴿ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾ ﴾ ، واتـە : ئـاگرێکی داگیر ساوی خوایە هەڵدێ بەسەر دڵاندا.

## ڕاڤەی زانستی

وەکو لە کتێبی گەردووونناسی دا باسکرا (تیشك بابەتێکی فرە ئاڵۆزەو ، بریتی یە لە : کۆمەڵە شەپۆلێکی کەهرۆموگناتیسی ، یان چەند بەشێ لە گەردیلەکان بەخێراییەکی زۆر دەردەچن و توانای لەناو بردنی خانەکانیان هەیە ، کەرستەی چالاکە تیشکی یەکان جۆرەها تیشك بەرهەم دێنن ، ناوکی ئەتۆمە ناچالاکەکان تیشکیان لێ بەرهەم دێت ، تێکڕای چالاکییەکان ناگۆڕێ و ناوەستێ تا تەواوی ناوکە ئەتۆمییەکان شی دەبنەوە ، شیبوونەوەی ناوکی چەند تیشکێ دێنێتە ئاراوە لە تەنۆلکەکانی (ئەلفا) و (بێتا) و (گاما) و (ئێکس) و (نیوترۆنات) پێك دێت[170].

تیشکەکان لە شێوەی شەپۆلدان ، نموونەمان شێوەی شەپۆلی دەریاکانە بەرز دەبنەوەو دێنە خوارەوە ، لە نموونەی چیاکاندان ، یان لە نمونەی وشتردان

﴿ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ ﴾ المرسلات ٣٢ - ٣٣ واتـە : (خۆر) پریشکی وا داوێ وەکو کۆشك ، وەکو کاروانی وشتری زەرد وان

﴿ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ ﴾ هود ٤٢ شـەپۆلەکانی موگناتیسـی وەکـو شەپۆلەکانی دەریـاوان سووڕین، لـە (أ) دەسـت بـە بەرزبوونـەوە دەکـەن و لـە (ب) دا دەگەنە لوتکەو لە (ج)دا دێنە خوارەوە ، بەو پێیە درێژی شەپۆل نێوانی دوو لوتکەیە

---

[170] التربیة والبیئة / م:١٩٠ .

لە یەکتری دا[71]. ئەمانە لە شێوەی زنجیرە چیاو کاروانی وشتری زەرد وان ، ئەم وێچوواندنە لەگەڵ وردترین پێناسە فیزیاییەکان دێتەوە لە پێناساندنی شەپۆلە تیشکی یەکاندا و نزیك کردنەوەی لەهزری مرۆڤدا تالێیان وردبێتەوەو تێیان بگات .

**سەرچاوە سروشتییەکان لە ڕووی تیشکی یەوە دەبنە دوو بەشەوە :**

(١)سەرچاوە سروشتییەکان :

ئێمە بەر تیشکە سروشتییەکان دەکەوین و دەگەنە زەوی ، کەسەرچاوەیان خۆرە ، هەروەها بە بڕێکی کەم لە تاوێژە تیشکدەرەوەکان (المواد المشعة) وەکو پۆتاسیۆمی تیشك دەرەوە ، چونکە ئەو تیشکانە پەیتی یان بەرز نییە زیندەوەران دەیکەنە زێدو ژینگەی خۆیان .

(٢) سەرچاوە پیشەسازییەکان :

سەرچاوە پیشەسازییەکان کەرستە تیشکدەرەوەکانن (المواد المشعة) کە لە بەکارهێنانی تیشکەکانەوە پەیدا دەبن ، لە کرداری دەست نیشانکردنی پزیشکی داو پەیداکردنی وزەی کەهرۆ ناوکی داو ، ئەو کرداره تیشکدەرانەی پەیدا دەبن لە کانزاکردن (التعدين) و هاڕینی یۆرانیۆمداو ئەو کرداره تیشك دەرانەی لە کۆکردنەوەی پاشماوە تیشك دەرەوەکان و وێستگەکانی توێژینەوە ناوکیەکان و توێژینەوە کشتوکاڵی و فیزیایی و کیمیایی و دەرمانگەری و توێژینەوەکانی پیشەسازی و پاراستنی خۆراکدا .

---

[71] گەردووناسی / نووسەر (الاكترونيات ، والحياة الحديثة/ رادونسكايا / ت:المهندس حسين احمد عيسى/ ١٠- ١١.

## کاریگەری تیشك بۆ سەر زیندەوەران :

تیشك کار لە جۆرەها زیندەوەر کات ، کارتێ کردنەکە پشت بەجۆری زیندەوەرەکە و بڕی تیشکەکە دەبەستێ ، پاشان ئەو ماوەیەی تێیدا تووشی بەرکەوتنەکە دەبێت .

بە گشتی لە تەمەنی گەورەییدا کاریگەرییەکە زیاترە ، چونکە خانە گەورەکان چالاکترن و گۆڕان لە ڕیزبەندی ترشە ئەمینییەکاندا پەیدا دەکات لە ماددەی بۆ ماوەیی و ئینزیماتەکان و زیانی بۆ ماوەیی لێ بەرهەم دێ و بۆ وەچەکانی داهاتوو دەگوازرێتەوە ، یان زیانی ڕاستەوخۆ لەزیندەوەر دەدات ، کاریگەری تیشکی بۆ سەر سیستەمی ژینگەیی بە گشتی لە ڕێگای گۆڕینی پێکهاتە زیندەگییەکانیەوە ، تاقیکراوەتەوە ، گەر سیستەمی ژینگەیی بە ڕێژەی (٢-٣) راد تیشکی بەر بکەوێ دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی جۆری گیانداران ، بەلام گەر ژینگە بەر تیشکەکان بکەوێ لەمیان (٢٠-٣٠) راد دا بەرگری درەختە گەلا پانەکان لەدژی میکرۆبەکاندا کەم دەبێتەوە ، گەر تیشك لەو بڕەی پتر ببن سیستەمی ژینگەیی بە یەکجاری کاول و نەغرۆ دەکەن و لەناوی دەبەن.

## کاریگەری تیشك بۆ سەر مرۆڤ :

گەر مرۆڤ ڕۆژانە کاتژمێرێ یان دوو یان چەند خولەکێ بەر تیشکی هەرە بەرز بکەوێ ، تەنیا دوای دوو مانگ بەرەو ڕووی مردن دەبێتەوە ، وەکو لە تەقینەوەکەی یاباندا بینرا ، ئەو کەسەی ماوەیەکی کەم دەکەوێتە بەر تیشك تووشی نەخۆشی بەرکەوتنی تیشکی دەبێ و دیاردە سەرەتاکانی لەدەستدانی ئارەزووی خواردن و هێڵنج و سەر ئێشەیە ، ئەو مردنەی لە ئەنجامی بەرکەوتنی ژەمە تیشکی (١-٥) گرای پەیدا دەبێ بنەمای سەرەکی لەدەست دانی ئەو شانانەیە خوێن دروست دەکەن ، لە لێدانی گەورەدا هۆکاری مردن بۆ پەیدابوونی ناڕێکی لە کۆئەندامی هەرسدا دروست دەبێ ، لەکاتی لێدانی تیشکی زۆردا دەبێتە هۆی لە دەستدانی کۆئەندامی چەقە دەماری .

کاریگەری سەرەکی کوشندەیی تیشکەکان بەهۆی لەناوبردنی ئەو خانانە ڕوودەدات ، لەشیان لێوە پەیدا دەبێت ، گەر تیشکی بەرز بۆ وزەی ناوە بۆ خانەکان بەسیەتی بۆ لەناوبردنیان بەتەواوی ، بەلام لێدانی زۆر کەم دەبێتە هۆی وەستاندنی دابەش بوونی دەزوولەیی (الانقسام الخیطي).

گرنگترین کاریگەرییەکانی تیشکی بۆ سەر خانەکان ئەوەیانە کار لەو شانانە (الانسجە) دەکات خوێن پێك دێنن ، بەتایبەتی خانەکانی مۆخی ئێسقان کە هەستیارن لە ڕاست تیشکەکانداو خانەکانی لیمفاوی ، لێرەدا چەند کاریگەرییەکی تیژ هەیە بۆ سەر پێست وەکو وەراندنی قژو کارکردن لە کۆئەندامی زاووزێ ، وەکو نەزۆکی و لەناوبردنی ئەو خانانەی هێلکۆکەکان دروستی دەکەن .

دیسان بەرکەوتن بە تیشکی نزم و ژەمی کەمی تیشکی هاندەر دەبێ بۆ تووش هاتن بە شێر پەنجەو لێڵ بوونی هاوێنەی چاو ، کەزۆر هەستیار دەبێ لەبەرامبەر تیشکداو تەمەن کورت کردن و کاریگەری بۆ ماوەیی سك مانگی دا ، بۆیە پێویستە پاشماوەی تیشکدەرەکان لەتاوێری خوێ یێدا دابنرێن لەناو توێکڵی زەمینی دا دوور لە شوێنی دانیشتواندا ، وە دەبێ لەناو قتوی تایبەتی دا دابنرێن لەناو کانگاکانی دوور لە ئاوی ژێر زەویدا[١٣] . بێگومان چۆن تیشکەکان ڕۆڵیان بۆ چارەکردنی شێر پەنجە هەیە ، هەروەها هۆکارێکن بۆ تووش هاتن بە شێر پەنجە ، سەلماوە کۆ ئەندامی زاوزێ و بۆ ماوە لە هەموو کۆئەندامەکان پتر هەستیارن لەبەرامبەر تیشکەکاندا ، ئەو بازدانانەی لە هێلکۆکەی ژن و وەتەکانی پیاودا دروستی دەکەن (٩٩٪) یان زیان بەخشن و هاوسەنگی بایۆلۆجی تێك دەدەن.

(د.جێمس ف.کرد) ی بۆماوەزان لەزانکۆی (وسکنس) دەڵێ : تووش هاتنی جیهان بە بڕە تیشکێکی (٠,١) دەبێتە هۆی ئەوەی لەوەچەی یەکەمدا (٨٠٠٠) منداڵ و لەوەچەی

---

[١٣] التربية البيئة / ل:٨٨- ٩٣ بە کورت کردنەوە.

دووەمدا (٨٠٠٠٠) منداڵی کەم ئەندام پەیدا دەبن لە هزرو لەشدا ، ئەمەش لە کاتێکدا ڕێژەی منداڵانی جیهان (٢) ملیار کەس بێت. دیسان ژمارەی مردنی ئافرەتانی دوو گیان و منداڵەکان دەگاتە (٢٠,٠٠٠) لەوەچەی یەکەمداو (٣٠٠,٠٠٠) لەوەچەی داهاتوودا ، منداڵانی کۆرپەلەو ساوا ڕێژەی مردنیان دەگاتە (٧٠,٠٠٠) منداڵ بە پێ ی سەر ژمێرەکان (٤-٥٪) ی ئەو منداڵانەی لە ئەمریکا لەدایك دەبن ، تووشی کەم هزریان بێداری یان شێوانی سك مانگی دەبن ، یان تووشی نەنگی و ناتەواوی دەماری و ماسولکەیی و نەخۆشییەکانی خوێن و گلاندەکان و نەخۆشییەکانی پێست و کۆ ئەندامی پەیکەری و نەنگی هەرسی و کۆ ئەندامی زاوزێ و میز دەبن ، بۆ زانستی پتر بڕوانە (الاشعاع في حياتنا[١٧٣]).

ئیمڕۆ باس لە تیشکی سینی دەکرێ ، کە لە نەخۆشخانەکاندا بۆ دەست نیشان کردنی هەندێ نەخۆشی بەکاردێ ، گەر بۆ ناچاری نەبێ دروست نییە بەکار بێت ، هەروەها باس لە بەکارهێنانی تەلەفزیۆن و مۆبایل و ئەنتەرنێت دەکرێ ، کە هەموو ئەوانە تیشکین و زیانیان هەیە .

(سعد ابراهيم طايل الديهي) لە کتێبە ناودارەکەیدا دەنووسێ : (شوێنەواری تەلەفزیۆن بۆ سەر لەش : تیشکی سینی بە تایبەتی و تیشکەکانی تر بەگشتی دەبنە هۆی شێر پەنجە ، تاقی کردنەوە لەسەر مشك ئەوەی سەلماندووە ، تیشکەکەی کار لە دایکی سك پڕو کۆرپەلەی دەکات و کۆرپەلە تووشی شێوان دەکات ، بەهۆی تیشکەوە کۆرپەلە بەر لە پەیدابوون دەکوژێ ، بۆیە ژنان لە (کەنەدا) لە بەشی کۆمپیوتەرەوە دەگوازرێنەوە بۆ بەشەکانی تر .

- خەو زڕان پەیدا دەکات و لێدانی دڵ پتر دەکات و بیرکردنەوە دەکوژێت .
- کار لە هەستەکان دەکات بەتایبەتی چاو .

---

[١٧٣] الاشعاع في حياتنا / عبد الرسول مهدي عبرة / ل: ٦٧- ٧٤.

- کار دەکاتە سەر توانای پیتاندن.
- کار لە سیفەتە بۆ ماوەیی یەکان دەکات .
- خـەمۆکی و شـڵە ژان دروسـت دەکـات لەبەرامبـەر کـەمترین وروژان و تـرس و هۆکاردا[174] .

لە پەیماننامـەکانی دانـانی چەکدا ساڵی (١٩٣٠) لـە نێـوان دەوڵەتـە تازەکانـدا چـەکی بەکتریالۆجی و گازی ژەهراوی و خنکێنەرو هەموو جۆری ئامادەکراوە کیمیایی یەکان و شلەکان وەکو کوانی پیس (الجمرة الخبيثة)و ماددەکانی تر حەرام کران ، چـونکە زیانەکان بۆ هاووڵاتیانیش دەگوازرێتەوەو زیان لە ژینگە دەدات و مرۆڤ و ئاژەڵ لەناو دەبات و بە هەمیشەیی لە قەلاچۆکردنی دا دەهێڵێتەوە [175] .

**بە بیابان بوون ( التصحر ) و مەترسییەکانی :**

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ ﴾ السجدة ، واتە : ئایا ئەوە نابینن ئێمە ئاو لێ دەخورین بۆ خاکی ڕووت و کشتوکاڵ و ڕووەکی پێ دەڕوێنین. ﴿ وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾ الكهف ، واتە : ئێمە هەرچی لەسەر زەوییە دەیکەینە بیابانێکی ڕووت .

لێرەدا خوای گەورە ئاماژە بەجوانی بیابان و دیاردە جوانـەکانی سـەر ڕووی دەکـات ، بەڵام کاتێ بیابان جوان و قەشەنگە ، کە خاکێکی زینـدووی بـە پیتـی هەیـەو بـارانی لەسەر دەبارێ و دەستی کاول کاری مرۆڤ یان هۆکارە سروشتی یەکان تێکیان نەداوە ، پاشان خوداوەند ئاماژە دەکات ڕۆژێك دێ زەوی بەرەو بیابـان بـوونێکی ڕەق و ڕووت دەڕوات ، بەهۆی هۆکارە سروشتی یەکان و کەمتـەرخەمی دەستی مرۆڤ.

---

[174] موقف الاسلام من تنشئة الطفل / سعد ابراهيم طايل الديهي / ل:٢٨٥.

[175] قضايا الفقه والفكر المعاصر / د.وهبة الزحيلي / ل:٧٨٧.

هۆیەکانی بە بیابان بوون زۆرە ، وەکو بڕینی دارستانەکان و مێگەلی زۆر و زۆر ئاو هەڵێنجان لەئاوی ژێر زەوی دا وەکو لە (واحة الاخضر)دا ڕویدا . بێگومان جەنگ دەوری لە بە بیابان بووندا هەیە ، چونکە خەڵکی گوێ بە پەرەپێدان و پاراستنی ژینگە نادەن ، سەرباری بەکارهێنانی چەکی کاولکار ، وەکو بۆمبای ناوکی و ناپاڵم ، نابێ لەیادمان بچێ ئەمریکا دارستانەکانی ڤێنتامی بەکەرستەی کیمیایی ڕشاند تا دارو درەختەکانی لەناو بچن ، ئاکامەکانی بە بیابان بوون ڕوودانی برسێتی و کۆچکردن و ملبەملانەیە ، وەك ئەوەی لە سودان و سۆماڵ ڕوویداوە لە برسێتی لەناوچە بیابان نشینەکاندا[176] .

(ئەدوەرد کیلەر) دەڵێ : دۆزینەوەی کشتوکاڵ –الزراعە- توخمە سەرەکییەکانی بۆ زۆربوونی دانیشتووان دابین کرد و زەوی چێنراوی پتر کرد ، ئەو دیاردەیە نارێکی خستە ناو هاوسەنگی سروشتی ژیانیەوە ، چونکە کشتوکاڵ فراوان بوو بەشێك لە ڕووەکەکان لەسەر حیسابی ئەوانی تر زۆربوون ، هەتا هەندێ ئەو ڕووەکانە وەکو کارەساتێ بۆ ڕووەکەکانی تر لە قەڵەم دران ، بۆیە سەیر نیە ئێستا ببینین زیادبوونی دانیشتووان بەهێڵێکی تەریبدا دەڕوات لەگەڵ قڕتێ کەوتنی زۆرێ لە باڵندە و شیر دەرەکاندا.

پوختەی کرداری پەرەسەندنی ڕەگەزی مرۆیی زیادبوونی بەردەوامی بەکارهێنانی خاکە بەجۆراو جۆری و کەڵەکەبوونی پاشماوەی زۆربوونی دانیشتووان و شارەکان و کشتیاران و جوتیارانە لەگەڵ ڕۆژگاردا .

ئێستا زانراوە هەر لەگەڵ سەر هەڵدانی شارستانی مرۆیی دا بەر لە (٦) هەزار ساڵ یان بەر لە (١٥) هەزار ساڵدا ، ئێستا بەشێکی کەمی زەوی ماوە دەستی مرۆڤی پێ نەگەیشتبێت. سەرباری توانای مرۆڤ لە دروست کردنی گۆڕانکاری زیاتردا ، بەلاّم

---

[176] بڕوانە (علوم الارض والبیئة للهواة / خیر شاهین /ل:٢٣٧.

قەبارەی ئەو گۆڕانانە گەر زیاتر بکرێ بە ئاسەوارەکانی جوڵەکانی زەمینی دا زۆر کەمە ، وەکو جوڵەی دروست بوونی چیا و چالاکی بورکانی و توانای ڕووبارەکان لە ڕامالین (التعرية) دا ، زۆر لەو گۆڕانانە لە شارە گەورەکاندا گرد دەبێتەوە ، وەکو هەنووکە زۆر لە بەڵگە سەلبی یەکانی شارستانی بەرجەستە دەکات .

ئەو ئەزموونانەی لە بەکارهێنانی زەویدا بەکارهێنراون لە جیهانی کۆندا بۆ ئێمە والآن و بەڵگەیێکن لەسەر ئەو کردارانەی پێشینان لەسەری کاریان کردووە بۆ پاراستنی ژینگە لە ڕێگای دۆزینەوەی هاوسەنگی لە نێوان ژینگەو دابەش بوونی دانیشتواندا ، لێرەدا کرداری تر هەیە دزێوی بەکارهێنانی هەندێ لە کەرەستە سروشتییەکان دەخەنە ڕوو ، لەوانە : پاشماوە کێڵگەییەکان و دەشتاییە لافاوییەکان ، کە کرداری ڕووتاندنەوە (التعرية) لێکی هەڵوەشاندون ، هەروەها بڵاوبوونەوەی قەدپاڵە ڕووتەکان و گردە تاوێرییە ڕوتەکان لە خاك و بەنداوەکانی ناودێری و پڕ کردنەوەی زۆرێ لە عەمبارە ئاوییەکان بە لیتەی قوڕو پاشماوەی ولآتە لەناو چووەکان کە لە ڕابردوو ژیاون و گەشەیان کردووە ، بۆ نمونە :

**(١) فینیقیای کۆن و کردنی ناوچە لێژەکان بە کشتوکاڵ :**

فینیقییەکان لە کەناری خۆر هەلآتی دەریای سپی ناوەڕاستەوە بەر لە (٥٣٠٠) ساڵ کۆچ دەکەن و لە دەشتایی کەناری تەنگەبەردا جێگیر دەبن و زۆر شاری کەناری بنیات دەنێن لەوانە (بەیروت و سودو ترابلوس و بابلوس) ، سروشتی بەرزو نزمی زەوی دەوری ئەو کەنارە چیایی یە هەورازو هەڵدێرە بەرزایی (٣٠٠٠)م دەبێ و ڕابردوو بە دارستانی چڕو پڕی کاژ (سنەوبەر) دا داپۆشرابوو ، بە لوبنان ناوبانگی پێ دەرکردووە ، کە داهاتوو زۆربەیان بۆ تەختەو دارو بۆ دۆڵی (نیل) و نێوان (دووزێ) ڕەوانە کران ، کاتێ ئەو ناوچەیە بەدانیشتووان چڕ ژا بەشێ لەوانەیە ناچار بوون لە قەد پاڵەکان بژین و دەستیان کرد بە بڕینی دارەکان و کردنی ئەو قەدپالآنە بە کشتوکاڵ خاکەکەیان تووشی ڕامالین کرد ، ئەمڕۆ لە ڕێگای ئەو قەدپالآنەوە

ژمارەیێکی زۆر دیواری تاوێری زۆر پلە پلە لە بەرزایی دا درێژ دەبێتەوە ، چونکە ئەوان پەیان بە مەترسییەکانی ڕووتانەوە بردووە و هەوڵیانداوە سنووری بۆ ئەو ڕووتانەوەیە دابنێت بە دامەزراندنی ئەو دیوارانە لەو لێژایی یانەوە ،، کە تەمەنی بە شێکیان (٤٠-٥٠) سەدەیەو ئێستا هەندێکیان هەڵوەشاون و هەندێ نوێ کراونەوە ، هەرچی دارستانەکانی کاژو سنەوبەرەکانە تەنیا (٢٦٠٠) کم$^2$ ماوەو بەشی زۆریان لەو ناوچانە ماونەوە لە ڕووتانەوەو ڕامالین ڕزگاریان بووە .

**( ٢ ) شارە لەناوچووەکانی سوریا :**

کۆمەڵە شارێکی وێران لە سوریا هەیە لە کۆندا گەشەیان کردووەو ئێستا نیمچە شارێکی مردوون ، لەوانە شاری (ئەلبار) کە کشتوکاڵی گەشە تێدا دەکات و ڕۆن زەیتون و شەرابی لێوە دەڕوات بۆ (ڕۆما) ، بەلام دوای ئەوەی فارسەکان داگیری دەکەن کشتوکاڵەکەی خاپور دەکەن ، بەهۆی نەمانی کشتوکاڵ دوو مەتر خاکی سەر لێژاییەکان بەهۆی (ڕوتانەوە) لەناو دەچێت ، نمونەی بەرچاو گۆڕانی ئەو خاکەیە دوای (١٣) سەدە دەگۆڕێ بە بیابانێکی ڕوت و خاڵی لە خاك و ئاو و ڕووەك.

**( ٣ ) داستانی فەڵەستین :**

خاکی فەڵەستین وەکو لەسەر زمانی (موسا) - علیه السلام- هاتووە بەر لە (٣) هەزار ساڵ بەخاکی (المعاد) وەسفی کردووە ، کە دەوڵەمەندە لە ڕووبارەکان و سەرچاوەکان و خاکی گەنم و جۆو دار مێوەکانە ، خاکی سامانە سروشتی یەکانە[١٧٧].

بەو پێیە خراپ بەکارهێنانی ئەو خاکەو ڕامالینی بەهۆی ئاوەوە لە لێژاییەکانەوە و ڕووتانەوەی خاکەکەی بۆتە هۆی ئەوەی زۆر لە دانیشتووان لەوێ بار بکەن .

---

[١٧٧] جیولوجیا البیئة / ادوارد کیلر / ت:غسان محمد البستي/ ل:٦٢- ٦٣.

( ٤ ) میسر :

قورئانی پیرۆز جگە لەمەش ئاماژە دەکات زۆر لەو ولآتانە بە خاك و ئاو و خەڵك و دارو درەختەوە بەهۆی ڕووداوە سروشتی یەکان لەناچوون ، وەکو سزایێکی خوایی بۆ ئەوان ، چونکە بەدەنگ پێغەمبەرەکانیانەوە نەچوون و دژایەتی خواو پەیامی ئەویان کردووە﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ ﴾ الحج ، واتە : هەر شارێ لەناومان بردووە ستەمکار بوون و بەسەریەکدا کەوتووەو بیرەکانی یان لەکار کەتووە ، کۆشکەکانیان لەناو چووە .

لەوانە (میسر) خاکێکی بە پیت بووەو خوداوەند بە لافاو و کوللەو کارەساتی سروشتی ڕووتی دەکاتەوە : ﴿ فَأَخْرَجْنَاهُم مِّن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ ﴾ الشعراء واتە : بنەماڵەی فیرعەونمان لە باخچەکان و سەرچاوەکان دەرکردن ، وە لەناو خەزێنە و شوێنە بەرێزەکاندا .

پاشان قورئان ئاماژە بە گرنگی ڕواندنی دارو درەخت و گرنگی چاك کردنی زەوی و پاراستنی خاك دەکات و نەفرین لەوانە دەکات دارو درەخت دەبڕن و دارستان لەناو دەبەن ، یان قڕ دەخەنە زیندەوەرانەوە ، پێغەمبەر( ﷺ) فەرموویەتی : (ما من رجل يغرس غرسا الا كتب الله له من الاجر قدر ما يخرج من ذلك الغرس) (رواه احمد) ، واتە : هەر پیاوێ نەمامێ دەڕوێنێ ، ئەو نەمامە چەند بەرهەم و سوودی هەبێ هەندە چاکەو پاداشت بۆ نەمام چێنەکە لەلایەن خواوە دەنووسرێت.

(ما من مسلم يغرس غرسا ، فيأكل منه طير او انسان او بهيمة الا كان له به صدقة) (متفق عليه) ، واتە : هەر موسڵمانێ نەمامێ بڕوێنێ باڵندە یان مرۆڤ لێی بخوات ئەوە خێری پێ دەگات . (من احيا ارضا ميتة فله بها اجر) (رواه احمد) واتە هەر کێ خاکێکی مردوو زیندوو بکاتەوەو چاکی بکات ئەوە پاداشتی پێ دەگات ،

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) نـەفرین لەوانـە دەکات داری تـەڕ دەبـڕن وەکـو داری مـۆردو داربەڕوو ، دار مازوو ، دار کرۆسك و دارەبەن و دار گێوژو دار گوێزو ...هتـد ، (من قطع سدرة صوت الله رأسه في النار) ، واته : لەخواوه نـەك پێغەمبەرەکەی نـەفرین لەو کەسە کراوه داری مۆرد دەبڕێت . بێگومان وەکو (ئەدوارد کیلەر) دەڵێ : ناسـتی چاك کردنی خاك بگاتە هەر ئاستێ ناتوانێ دۆخی جارانی بۆ بگەڕێتەوه.

ئەمانە وانەن بۆ خەڵکی کوردستان و حکومەت ، کە سنووری بۆ لەناوبردنی خـاك و بڕینی دارو درەخت و دارستان و لەناو بردنی خاکی کشتوکاڵی و کوشتنی گیانداڕانی کێوی بەسـوود دابنـێن ، چـونکه زیـاتر ژینگـەی کوردسـتان پـیس دەبێـت و ژیـانی دانیشتووانی دەکەوێتە مەترسییەوه ، دوای ئـەوەی رژێمـی عەفلـەقی هـەوڵی دا دارو درەخت وەچەو خاکی کوردستان لەناو ببات و بیکاتە خاکێکی ڕوتی وەکو بیابان دوور لــە هــەموو ئاســەوارێکی ژیــان و تــەنیا گــۆڕی مرۆڤــەکان و دارودرەختــەکان و زیندەوەرانی لێ بێـت﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ ، واتـه : کـاتی پشـتی کـردەوه ڕۆیشـت بـه زەوی دا تا خراپـەی تێـدا بکـات و کشـتوکاڵ و وەچـه لـەناو ببـات ، خـودا خراپکاری خۆش ناوێت .

پاشان توێژینەوەکان باس لەوه دەکەن لێرەدا بەرنامەیێکی جیهانی هەیە بۆ دروسـت کردنەوەی دارستانەکان ، ڕەنگە لە توانایاندا بێت ساڵانە (٦٠) ملیۆن کاربۆن هەڵبمژن و هاوسەنگی بگێڕنەوه ، لەجیاتی وزەکانی تر وزەی (کەهرۆ ڕوناکی) بەکار ببرێ ، کە هیچ پیس بوونێك دروست ناکات ، کێشەی بە بیابان بوون کێشـەیەکی جیهـانی یـە ، بە پێ ی ڕاپۆرتی وڵاتە یەکگرتووەکان چارەکێکی سەر ڕووی زەوی بیابانەو مەترسی ئەوەی هەیە ناوچەکانی تریش بەرەو بیابـان بـوون بـڕۆن ، بـە بیابـان بـوون نیمـڕۆ گەیشتۆتە پلەی دڵەڕاوکێ و ١/٦ (یەك لەسەر شەشی) دانیشتووانی جیهانی گرتۆتەوه ، هەروەها (٧٠٪)ی زەوییە وشکەکانی داوەتە بەر خۆی ، لە ئەفریقیادا بـۆ نمونـه بـه

بیابــان بــوون ژیــانی ملیۆنــەها خــەڵکی تێــك داوەو (٣٩٪)ی دانیشــتووانی خســتۆتە ئازارەوە ، گەر بەردەوام بێت مەترسی پتریان بۆ پەیدا دەکات .

پاشان گەرم بوونی زەوی زیاتر ئاو و هەوا تێك دەدات و ڕێژەی باران کەم دەکاتــەوەو زۆر ناوچەش تووشی لافاو دەبن ، بەرز بوونەوەی ئاستی دەریاکــان مەترســی پــتر بــۆ سەر وشکانی پەیدا دەکات و (١٢٠٠) دوورگەی ئۆقیانووسی هینــدی و دەریــای کــاریبی تووشی وێران بوون دەبێت بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ئاو ، بۆ زانستی پتر بڕوانــە (العالم في مطالع القرن /٢١) بەرگی (١) وەکو ڕابردوو باسکرا.

لەمــەش زیــاتر قورئــان و زانســت هۆشــیارییان داوە ڕۆژێــك دێ زەوی دەبێتــە پارچــە ئاگرێــك بــە ئــاو و هــەواو چــیاو دەشــت و دۆڵایــی و نشــێوەوە ، بومەلــەرزەو بورکــان هەموو شوێنێك دەگرێتەوە ، زەوی دەبێتە پارچە زەوی یەکی تەخت و ڕووت

﴿ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيۡهَا صَعِيدٗا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾ ، وەکو لە کتێبی (زەوی ناسی) دا باســمــان کـــرد (خـــاك) بـــەهۆی (بـــا) و (ئـــاو) تووشـــی داخـــوران (التآکـــل – Erodobility) دەبێت ، بەڵام ئەو خاکەی پێك هاتــەی (٢٠٪)ی قــوڕە یــان خــاکێکی سفتە درەنگتر تووشی داخوران دەبێت ، وەکو لــە (جیۆلۆجیــا البیئــة/ادوارد کیلــر)دا باسکراوە.

دیســان ڕوداوە سروشــتییەکان وەکــو بوومەلــەرزە و لافــاو و گەردەلوولــەکان ، وەکــو گەردەلولی هێڵی یەکسان زیانی ماددی و ژینگەیی و کۆمەڵایەتی گەورە لەو ڕووبەرانە دەدات ، کە ئەو کارەســاتانە دەیانگرێتــەوە ، وەکــو (د.العمیــد بهیــج) دەڵــێ : زۆربــەی وڵاتان بەتایبەت وڵاتانی جیهانی سێ یەم تووشــی زیــانی پــیس بــوونی ژینگــەیی زۆر هــاتوون ، چــونکە مــرۆڤ لــە مێــژەوە لــە ڕێگــای شــەڕی خوێنــاوی و خەســتەوە بــێ سنوورانە دەستی کردووە بە شکاندنی سنووری زۆربەی سامانە سروشــتییەکان ، بــێ ئاگا لە ویژدان و بێ گوێدانی دەسەڵات بەو بابەتانە لە وڵاتدا ، بۆیە بۆ خۆی بەرەوا دەبینێ :

- برینی دارو درەختی بێزار کەر ، یان دەیان برێ بۆ فرۆشتن یان بۆ پیشەسازی و دروست کردنی خەڵوز بە مەبەستی بە دەست هێنانی قازانجێکی خێرا لەسەر حیسابی وڵات .
- دامەزراندنی ئامێرەکانی شکاندن لەنزیك ئەو شوێنانەی خەڵکی لێیە ، وەکو شکاندنی چیاکان و وێرانکردنی تاوێرەکانی بە مەبەستی بیناسازی و زفت کردنی رێگاو بانەکان و قیرتاو کردنیان .
- لابردنی لی کەنارەکان و دزێوکردنی دیمەنەکانیان و بەجێ هێشتنیان تا ببنە نیشانە بۆ شەپۆلەکانی دەریاو زەوی قوت بدەن و ئەو مەلەوانگە و بینایانەی لەسەری یان دروست کراون بیانڕوخێنێت[١٧٨]

بێگومان پاراستنی ژینگە لە وشکانی و دەریایی و هەوایی دا بە خاك و ئاو و هەواو ڕوناکییەوە بەرپرسیاری تێدایە ، سەیر بکە خوداوەند چۆن ئەو جولەکانەی لەژێر کەناری دەریادا دەژیان و ڕاوە ماسی دەکەن  لە شەممەاندا کە لەو ڕۆژەدا ماسی داهاتنە کەنارو ڕۆژانی تر نەدەهاتن ، خوداوەند بۆ پاراستنی سامانی ماسی و هەم تاقیکردنەوە جولەکەکان لەو ڕۆژەدا قەدەغە دەکات ماسی بگرن ، بەڵام بەشێ لەوانە ئەو سنوورەیان بەزاندو ڕۆژی شەممان دەستیان کرد بەڕاو ، بۆیە خوا لە تۆڵەی ئەوە کردنی بە مەیمون و مەسخی کردن وەکو لە (پیس بوونی دەریاکان) دا باسی دەکەین.

**پیس بوونی دەریاکان وکەم بوونەوەی ماسی :**

﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ ﴾ [الأعراف:١٦٣] ، واتە : پرسیاریان لێ بکە لە

---

[١٧٨] احداث القرن العشرين / د.العميد بهيج بحليس/ج٢٣/ ل:٢٠ .

ڕاست ئەو شارەی لە تەك کەناری دەریا بۆ کاتێ لە شەممەدا سنوور بەزێنییان دەکرد ، کاتێ لە شەممەدا نەهەنگەکان دەهاتنە ڕوخ دەریاو ڕۆژانی تریش نەدەهاتن ، بەو شێوەیە تاقییان دەکەینەوە بەهۆی ئەو خراپەکارییانەی دەیانکرد .

لێرەدا خودا ئەو شارە تاقی دەکاتەوە ، هەم بۆ پاراستنی سامانی ماسی یەکان و نەهەنگەکان ، قەدەغەیان دەکات لە شەممەاندا ڕاو بکەن ، چونکە لەو ڕۆژەدا بەزۆری دێن بۆ کەنار دەریا ، ئەوانیش دەچوون بێ ویژدانانە زیاد لە پێویست لەبەر تەماع ئەوانیان ڕاو دەکردو قڕیان تێ دەخستن. لێرەدا دەردەکەوێ پێویستە بۆ ڕاوی ماسی و ڕاوی گیاندارانی کێوی سنوور دابنرێ ، چونکە ئەوانە سامانی گشتین و پارێزەری ژینگەن ، نابێ لە وەرزی گەرادان و هێلکە کردن و کاتی سك پڕی و بێچوو داناندا ڕاو بکرێن.

سەیرکە خودا جولەکەکان کە سنووری ڕاو دەبەزێنن خودا مەسخیان دەکات و دەیانکاتە مەیمون و گۆڕان لە جینی خانەکانیاندا دروست دەکات و ئەمەش لای خوا ئاسانە ﴿ فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿١٦٦﴾ ﴾ ، لەو ماوەیەی پێشوو کۆمەڵێك زانای شوێنەوارزان لە فەلەستین گۆڕستانێکی یارانی شەممەیان دۆزییەوە ، کە مۆمیا کرابوون ، ئەو مۆمیا کراوانە هەندێکیان کلکیان بستێك دەبێ وەکو بەرازو هەندێکیان لەشێوەی مەیموندان ، تا پارچە تۆڕی ڕاوچییەکانیش دەدۆزنەوەو وێنەیان دەگرن ، بڕوانە نووسراوی (محمد عیسی داود) بەناوی (القنبلة / یهود مسخهم الله قردة وخنازیر / اکتشاف القریة حاضرة البحر / ٢٠٠٣).

لەباسی پیسبوونی ئاودا باسکرا ، کە چۆن ئیمڕۆ ئاوەکان بەهۆی ڕژانی نەوت بەسەریانداو بەهۆی پیس بوون بە جیوەو کادمیۆم و قوڕقوشم و زەرنیخ و تیشکەکان ..هتد ، پیس بوون ، لەوانەش دەریا و ئۆقیانووسەکان ، ئەم ماددانە کار دەکەنە سەر مردنی ماسی و نەرمۆڵەکان و توێکڵدارەکان و زیندەوەرانی ترو

باڵنـدەكان ، بـۆ نمونـە : جارێكیـان نـەوتی (دیـزل) ڕژایـە كـەناری (كالیفۆڕنیـا) ژمارەیێكی بێ شوومار گوێچكە ماسی (المحار) كوشـتن ، دڕكە پێستەكان (الشوكیات الجلد) و ئارووی دەریا (خیار البحر) لە هەموو زیندەوەرانی تـر زیـاتر نـەوت كاریـان تێ دەكات ، تا لە كەنداودا بەهۆی نەوتی (كوەیت) زۆر جار دەبینرێ گیانداره بڕبڕه دارەكان ، كـه هەناسـه دەدەن وەكـو (مـارو كیسـەڵ و ڕەقـی پـەو دۆلفینـەكان) بـەرەو كەنار دەڕۆن تا لەوێ بمرن ، دوای ئەوەی تووشـی هەناسـه تـەنگی و هـەوی پێست و خوێن پژانی هەناوی بوون .

یان دەبینـی لـه جـەنگی كەنـداودا زۆر لـه باڵنـدەكان لـه سـاڵی (١٩٩١)دا لەناوچوون ، ئەمەش بەهۆی پیس بوونی كـەنارەكانی سـەعوودییه بـووه ، كاتێ پەڵەی نـەوتی و گازی و بەنزین ئەو ناوچەیه دادەپۆشن پۆڵێ لەوەڕ قرتـێ دەخـات و دیـاردەی یـارانی شەممه دووباره دەكەنەوه ، یان دوورگەی (كبر) لە كوەیت ، كە هەمیشه پەڵەی نەوتی داپیۆشیوه لە هەموو ناوچەكانی تر زیانبەخشتره ، دوای ئەوەی دەگاته قوڵایی دەریا زیان لەو گیاندارانه دەدات لە ناوەڕاستی ئەو ئاوەدا مەلە دەكەن[١٧٩] ، ڕاستە خوداوەنـد ڕاوی حـەلاڵ كـردووه : ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ المائدة ٩٦ ، بەلاَم خوداوەند زیادەڕەوی حەڕام كردووه ، وەكو یارانی شەممه ، كە گیانداران دەخاتـه مەترسـی قرتـێ خسـتنەوه ، بـۆ نمونـه : ئیحـڕام بەسـتن لـه حەجـدا ئـەو وانەیەمان فێر دەكات كە ئێمە دەسـت بـە سـامانه ئاژەڵیەكانـەوه بگـرین و لـه قرتـێ كەوتن بیانپارێزین ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ واته : ئـەی ئەوانەی بڕواتان هێناوه ئێوه لەكاتی ئیحڕام دا نێچیر مەكوژن.

ئێستا لە جیهانـدا زیـاتر لـه (٢٠٠) ملیـۆن كـەس پـتر خـەریكی ڕاوه ماسـی یـه (٩٨٪) لەوانه لە وڵاتە هەژارەكاندان .

---

[١٧٩] بڕوانة : (التربية و البيئة / ل:٨٢- ٨٣) .

گیاندارانی ئاوی (٥٠٪)ی پرۆتینی ئاژەڵی و خوێ ی کانزایی بە (٤٠٠) ملیۆن کەس هەژار دەدەن لە ئەفریقیاو باشووری ئاسیادا ماسی ژەمە خۆراکی پرۆتیناتی زیاتر لە (٦,٢) ملیار کەسە لە جیهاندا ، پاشان زەنگی مەترسیدار بەردەوام لێ دەدرێ کە سامانی ماسی پاشەکشە دەکات بۆ دواوە ، هۆکارەکەشی قەتیس بوونی گەرمی و ڕاوی بێ سنووره : (ئاخیم شتاینر) سەرۆکی بەرنامەی ژینگە سەر بە ولاتە یەك گرتووەکان ، دەڵێ : بێ ئاگایی لە مەترسی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی ڕووی دەریاکان لەبەرامبەر گۆڕانە ئاو و هەواییەکانی ترو کارکردنی لە کەرتی پیشەسازی ماسی ، کە خۆراکی سەرەکی پرۆتینی زیاتر لە (٢,٦) ملیار کەسە لە جیهاندا واتە : زەنگی مەترسی یە بۆ مردنی ماسی یەکانی جیهان [١٨٠] ، هەر چەندە دەریاکان ٧٥٪ زەوی دادەپۆشن و ماددەی زیندە لە هەموو پەڵەکانی دا هەیە ، کەچی ژەمە خۆراکی بەشێکی کەم لە خەڵکی جیهان دابین دەکات ، ساڵانە (٤٠) ملیۆن مەتری ماسی و بەرهەمی دەریایی تر ڕاو دەکرێت[١٨١] .

خوداوەند لە قورئانیشدا ئاماژە دەکات بەرهەمی پرۆتینی گۆشت لە بەرهەمی پرۆتینی ڕووەك باشترە ،﴿ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا ﴾ واتە : ئایا ئەو خۆراکە باشە (گەزۆو شێلاقە) بە ژەمە خۆراکی نزم تر دەگۆڕنەوە لە (دانەوێڵەکان)؟!

پاشان قورئان ئاماژە بە گەرم بوونی دەریاکان و داگیرسان و کوڵانیان دەکات لە ئاخر زەماندا ، کۆتایی بە ژیانی دەریاکان دێت ﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ ﴾ ، واتە : کاتێ دەریاکان گڕیان گرت .

---

[١٨٠] مجلة العربي / العدد ٦٠٢ / يناير ٢٠٠٩ / ل:١٦٢- ١٦٣.

[١٨١] الدواجن غذاء وتغذية / ١ج باترك وجي شابيل / ج١ / ل:٤٤٤.

## پیس بوونی ڕوناکی و مەترسییەکانی :

﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ﴿١﴾ ﴾ ، سوێند بە خۆرو ڕووناکیەکەی .﴿ وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾ ، واتە : زەوی بە ڕووناکی پەروەردگاری ڕووناك بۆوە. کاتێ ڕوناکی بەهرەیەکی خوایەو چاوگێکی ژیانە ، بەڵام زیادە ڕەوی کردن لە ڕوناکی و کارەبادا ژینگە پیس دەکات ، ئیمڕۆ کام ماڵ هەیە شەوانە چراخان نەکرابێ ؟ بە ڕوناکی و دەنگی تەلەفزیۆن پیس نەکرێ ؟ کە مەترسی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی دروست دەکات ؟ کەچی خودا شەوی بۆ پشوودان و حەسانەوە داناوە .

(خیر شاهین) دەنووسێ : پیس بوونی روناکی لە پیس بوونەکانی تر جیاوازە ، بۆ نمونە پیس بوونی کیمیایی بە سستی پەرش دەبێتەوە ، بەلأم تیشك بە خێرایی (٣٠٠٠٠٠)کم/چ دەڕوات ، بۆیە لە ماوەیەکی دووردا بلاوەدەبێتەوە ، زۆربوونی ئاوەدانکردنەوەو دروست کردنی شەقام و ڕێگاو بانەکان و پیس بوونی ڕوناکی پتر دەکات ، ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد بەکارهێنانی کارەباو زیاد سوتاندنی پترۆڵ و زۆر بوونی جۆرەها پیسی بارانی ترش و هی تر (وەکو باسکرا) ، بۆ زانین خوا شەوی بۆ نووستن دروست کردووە ، بە مەبەستی حەسانەوەو پشوودان ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًا ﴾ ، واتە : خوایە شەوی داناوە تا تێیدا نیشتەجێ ببن و ڕۆژی کردووە بە هۆکاری بینین.

لە کتێبی (خەون نامەی کوردی لە ژێر ڕۆشنایی شەریعەت و زانستدا) باسی سوودەکانی خەوتن و خەونمان کردووە ، بێگومان نووستن دیاردەیەکی بایۆلۆجییە هەموو گیانداران دەخەون ، لەکاتی نووستندا گیان پەیوەست دەبێ بە جیهانی گیانی یەوە و خەونان دەبینێت و لەکاتی بێداریدا پەیوەست دەبێ بە جیهانی ماددیەوە ، نووستن پشوو بە لەش و هەست و مێشك دەدات و بۆ نەخۆشان و ساغان پێویستە ، نووستن پشوودان بە مرۆڤ دەدات و مێشك نارام دەکاتەوەو زەین پەیت دەکاتەوە ،

پاشان لە ڕۆژدا ڕوناکی دەبێتە هۆی بینین وەکو خوا فەرموویەتی : (والنهار مبصرة) چونکە چاوەکان ئەوەی دەبینن لە تەنەکان بەهۆی دانەوەی ڕوناکییە ، گەر نا مرۆڤ بە شەو نابینێت ، ڕۆژ بۆ ئیش و کارو چالاکی و ڕۆزی پەیدا کردنە ، بۆیە پێویستە شەوانە چراو گڵۆپ بکوژێنینەوە بۆ خۆپاراستن لەزیادە ڕەوی و بۆ حەسانەوەو پشوودان.

## پیسبوونی کەهرۆ موگناتیسی و مەترسییەکانی :

پیس بوونی کەهرۆ موگناتیسی زۆر هۆکاری هەیە : لەوانەش ئەو تەلانەی کارەبای بەرز (الضغط العالي) دەگوازنەوە لە دەوری ئەو تەلانەدا کایەی موگناتیسی بەهێز دروست دەکەن و دەبنە هۆی دروست کردنی چەند نەخۆشییەکی ترسناك ، هەروەها ئەو دەزگایانەی پەخش کردنی تەلەفۆن و مۆبایل بەهێز دەکەن بۆ گواستنەوە ، لەگەڵ شەپۆلە کورتەکاندا.

## پیسبوونی ئەندامی و زیانەکانی : (التلوث العضوي)

گرنگترینیان پاشەڕۆکی مرۆڤ و گیاندارانی کشتوکاڵیە ، ئیمڕۆ دەزانین زۆر لەسەرچاوە ئاوییەکانی خۆمان بەهۆی زێراب و پاشەڕۆکی مرۆڤ پیس بوون ، ناخۆشترین بۆن بۆنی زێرابەکانە، کاتێ بە لایاندا ڕەت دەبین ، ڕابردوو ئاماژەمان بە پیس بوون کرد ، پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە میزو پیسایی بخرێتە ئاوی مەندو ڕەوانەوە وەکو باسکرا.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (في الوضوء اسراف وفي كل شيء اسراف) (رواه سعيد بن منصور) واتە : لە دەست نوێژو هەموو شتێکدا زیادە ڕەوی هەیە ، (جابر) دەڵێ : (نهى ان يبال في الماء الجاري) رواه الطيالسي، واتە قەدەغەی کردووە میز بکرێتەوە ناوی ڕەوان (ڕۆیشتوو)ەوە . (نهى ان يبال في الماء الراكد) رواه مسلم) ، واتە : قەدەغەی کردووە میز بکرێتە ناوی مەندەوە .

کەواتە : بێگومان ئەو فەرموودەیەی دەڵێ : (اذا كان الماء قلتين لم يحمل الخبث) رواه الخمسه ، واتە : گەر ئاو گەیشتە قولەتێن پیسی هەڵناگرێ و پیس نابێت ، وەکو (ابن عبدالبر) له (التمهيد) دا باسی کردووەو مەزهەبی شافیعی لەسەر دامەزراوە لاوازە لە ڕووی هزرەوە ، هەم لە ڕوی ئیسنادەوە ، هەروەها فەرموودەی (الماء طهور لا ينجسه شيء) واتە : ئاو پاکە وهیچ پیسی ناکات ، هەر چەندە لای (احمد) و (ابن حزم) و (يحيى بن معين) بە (صحيح) دانراوەو لای (الترمذي) بە (حسن) دانراوە ، بەلأم ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی فەرموودەکانی ترە ، کە دەفەرمووێ میز مەکەنە ئاوی ڕەوان و مەندەوە ، پاشان لە فەرموودەی تردا هاتووە (الماء طهور الا ما غلب على ريحه او طعمه) (رواه الدار قطني) واتە : ئاو پاکژە مەگەر بۆن و تامی بگۆڕێت.

بە کورتی : پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی کردووە ئاو بە میزو پیسایی پیس دەبێت بۆیە نابێ بکرێتە ئاوی ڕەوانەوە یان مەندەوە ، چونکە پیسایی وەکو ڕابردوو باسکرا نەخۆشی درم دەگوازێتەوە .

## پیس بوونی کیمیایی و زیانەکانی :

زۆر هۆکار هەیە لەوانەش وەکو باسکرا پاشماوەی کارگە و ترومبێلەکان و ماڵەوە ، زۆر لەو کەرەستانەی لە ماڵەوەن پیس بوونی کیمیایی دروست دەکەن ، ئەو پیس بوونە هەوا پیس دەکەن ، وەکو : ترشە باران و کون بوونی ئۆزۆن و بەرزبوونەوەی گەرمی زەوی ئاو ترش دەکات ، پاشان زۆر لەو کانزا قورسانەی بە ئاودا ڕەت دەبن لەکارگەکانەوەیە ، لەوانە پیسکەرە پلاستیکیەکان کە لە زۆر بواری ژیاندا بەکاردێن، ئەو پلاستیکانە شی نابنەوە ، ئێمە دەزانین پلاستیکەکان سامانی کشتوکاڵی لەناو دەبەن[١٨٢] .

---

[١٨٢] علوم الارض والبيئة للهواة/ ل:٢٣٣.

خـــواى گـــەورەش فەرموويـــەتى ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ﴾ . واتــە : شــارى پــاك ڕووەكــەكانى بــە ويســتى پەروەردگارى دەڕوێنێ ، ئەو شارەى كە پيسە ڕووەكێكى كەم نەبێت ناڕوێنێت.

لێـرەدا قورئـان خـاك بـە شـارو ئـاوەدانى نـاو دەبـات ، چـونكە ژێـر خـاك پـڕە لـە زيندەوەرى ورد لە بەكتریاكان و كەڕووەكان و كرمى گڵ خۆركـە (كرمـى زەوى) ، كـە وەكو گاسنێكى سروشتى خزمەت بە خاك دەكـەن و خـۆراك و گەشـە بـە ڕووەكـەكان دەدەن ، بەڵام كەرستە كيمايى و پاشەڕۆيە پيسەكان زيان لەو شارە دەدەن و لەژمارەى دانيشتووانى كەم دەكەنەوە ، بۆيە بێ بەرەكـەت دەبـن ، پێغەمبـەر (ﷺ) بـەر لـە زانستى نوێ ى ژينگە زانى هۆشيارى داوە لەئاخر زەماندا (تمطـروا ولا تنبـت الارض شيئا) رواه مسلم ، واتە : بارانيان بۆ دەبارێ و خاك هيچ ناڕوێنێت.

## جەنگ و داگیر كارى ولات وێران دەكات

﴿إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا ﴿٣٤﴾﴾ ، واتە : گەر پاشايان چوونە ناو شارێ داگيرييان كرد وێرانى دەكەن.

مێژوونووسانى ڕووسى بـۆ نمونـە دەنووسـن : كـاتێ شانشينى بـەريتانيا لـە جـەنگى جيهانيى يەكەمدا عێراقيان داگیر كرد ، كردارى لەناوبردنى شەڕ لە ولاتداو سياسەتى تـالان كـە دەسـەلاتى عوسمـانى و بـەريتانى ڕەچـاويان كـرد كارەسـاتێكى ئـابوورى نيشـتيمانى هەومانـد ، زۆر پـرۆژەى ئـاودێرى لـەكار كـەوت و دارو درەختـى زۆر لـە باخچە ميوەييەكانـدا بڕا ، دەسەلاتدارانى عوسمانى هەزاران عێراقييان بـۆ خزمـەتى سوپا راپێچ كرد ، (٩٠٠٠٠) جوتيارى عێراقى بە ناچارى برانـە فەيلەقـەكانى (كـار)ى بەريتانى ، كە جۆرەها بنكەى سەربازييان دامەزراند ، بەهۆى كەمبوونەوەى دەسـتى كرێكـار ڕووبـەرێكى فراوانـى ويلايـەتى (موسـڵ) بەڕێـژەى (٥٠٪) گـۆڕا بـە خـاكێكى خوێناوك ، پچڕانى پەيوەندى بازرگانى ئاسايى نێوان عێـراق و ولاتـە دراوسـێيەكانى

بوو بەهۆی کەمبوونەوەی کەرستە خاوە پێویستییەکانی دام و دەزگای پیشەسازی ناوخۆیی و خاوەن پیشەکان ، دانیشتووان تووشی کەمی خۆراك و کەل و پەلی بەکاربردن بوون ، نرخی شت و مەکەکان بەرز بۆوە ، بو بە (٢-٥) قات و باج و قاجاخی فراوانتر بوو.

لە ئاکامی شەڕو تالآنی سەربازی برسێتی فراوان بوو ، کە هەرگیز عێراق بەرچاوی نەکەوتبێت ، بۆ نموونە : سالی (١٩١٧ – ١٩١٨) برسێتی بە تەنیا لە (نەینەوا)دا (١٠٠٠٠) کەسی کوشت ، پەتای کولێراو تیفۆئیدو نەخۆشی تر دەیان هەزار کەسی لەناو برد ، لە کۆتایی شەڕدا خەلك شوێنەکانیان بەتەواوی چۆل کردبوو..)[١٨٣].

لە دوای پەیمانی لۆزان و دابەشکرانی کوردستان بەسەر (٤) پارچەداو داگیرکرانی ، کوردستانی گەورە لە کاولکردن و لەناوبردن درێخی لەگەلدا نەکرا ، تا ئێستاش ئەو تێکدانە بەردەوامە لە ڕووی دینی و سیاسی و ئابوری و کلتوری و زمانی و مێژووی و ژینگەیی یەوە ، بۆ ئەوەی کوردستان بە تەواوی وێران ببێ و دەسەلآتی کوردی بە تەواوی لەناو ببرێت و بە داگیرکراوی بمێنێتەوە و خێرو بێری ولآت بۆ ئەوانە بێت .

بەم شێوەیە کوردستانی گەورە دیمۆگرافیاو جوگرافیای بە تەواوی دەستکاری دەکرێت و تێك دەدرێت ، چونکە ئەمە پیشەی داگیرکار و ستەمکارانەو هەروا بووە ، مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە ! (ان الملوك اذا دخلوا قرية افسدوها) (النمل ٣٤) واتە : کاتێ پادشایان ولآتێ داگیر دەکەن تێکی دەدەن و وێرانی دەکەن.

---

[١٨٣] تأريخ الاقطار العربية المعاصر / ج١ / دار التقدم – موسكو (د.ر فويليكوف) / ل: ٢٨٧- ٢٨٨.

# بەشی نۆیەم

**ئیعجازی (٨٠) چەند چارەسەریێ بۆ کەمبوونەوەی پیس بوون**

**ئیعجازی (٨١) پەروەردەی ژینگەیی**

**ئیعجازی (٨٢) کۆتایی هاتن بە ژینگەی زەوی**

## چەند چارەسەرێکی قورئانی و ژینگەزانی بۆ کەمکردنەوەی بڕی پیس بوون :

١. ئامۆژگاری لە بەکارهێنانی سەرچاوەکاندا : وەکو بەکارهێنانی ئاو و کارەباو سووتەمەنی و کەرستە خاوە سروشتییەکان وەکو پەڕو کاغەزی ئاسایی و تەندروستی کە دارستانەکان لەناو دەبات ، خوای گەورە فەرموویەتی .

٢. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾﴾ ، واتە : خوا ڕێنومایی کەسێ ناکات زیادەڕەوکەرو بەدرۆخەرەوەیە .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الاقتصاد نصف العيش) (رواه الخطيب) ، واتە : مام ناوەندی لە خەرجکردندا نیوەی بژێوی ژیانە . بەو پێیە بە هۆی زیادە ڕەوی نیوەی سامانە نیشتیمانی یەکان بەفیڕۆ دەڕوات و ژینگە پیستر دەبێت.

٣. بەکارهێنانەوەی کەرستەکان : وەکو پاکژ کردنەوەی ئاوی لەدەست چوو ، بەکارهێنانەوەی بەرهەمە پلاستیکیەکان و کانزاییەکان و کاغەزەکان ، لە وڵاتانی تەکنەلۆژیدا حاوییەکانی پاشماوەکان دابەش کراون ، زبڵدانی کەرەستە پلاستیکیە کان و زبڵدانی شوشە و زبڵدانی پەڕو کاغەز و زبڵدانی کارتۆن ، هەموو ئەو حاویانە سەر بەخۆن ، تا جارەکی تر بەکاربێنرێنەوە و شتی تازەیان لێ دروست بکرێتەوە ، تا سامانی وڵات بەفیڕۆ نەڕوات و ژینگەش پیس نەبێت.

لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ئەو گازە سروشتییە بەکاردێ بۆ سووتەمەنی کە لە ژێرابەکاندا خڕبۆتەوە لە مادده ئەندامی یەکان ، لە هەموو ماڵێکدا دەزگا هەیە غازی سروشتی لە پاشماوەو پیسایی مرۆڤەکان و ئاژەڵان بەرهەم دێنرێت !

سەیر بکە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) بە تەنگەوە بووە لە بەفیڕۆنەدانی سامانەکان و کەرستەکان و فەرمانی کردووە سوودیان لێ وەربگیرێ و فڕێ نەدرێن ، بۆ نمونە : پێغەمبەر (ﷺ) بەلای مەڕێکدا ڕابرد مردار بووبو ، فەرمووی : (هلا اخذتم اهابها فد بغتموه فانتفعتم بە؟) واتە : ئەوە بۆچی پێستی ئەوەتان هەڵنەدەگرت و

خۆشتان نەدەکردو سوودتان لێ وەرنەدەگرت؟ ، وتیان ئاخر ئەوە مردارە ، فەرمووی : (انما حرم اکلها) (رواة الجماعة) ، واتە : تەنیا خواردنی حەرامە ، (ابن عباس) لە ڕاست حەرامی مرداره فەرمووی (الا ان یکون میتة) وتی: (تەنیا گۆشتەکەی حەرامە ، پێست و مەشکەو ددان و ئێسقان و موو خوری ئەوە ڕەوایە) ، (ابن منذر) گێڕایەوە[181] .

(١) پێویستە لەسەر هەموو کەسێ بەر لە هەموو کەسێ و بەر لەوەی داوای چاك بوون لە خەڵکی بکات خۆی چاك بکات ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ ﴾ . پێویستە ئەو نەریتە ناشیرینانەی لەناو ئێمەدا بوون بە مۆرکێکی کۆمەڵایەتی بیان گۆڕین ، وەکو پیسکردنی ژینگە بە گۆرانی و مۆسیقای تیژو بەرزو ناشەرعی ، بەکارهێنانی کارەبای زیادو گڵۆپ و ئامێری کارەبایی زیاد لە پێویست ، بەفیڕۆدانی ئاو و نەگرتنەوەی بەلۆعەکان و شوشتنی ئۆتۆمبێلەکان ، یان گەرماو کردن بە (بانیۆ) کە ئاو زۆر خەرج دەکەن ، سەرباری ئەمەش ئیمڕۆ بتڵی لاستیك بەکاردێ بۆ ئاو خواردنەوە ، یان قاپ و کەوچکی پلاستیکی کەدوای بەکارهێنان فڕێ دەدرێن ، هەموو ئەوانە زیادە ڕەوین و زیان لە سامانی وڵات دەدەن و ژینگە پیس دەکەن ، دەبێ خۆمان لەو ئامێرانە بپارێزین ، فلۆرو کلۆرو کاربۆن بەکاردێنن و ئەو کەرەستانە بەکاربێنین لەگەڵ ژینگەدا دۆستن .

(٢) ڕواندنی دارو درەخت و واز هێنان لە بڕینی دارو بارو کوشتنی زیندەوەرە سوود بەخشەکان و ڕاوکردنی فڕ تێ خەر ، دارو درەختەکان سی یەکانی زەوین ، هەوا لە گازە بەزیانەکان پاکژ دەکەنەوە ، بۆیە پێویستە پەرە بەچاندنی نەمام بدەین و بیان پارێزین و واز لە بڕینی دارستان بێنین بەتایبەتی دارو درەختی چیاکان ، حکومەت دەبێ سنووری بۆ ئەو مەترسییانە دابنێ و سووتەمەنی دابین بکات .

---

[181] فقه السنة / السید سابق/ ج١/ ل:١٥.

(الطبراني) گێراویەوە (ابن عباس) وتویەتی : (نهى عن قتل كل ذي روح الا ان يؤذي) واتە : قەدەغەی كردووە هەرچی زیندەوەرە بكوژرێ مەگەر زیان بەخش بن ، وەكو (دوو پشك و مارو تەپۆو مێشولەو سن و مڵە ...هتد) چونكە گیانداران میللەتێكن وەكو خۆمان ڕاگری هاوسەنگی ژینگەن لە زەویدا .

**( پەروەردەی ژینگەییی ) و ( هۆشیاری ژینگەیی )**

Environmenttal Education

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ﴾

پەروەردەی ژینگەیی : كۆمەڵێ زانست و تیراساو بەهای پێویستە بۆ حاڵی بوون لە پەیوەندی نێوان قوتابی و ئەو ژینگەیەی لەناوی دا دەژیت ، كار دەكەنە سەر ڕەفتاری و ئارەزوو و بایەخی دەخەنە گەڕ بۆ سوور بوون لەسەر پاراستنی لە پێناو خۆی و كۆمەڵگاكەی دا .

بێگومان پەروەردە میكانیزمێكی ڕەهەند دوورە لە دروست كردن و ئامادەكردنی وەچەكاندا بە پەروەردەیێ لەگەڵ بەها ڕەسەنەكاندا تێك دەكاتەوەو لای وەچەكان چەند چەمكێكی ڕەوشتی دادەمەزرێنێ هانیان دەدات ڕێزی ژینگە بگرن ، پەروەردە هەموو دام و دەزگاكان دەگرێتەوە : مزگەوت ، قوتابخانە ، خێزان ، كە لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە وەچەكانی لێوە دەردەچێ و پێشكەش بە كۆمەڵگا دەكرێت، بەتایبەتی ئیمرۆ كە جیهان لە مەترسی دایەو هەڕەشەی مەرگ لە ژیان دەكات ، دەبێ هەموو لایەنێ شان بەشانی یەك بە گەل و حكومەتەوە بەرەنگارییان ببینەوە لەسەر ئاستی ماددی وەكو : (پیس بوونی هەواو ئاو و خاك و ، پیس بوون بە تیشك و ڕوناكی و ژاوە ژاو و گرەگرو پیس بوونی خۆراك ...) ، لەسەر ئاستی مەعنەوی وەكو : (پیس بوونی ڕەوشتی و ڕۆشنبیری و سیاسی و كۆمەلایەتی ...) ، بێگومان جۆری دووەمیان

مەترسیدارترین خاڵیانە لە پیس کردنی ژینگەدا ، بۆیە پێویستە حکومەت و گەل ئاورێ لەو خاڵانە بداتەوەو بەهەندیان وەربگرێ و خۆیان لێ نەدزێتەوە .

ئیمڕۆ لە جیهاندا زۆر دام و دەزگای تایبەتی هەیە گرنگی بە ژینگەو پەروەردەی ژینگەیی دەدەن ، وەکو :

- ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO).
- ڕێکخراوی کاری دەولی .
- ڕێکخراوی زانستی چاودێری هەوایی.
- ڕێکخراوی خۆراك و کشتوکاڵی دەولی (FAO).
- ڕێکخراوی راوێژکاری دەریایی نێوان حکومەتان.
- ڕێکخراوی یونسکۆ (unisco) .
- ڕێکخراوی یونیسێف ( بۆ منداڵان) (unicif) .
- ئاژانسی وزەی ئەتۆمی.

کەواتە پەروەردەی ژینگەیی زۆر بایەخدارە .

## گرنگی پەروەردەی ژینگەیی

پەروەردەو هۆشیاری ژینگەیی فەلسەفەکەی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو مەترسیانەیە مەمەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ ژینگەدا پەیدای کردووە ، وەکو :

٤. زۆربوونی دانیشتووان ، کە بەرەو (٧) ملیار کەس دەڕوات ، ئەمەش فشارێکی گەورە لەسەر ژینگە پەیدا دەکات بۆ پەیداکردنی خۆراك.
٥. زەوییەکی زۆر بەرەو بە بیابان بوون دەڕوات ، ساڵانە بڕە خاکێکی فراوانی عێراق و سوریاو لیبیاو میسرو وڵاتانی تر دەگۆڕێ بە بیابان.

٦. دارو درەختی چیا و گردەکان وردە وردە دەبڕدرێ بۆ سووتاندن و پیشەسازی . ئەمەش بۆتە هۆی راماڵینی خاك و زۆربوونی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ، یان شوانەکان ئاگری تێ بەر دەدەن.

٧. گیاندارانی کێوی ، وەکو کەو و سوێسکەو داڵ و کوندە پەپۆ و کۆتری شاخی و کەروێشك و شێرو پڵنگ و ئاسکە کێوی و ...هتد ، بەرەو لەناوچوون دەچن ، درەختەکانی وشکانی وردە وردە کەم دەبنەوە ، بۆ نمونە بزربوونی کەمتیار لە (ئوسترالیا) بووە هۆی زۆربوونی کەروێشك کە کێشە بۆ سەر کشتوکاڵ پەیدا دەکەن .

٨. دەرمانی مێرووکوژ و بژار کوژ بێ تام بەکار دەبرێت و زۆر لە زیندەوەرە بە سوودەکان قڕ تێ دەخات و خاك پیس دەکەن .

٩. خەڵکی لە لادێ وە بەرەو شار دەچن و فشار دەخەنە سەر شارەکان ، دیارە شارەکانیش پیسن و ئەمەش مەترسی زیاتر دروست دەکات بۆ سەر ئادەمیزاد.

١٠. کارگە و مەکینە و ترومبێلەکان ئەوەندە زۆرن لە حیساب بەدەرن ، هەموو ئەوانە هەوا پیس دەکەن .

١١. ئاوی و دەریا و ڕووبار و ئۆقیانووسەکان پیس بوون بەهۆی نەوت و پیشەسازی و پاشماوە ناوکی یەکان ...هتد ، هەموو ئەوانە مەترسییان بۆ سەر تێك چوونی هاوسەنگی ژینگە دروست کردووەو ژیان بەرەو ئافارێکی مەترسیدار دەبەن .

١٢. هەموو ئەو کێشانە گرنگی پەروەردەو ڕۆشەنبیری ژینگەیی دەردەخەن لەم چاخەدا ، وەکو لە قورئان و سوننەتدا ئاماژەیان بۆ کراوەو فەرامۆش کراون .

## ئامانجەکانی پەروەردەی ژینگەیی

بەو پێ و دانگەی باسکرا ئامانجەکانی پەروەردەو هۆشیاری ژینگەیی لەم چەند خاڵانەدا کورت دەبنەوە :

١. ئاشنا کردنی تاك و کۆمەڵگەو خێزان بە ژینگەو سیستەمەکەی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ تەنە زیندووەکان.
٢. یارمەتی دانی مرۆڤ بۆ بەدەست هێنانی هۆشیاری گشتی لە ڕێگای ڕوون کردنەوەی چەمکە سروشتییەکان و حاڵی بوون لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ژینگەو ، چۆن بە دروستی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.
٣. چاوگە سروشتییەکان چاوگی هەموو چالاکیەکانی مرۆڤن و پێداویستییەکانی ژیانی دابین دەکەن .
٤. خراپ بەکارهێنانی چاوگە سروشتییەکان ئاسەواری خراپی ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونی لێ دەکەوێتەوە .
٥. ڕاست کردنەوەی ئەو بڕوایە هەڵەیەی دەڵێ : سروشت ئۆقیانووسێکی لە بن نەهاتووەو تەواو نابێت !
٦. پێویستە لە ڕێگای هۆشیاری ئایینی و هاریکاری لەگەڵ تاکەکان و کۆمەڵگا و ڕێکخراوە دەوڵەتی و جیهانیەکان و ناوخۆییەکان و چارەسەری هەمیشەیی و کرداری بخرێتە بەرنامەوە بۆ چارەسەرکردنی قەیرانە هەنووکەییە ژینگەییەکان
٧. پێویستە شیکاری زانستی ورد بکرێت بۆ ئەو هەڵسوکەوتانەی زیان بە هاوسەنگی ژینگەیی دەگەیێنن ، وەکو ڕاوی گیاندارانی کێوی بە خەستی بەبێ بەزەییا ، کەبۆتە هۆی قڕ تێ کردنی هەندێکیان ، وەك خاك بەهۆی بڕینی دارستانەکان و سوتاندنی باخچەو دارستانەکان و لابردنیان تووشی دا خوران بووە.

بێگومان کوردستانی گەورەش کە بەدەست ڕژێمە داگیرکەرەکان دەستاو دەستی پێکراوە ئەویش بەشێکی گەورەی پیسبوونی بەرکەوتووە ، بەهۆی ڕاگواستن و کوشتن

و بۆمباران كردن و كیمیا باران و سووتاندنی دارستانەكان و ...هتد ، پاشان دوای ئازاد كردنی بەشێكی كوردستانی داگیر كراوی بەعسیش ، كورد هاتەوە سەر ماڵ و خاكی خۆی ، ڕاستە ئاوەدانی تا ڕادەییەكی باش خەمی لێخوراو ، بەڵام ئاوڕێكی باش لە چاككردنەوەی ژینگەی كوردستان نەدرایەوە ، ئێستا خۆمان بەردەوامین لە پیستركردنی ژینگەكەی بە بڕینی دارو درەخت و ڕاوی بێ سنوورو بەكارهێنانی زۆری ئاوی ژێر زەوی و ...هتد ، ئەمەش ئەگەری پیسبوونی ژینگەی كوردستان زیاتر دەكات و دێتە ناو لیستی ولأتە ژینگە پیسەكانەوە ، سەرباری ئەوەش ترۆمبێلی مۆدێل كۆن هەرماون و كاریان پێ دەكرێ و بێ شوماریش ترۆمبێل هاوردەی كوردستان دەكرێن ، ئەمەش زیاتر فورمان بۆ دەگرێتەوەو ڕێژەی پیس بوون بە تایبەت لە شارەكاندا پتر دەكات ! بۆیە پێویستە لەسەر خەڵكی كورد پەروەرو موسڵمان و حكومەت ئاوڕێكی جددی لەم كێشەیە بداتەوە و سنووری بۆ ئەو پیس بوونە دابنێت.

## پەروەردەی ئیسلامیی ژینگەیی

پەروەردە (التربیة) وشەیێكی ئیسلامی یە لە وشەی (الرب) وەرگیراوە ﴿ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَ ﴾ ، واتە : ئەو پەروەردەكەری منە باشترین داڵدەدەری منە ، لێرەدا یوسف (علیە السلام) پۆتیفار (كە عەزیزی میسرە) لەسەر دەمی ئامون وتێلی چوارەم (ئەخناتون) دا بە پەروەردەكەرو مشوور خۆری دەزانێت . یان خوا فەرموویەتی : (وقل رب ارحمهما كما ربیانی صغیرا) (الاسراء : ٢٤) واتە : بڵێ : پەروەردگار بەزەییت بە دایك و باوكمدا بێتەوە چۆن منیان بە بچووكی و منداڵی پەروەردە كرد.

(الراغب) لە (مفردات)دا دەڵێ : (الرب) لە بنەڕەتدا لە (التربیة)ەوە هاتووە ، واتە : پەروەردە كردن و گەشە دان بە شتێ لە قۆناغێكەوە بۆ قۆناغێكی تر تا دەگاتە كامڵ

بــوون، دەگــوترێ (ربــه – وربــاه – وربیــه) ،﴿رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ٢٤﴾

بێگومان ئیسلام هەموو بەشەکانی پەروەردەی لە خۆ گرتووە ، لە پەروەردەی ئیمانی و ڕەوشـتی و هـزری و دەروونـی و جەسـتەیی و کۆمەڵایـەتی و سێکسـی و ژینگـەیی ...هتـد، لـە ڕێگـای مەشـقەوە ، لـە ڕێگـای نـەریت و ئامۆژگـاری و تێبینـی دانـان و سزادانەوە، بڕوانە (تربیة الاولاد في الاسلام / د. عبدالله ناصح علوان).

ئیسـلام زۆر گرنگـی بـە پـەروەردەی ژینگـەیی داوەو فـەرمانمان پـێ دەکـات ژینگـە بپـارێزین و خـاوێنی ڕابگـرین و زیـادەڕەوی و خراپـەکاری و کاولکـاری تێـدا ئـەنجام نەدەین.

پەروەردەی ژینگەیی لە ئیسلامدا وەکو (عادل مشعان) پێناسەی کردووە ، بریتی یە : (لە چالاکی مرۆیی کە هەڵدەستێ بە هۆشـیار کردنـەوەی تاکـەکان لـە ڕاسـت ژینگـەو پەیوەندی نێوان پێك هاتەکانی و هۆشیار کردنەوەیان ، لەڕاست بەهاو کارامەییەکانی ژینگــەو گەشــەپێدانی لەســەر بنــەمای پڕەنســیپ و ڕای ئیســلام بەرامبــەر ئــەو مەبەستەی مرۆڤ لە پێناوی دا دروست کراوەو داخوازییەکانی پێش کـەوتنی مرۆڤـی هاوسەنگ).

ئیسلام زۆر گرنگی بە پاکژی داوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرة ٢٢٢ واتە : خوا ئەوانەی خۆش دەوێ تۆبە دەکەن و خۆیان پاکژ ڕادەگرن ، ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤﴾ المدثر ٤ ، واتە : بەرگت پاکژ ڕابگرە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (تنظفوا فان الاسـلام نظيـف) رواه ابـن حبـان، واتـە : پاکژ بن ، ئیسلام پاکژە. فەرمان دەکات نابێ کاول کاری و تێك دان لەژینگەدا بکرێ ،

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ (ڕابردوو ڕاڤە کراوە) .

پێغەمبەر (ﷺ) بەلای (سعد)دا ڕەت بوو دەست نوێژی دەگرت ، فەرمووی : ئەو زیادە ڕەوییە چییە؟؟ وتی : بۆ لە دەست نوێژ گرتندا زیادەڕەوی هەیە ؟ فەرمووی : (نعم وان كنت على نهر جار) رواه ابن ماجة ، واتە : بەڵێ گەر لەسەر ڕووبارێکی ڕەوانیش بیت.

ئیسلام گەورەیی و بەرپرسیاری بە مرۆڤ داوە لە زەوی دا ، کە دەبێ مافەکانی یەکتری و ژینگە بپارێزێت و دەستی کاولکارییان لێ بکێشێتەوەو ستەمکاری نەکات لە ناوی دا و خوێن نەڕێژێ بە حەقی خۆی نەبێت و وەچە لەناو نەبات و گیانداران و ڕووەکەکان قڕ تێ نەخات . ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ ، واتە : کاتێک پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو : من خەلیفەو پێغەمبەرێ لە زەویدا دروست دەکەم ، وتیان : ئایا کەسێ دروست دەکەی خراپەکاری تێدا بکات و خوێنی تێدا بڕێژێت ، ئێمە تۆ بە سوپاسەوە بێگەرد ڕادەگرین و بە پیرۆزت دادەنێین ، فەرمووی : ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن . خودا هەرچی لە زەوی و ئاسماندایە بۆی دەستەمۆ کردووە لە زەوی و خاك و ئاو و هەواو ڕووەك و تیشك و كانزا و بەهرەکان و خۆرو مانگ و ...هتد ، فەرمانی پێ کردووە زەوی ئاوەدان بکاتەوە بە بیناسازی و کشتوکاڵ کردن و نەمام ڕواندن و چاك کردنی زەوی .

﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ ﴿٦١﴾ ﴾ ، واتە : خوایە لە زەوی دروستی کردوون و ئاوەدان کردنەوەی تێدا بە ئێوە سپاردووە .

﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾ ، واته : ئەو کەشتی بۆ ڕام کردوون تا بە یاسای ئەو بەدەریادا بڕوات ، ڕووبارەکانی بۆ ڕام کردوون خۆرو مانگی بەردەوام بۆ ڕام کردوون ، شەو و ڕۆژی بۆ ڕام کردوون ، چی بخوازن پێ ی داون ، گەر (نیعمەت) بەهرەکانی بژمێرن ناتوانن.

(بوخاری) لە (الادب المفرد)دا لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ی گێڕاوەتەوە (إذا قامت على احدكم القيامة وفي يده فسيلة فليغرسها) واتە : گەر قیامەت بەسەر یەکێ لە ئێوەدا هات نەمامێکی لە دەست بوو بابیچێنێت. (اتقوالله في هذه البهائم المعجمة فاركبوها صالحة وكلوها صالحة) واتە : لە ڕاست ئەو چوار پێیانە لە خوا بترسن بە باشی سواریان ببن و بەباشی بیانخۆن.

قورئان ئاماژە دەکات زینگە بە هاوسەنگی دانراوە ، دەبێ ئەو هاوسەنگی یە بپارێزرێت ﴿ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ ﴾ الحجر: ١٩

**پێویستە لەو پەروەردەیەدا ئەمانە بخرێتە بەرنامەوە :**

(١) پاکژی هەوا بپارێزرێ.

(٢) سامانی ئاوی پاك ڕابگرێت.

(٣) سامانی رووەك پاك ڕابگرێت.

(٤) سامانی ئاژەڵی پاك ڕابگرێت.

(٥) چاودێری سامانی کانزایی و ناکانزایی بکرێت.

(٦) ڕێگاوبان و شەقامەکان و کوچەو کۆڵانەکان پاك رابگیرێن.

(٧) مزگەوتەکان و دام و دەزگاکان پاك رابگیرێن.

(٨) پارێزگاری جەستەیی و دەروونی و هزری بکرێت.

(٩) هێمنی و ئارامی بایەخی پێ بدرێت.

خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا ﴾ ، واتـە : خراپـەکاری مەکـەن لـە زەویـدا دوای چـاك بـوونی ، پاشـان ژینگـە بوونـەوەرێکی زینـدووە وەکو مـرۆڤ هەست و نەستی هەیـەو خواپەرستی دەکات ، کردەوە چاك و خراپەکانی مرۆڤ کاری تێ دەکات و ئـەویش کاردانـەوەکانی بـە پێـی کردەوەکـانی مرۆڤـە. ﴿ وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ ، واتـە : ئەگەر خەڵکی شارەکان بڕوابێنن و خۆ بپارێزن لە تاوانەکان دەروازەکانی بـەهرەکان لە ئاسمان و زەوی دا بەڕوویاندا دەکەینەوە ، بەڵام ئەگەر بەدرۆیان خستەوە ئێمەش بەهۆی کردەوەکانی خۆیان گرتمانن.

(لـورنس کولتـون ووکـو) پسـپۆڕی دارسـتان و ڕووەك و فسـیۆلۆجیا لـە ئـەمریکا دەنووسێ : زیاتر لەوەش دەتوانین باسی چاودێری و سەر مەشقی خوایی بکەین ، کە لە گێڕانەوەی بە پیتی خاکدا دەبینرێت لـە دارسـتانە تازەکانـدا ، کـە دەسـتی مـرۆڤ نەچۆتە ناوییەوە دارو درەختەکان زۆر دەبن و وەچە لەدوای وەچە بـەدوای یـەکتردا دێن تا لە ئاکامـدا ئـارام دەگـرن و دارو درەختـی تایبـەتی ئـەدگاری پـێ دەدەن و زۆر دەبن تا خوا حەز دەکات ، مەگەر دەستی مرۆڤیان پێ بگات ، یان ئاگری تێ بەربدات ، یان بروسکە لێی دەدات ، دەست وەردانی مرۆڤ لەو دارستانە سروشتیە بە چاندنی و لەدەست دانی بە پیتییەکەی دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی بە پیتییەکەی بـۆ گەشـەی درەختەکان ، ئەوکاتە دارەکان و خاك لەدەست دەدەین و لافاو ڕوودەدەن .

مرۆڤ پارەیەکی زۆر دەخاتە گەڕ تا لە مەترسی لافاو ڕزگاری بێ بـە دروست کردنـی بەنداوە گەورەکان ، بـەڵام ئـەو بەنداوانـە چارەسـەرێکی کـاتین لەبەرامبـەر هێزێکـی

گەوردەدا ، کە نە تاوێرو نە کۆنکرێت ناتوانێ بەرەوستی بێت ، پێویستە چارەسەری ڕاستەقینەی کێشەی لافاوەکان لە چاوگەوە بێت ، ئەم چارەسەرە بە گێڕانەوەی دارو درەختەکان دەبێ بۆ زەوی ، ئەمە کارێکە سروشت خۆی پێوەی هەڵدەستێت ، ئەو خاك و کێڵگانەی بەهۆی کەم پیتی ڕووەکی نەماوە لەخۆوە گژو گیاو درەخت و نەمامی لێ دەڕوێتەوەو زەوی بە پیت دەکەنەوە .

لەناوچەی (بەدمونت) لە ئەمریکادا (٢٥) ساڵ بەسیەتی بۆ پێك هێنانی چینەکی نوێ لە کەرەستەی پەینی کەڕووی خاك دابپۆشێتەوەو بەپیتی بکاتەوە ، تا لەناوچە فرە ساردەکاندا ، کە کەرستەی ئەندامی لە ناویاندا شی بوونەوەیان لاوازە پێك هاتنی ئەو چینە (٥٠) ساڵی دەوێت ، تێبینی دەکرێت ئەو خاکەی بەو ڕێگایە چاك دەکرێت ، وەکو سەردەمی جاران ناگەڕێتەوە بۆ چارەکردنی مەترسییەکانی لافاو ، هەر چەندە چاکتر لە جاران باش دەبێت .

لەو بارەوە (جوپ) دەڵێ : (سروشت زیادەڕەوی نازانێت ، ئەو هەمیشە ڕاستگۆو مەزن و سەختە ، هەمیشە ڕاستی پێکاوە ، هەڵەکان تەنیا لەلای خۆمانەوە ڕوودەدات ، سروشت دژ بەبێ توانایی دەجەنگێ و نهێنیییەکانی تەنیا بۆ ئەو کەسانە والآ دەکات بە توانان و دڵسۆزن و تەقوا کارن).

(ئیسحاق واتسن) دەڵێ : (سروشت نامەی کراوەی خۆی هەڵدەگرێت بە سوپاس و شکۆوە خوا بێگەرد ڕادەگرێت) .

ڕووەکناسی ناودار (ئاسا جرای) لە وتارەکەیدا لە زانکۆی (ییل) لە ساڵی ١٨٨٠دا ڕایگەیاند (ئەوەی زانستەکان دەیگوازێتەوە لە جیهانی نادیارەوە بەرەو جیهانێکی سروشتی لە بڕواو ئیمان کەم ناکاتەوەو دژایەتی ناکات ، زانست بەهەمان ڕێڕەوی سروشتدا دەڕوات ، بۆیە کاری زانست گێڕانەوەی دیاردە گەردوونیەکانە هەر لە ساتی دروست بوونیەوە بۆ تواناو شکۆی کردگار) .

(بول) دەڵێ : (توانای خوا لە هەموو شتێکدا ڕەنگ دەداتەوەو هەموو شتێ بە توانای ئەو هەڵدەستێت)، (فیلیس) بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە دەڵێ : (حەق دەرکەوت هەر لەو کاتەوە خوا گەردوونی دروست کرد بەڵگەو توانای شکۆی لە هەموو ئەو شتانەدا دەردەکەوێ کە هەستی پێ دەکرێ و هزر پەی پێ دەبات) .

قورئـانیش فەرموویـەتی : ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ ﴿٢٨﴾ ﴾

لەوەدا کە باسکرا بۆمان دەردەکەوێ کە پەیوەندییەکی قوڵی گیانی و جەستەیی لەنێوان مرۆڤ و ژینگەدا هەیەو مرۆڤ ئەندامێکی کاراو سەرەکییە لەو ژینگەیەداو کاری تێ دەکات و ئەویش کار لەو دەکات ، بۆیە بەرژەوەندی مرۆڤ لەوەدایە پارێزگاری لە ژینگەکەی بکات و بەشێوەیەکی دروست سوود لە بەهرەکانی وەربگرێت ، تا ئەو سوود لێ وەرگرتنە بە قازانج بگەڕێتەوە بۆ سەر خۆی و ژینگەکەی ، ژیانێکی دروستی دوور لە کێشەی بۆ بێنێتە دی و بتوانێ بەردەوام سوود لە بەهرە زەمینی و ئاسمانەکان ببینێت.

(کۆتایی ژینگە)ی زەمینی

﴿ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ ﴾ ، واتە : خوا دروست کەرو گێڕەرەوەیە .

[٩٢] (ما عندكم ينفذ وما عند الله باق) (النحل ٩٢) ، واتە : ئەوەی لای ئێوە لە زەویدا کۆتایی پێ دێ و دەبڕێتەوە ، ئەوەی لای خوایە بەهرە گیانیەکان دەمێنێتەوە .

﴿ إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴿٧﴾ ﴾

، واتە : کاتێ خۆر پێچرایەوە ، کاتێ ئەستێرەکان تاریك بوون ، کاتێ چیاکان بوونە تۆز بە هەوادا ، کاتێ هەورەکان لەکار کەوتن ، کاتێ درندەکان کۆکرانەوە ، کاتێ دەریاکان بوون بە ئاگر ، کاتێ دەروونەکان جووت بوونەوە .

(ئەدوارد کیلەر) دەڵێ : ئەو بیرو بڕوایەی لەو گەردوونەدا بڵاوە ئەوەیە : هەموو شتێ لە گەردووندا سەرەتاو بڕانەوەی هەیە ، زەوی بەر لە (٥) ملیار ساڵ لە (سەدیێکی گازی) دروست بووەو بەسەدیمی خۆری ناسراوە (solar Nebulla) ناوکی سەرەتایی ئەستێرەکان و هەسارە گەڕۆکەکان لەو پێك دێت.

دوای (٢) ملیۆن ساڵ ژیان لەسەر زەوی دەرکەوت و زۆر زیندەوەر سەریان هەڵدا ، زۆربوون و گەشەیان کرد پاشان بڕانەوەو شوێنەوارییان لەدوای خۆیاندا جێ هێشت وەکو بەردینێك ، کە ئاماژە بە بوون و شوێنیان دەکات لە مێژوودا ، چەند ملیۆن ساڵێکە مرۆڤ دەرکەوتووە و لاپەڕەیێکی تازە لەمێژووی زەویدا دەرکەوت ، گومانی تێدا نیە ڕۆژێ دێ خۆر کۆتایی پێ بێ و بوونی مرۆڤ دەبڕێتەوەو ئاسەوارەکانی بەجێ دێڵێت لە زەویدا ، بەلاّم هیچیان بە ئەندازەی ئەوە گرنگ نیە ئەو ژینگە بپارێزین کە ئێمەو وەچەکانمان و مرۆڤی داهاتوو تێ یدا دەژیت و بەکەڵکی ژیانی مرۆڤ دێت[١٨٥] ، پاشان مرۆڤ و گیانداران و ڕووەکەکان بەرەو ژینگەیێکی تر دەڕۆن کە ژینگەی (ئەتیر)ە ، واتە : جیهانی گیانی یە ، بەعەرش و کورسی و بەهەشت و دۆزەخەوە .

ئەو گێڕانەوەیەی دەڵێ : (هەموو زیندەوەران دوای حەشرو لێپرسینەوە دەبنەوە گڵ) ڕاست نییەو لە هیچ فەرموودەو ئایەت و گێڕانەوەیەکی دروستدا نەهاتووە ، ڕاستە لە کتێبی (البدور السافرة في امور الاخرة/ جلال الدين السيوطي/ ل:٢٤٧)دا کۆمەڵە گێڕانەوەیێك هاتووەو هەندێکییان پلەی (صحیح) یان پێ دراوە ، بەلاّم ڕاستر وایە

---

[١٨٥] جيولوجيا البيئة / ل: ٢٩.

گیانــەکان (ڕوح)لــەناو ناچــن ، بــۆ نمونــە هــاتووە : [ (الحــاكم) لـة (ابــن عمــر) طیَراویـةوة : (اذا كان یوم القیامة مد الارض مد الادیم وحشر الله الخلائق الانس والجنس والدواب والوحش ، فاذا كان ذلک الیوم جعل الله القصاص بین الدواب، قال لها : كوني ترابا ، فیراها الكافر ، فیقول یا لیتنی كنت ترابا ) ] ، واته : گەر قیامەت هات خوا زەوی وەكو چەرمێك ڕادەخات دروست كراوان لە مرۆڤ و جنۆكەو گیاندارو درندەكان زیندوو دەكاتەوەو تۆڵە لە نێوان گیانداران دەستێنێ ، پاشان پـێ یان دەفەرمووێ : ببنەوە خاك ، كاتێ بێ بڕوایان ئەوە دەبینن دەڵێن : خۆزگە ئێمە خاك باین.

كەچی لە بەرامبەردا فەرموودەی زۆر هاتووە پێچەوانەی ئەم گێڕانەوەیانەن و دەری دەخەن زیندەوەران نا مرنەوە ، بەڵكو زیندەوەرانی سوود بـەخش لـە بەهەشـتدان و خزمـەتی موسـڵمانان دەكـەن و زینـدەوەرانی زیـان بـەخش لـە دۆزەخـدان و ئـازاری تاوانبـاران دەدەن وەكـو (كـل مـؤذي فـي النـار) اخرجـه الخطیـب ، واتـه : هەرچـی زیندەوەری ئازار دەرە لە ئاگردایە .

پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕاست سزای ئەوانەی ژینگە پـیس دەكەن و خراپـەكاری دەكـەن لــەوێرانكردن دارو درەخــت بــڕین و ســووتاندنیان ، گیانــداران و زینــدەوەران بــە ئەنقەست دەكوژن ، فەرموویەتی : (من قتل عصفورا عبثا عج الى الله یوم القیامة ، یقول ، یا رب ان فلانا قتلني عبثا ولم یقتلني لمنفعة) اخرجه النسـائي. واتـه : كـێ چـۆلەكەیێ لـەخۆوە بكـوژێ لـە ڕۆژی قیامــەت دەنگـی بـەرز دەكاتــەوە و دەڵــێ : پەروەردگارم فلاَن كەسە بێ هودە كوشتمی نەك بۆ سوودێك .

(بوخاری) گێڕاویەوە : (دخلت امرأة النار في هرة ربطتها فلم تطعمها ولم تدعها فتأكل مـن خشـاش الارض) ، واتـه : ئـافرەتێ چـووە دۆزەخ بـەهۆی بەسـتنەوەی پشیلەیێ ، نە خواردنی پێ دەدات ، نە بەڕەڵای دەكات جانەوەری زەوی بخوات .

(ئارثهر فندلای) گیانزان دەنووسێ : (ژیان دەمێنێتەوە ، گیانداران وەکو مرۆڤ دوای مردن دەمێننەوە ، هەموو گیانداریّ بارودۆخێك دایدەپۆشێ ، کە لەگەڵ لەرەلەرو شەپۆلەکانیاندا دەگونجێن[١٨٦] .

بێگومان ژینگەی بەهەشت وەکو ژینگەی زەوی گۆڕان و تێك چوون و بڕانەوە کاری تێ ناکات و بەهرەکانی هەمیشەیی و نەبڕاوەن ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (ان جهنم محیطة بالدنیا وان جنة من وراءها ، فلذلك كان الصراط طریقا الی الجنة) رواه ابو نعیم ، واتە : دۆزەخ دەوری زەوی داوە ، بەهەشت بەدوای ئەودا دەوری دۆزەخی داوە ، بۆیە پردی (الصراط) ڕێگایێکە لە ئەوێوە بۆ بەهەشت.

لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە دەکات گۆی فیزیایی زەوی (٧) گۆی ئاگرینی دۆزەخی دەوری داوە ، (٧) بەرگی بەهەشتیش دەوری ئەو (٧) گۆ دۆزەخەکەی داوە ، بەو پێیە بەهەشت و دۆزەخ لە دەوری زەویدان و وەکو (١٤) گۆی ئەتیری دەوری زەوی فیزیاییان داوە ، مردن تەنیا گواستنەوەیێکە لە جیهانی فیزیایی یەوە بۆ جیهانی ئەتیر.

(ئارتەر فندلای) دەڵێ : مرۆڤ لە لەش و دەروون و گیان پێك دێ ، لەش ئەو لەشەیە خۆمان دەیبینین، دەروون هزرە، گیان لەشی ئەتیرە ، کە پێکاو پێکی لەشی فیزیایی یە ، ئەو لەشمان پێکەوە قایم دەکات ، مردن تەنیا جیابوونەوەی لەشی ئەنتیرە لە لەشی ماددی و ئەو کاتە هزر یان دەروون لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت ، ئەو کاتە لە ڕوانگەی ئەتیرەوە نەك ماددەوە لە گەردوون دەڕوانین و گوێ بە جیهانی ماددی نادرێت ، ئەتیری کە لە ئاسمان ناوی دەبەین ماددەیێکی ڕاستەقینەیەو لەرەلەری پترەو گوێ ی پێ دەدرێ و نەگۆڕە ، هەرچی جیهانی ماددییە هەمیشە لە گۆڕاندایەو

---

[١٨٦] على حافة العالم الاثيري / ج، ارثر فندلاي (ل:٩٥) ت: فهمي ابو الخير.

بەرەو شی بوونەوەو پوکانەوە دەڕوات ، لە جیهانی ئەتیردا لەناوچوون نییە ، هەموو شتێ ڕێك و چەسپیوە[187]).

بەو پێیە مردنی مرۆڤ و گیانداران و ڕووەك تەنیا جیابوونەوەی لەشی ئەتیریانە لە لەشی مادییان و لە ژینگەی فیزیایی یەوە بەرەو ژینگەی میتا فیزیکی دەچن. ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ . لەشی ئەتیر (گیان) وەکو پێشەوا (جەعفەری صادق) (سەلامی خوای لەسەر) فەرموویەتی : (لو كنت تراه لقلت هو هو) ، واتە : گەر گیان ببینی دەڵێ کت و مت کەسەکە خۆیەتی !

(جلال الدين المحلي) لە (تفسير الجلالين) دا و (امام الحرمين) وەکو (السيوطي) لە (شرح الصدور) دا باسی کردووە : (گیان لە شێکی ناسکی نورانی یە کاتێ چووە بەر لەش زیندووی دەکات).

بە ویستی خودا لە بەشی پێنجەمی ئەم زینجرە ئیعجازییە باسی گیان و جیهانی میتافیزیکاو ژیانی دوای مەرگ دەکەین بەناوی (گەردوونی نادیار) لەوێدا دەسەڵێ مردن لەو جیهانەدا لەدایك بوونەوەیە لە جیهانی ئەو دیودا ، بارکردنە لەم ژینگەوە بۆ ژینگەی هەمیشەیی و جاویدانی .

**( دوا وشـــــــــــــــــــه )**

ئەوەی لێرەدا خوێندمانەوە دوو ڕاستی گەورەمان بۆ دەردەخات ، ئەویش ئەوەیە کە خوداوەندی شکۆدار دوو بەهرەی (نیعمەت) هەرە مەزنی پێداوین لە زەوی دا ، گەر مرۆڤ هەر لەساتی دروست بوونی زەمینەوە تا پەسلان تەمەنی خۆی لە سوپاسکردنییان بباتە سەر هێشتا نەیتوانیوە بە ئەندازەی هەناسەیێك شوکرانە

---

[187] على حافة العالم الاثيري / ج، ارثر فندلاي / ت: فهمي ابو الخير / ل: ٢٥.

بژێری ئەوە بێت ، کە شایانیانە ، ئەو دوو بەهرانەش بریتین لەو ژینگەیەو ئایینی ئیسلام . خودای پەروەردگار ئیسلامی کردۆتە فەرمانڕەوا بەسەر سروشت و مرۆڤەوە ، هەردوولای پێکەوە سازاندوون بەمەستی بەختەوەر کردن و خۆش گوزەرانی ئادەمیزاد .

پاشان ژینگەزانی گرنگترین بابەتە ، مرۆڤایەتی لەگەڵ لەدایك بوونیدا سەرقاڵی کردووەو بۆتە خەمی و گرنگی پێداوە ، چونکە ئەو دایکەیە تێیدا دروست بووەو گەشەی تێ کردووەو تێیدا ژیاوە ، چاوگەکانی ژیان و مانەوەی بووە ، بەو مانایەی مرۆڤ سەرداری گیاندارانە لە زەویدا ، خوداوەند تەواوی پێك هاتەکانی ژینگەی بۆ ڕام کردووە بۆسەدکردنی پێداویستییەکانی ژیانی بەو مەرجەی بە باشترین شێوە بەکاریان بێنێ و زیادەڕەوی نەکات تێ ی داو دەستی کاوڵ کاری بۆ نەبات و هاوسەنگی یەکەی تێك نەدات .

پاشان لە زنجیرە ئیعجازەکەماندا لە بەشی یەکەمدا (١٥٠) ئیعجازی قورئانیمان خستەڕو ، کە زانستی نوێ دوای (١٠٠٠) ساڵ پتر دوای دابەزینی قورئان پەی پێ بردوون ، دوایی لە زنجیرەی دووەمدا زیاتر لە (٢٠٠) ئیعجازی جیۆلۆجیمان باسکرد ، لە زنجیرەی سێ یەمدا زیاتر لە (٥٠) ئیعجازی گەردیلە زانیمان خستەڕو ، لەم بەشەشدا زیاتر لە (٨٠) ئیعجازی ژینگەزانیمان خستۆتە بەردەم خوێنەران و مامۆستایان و قوتابیان و خولیایانی ئیعجازی ، بە تێرو تەسەلی پڕمان کردووە لە ئایەت و زانستی ژینگەیی ، کە لە ئاستی ئەواندا بێت ، وەکو خزمەتێ بە پرۆژەی زانستی ئیعجازی و گەلی کوردمان ، بەو هیوایەی سوودی هەبێ بۆ هەموو تاکەکان و لە مەیدانی کرداری پراکتیك بکرێت و ڕۆشنبیرییەکی گشتی لە ڕاست ژینگەدا بە هەمووان ببەخشێت.

پاشان تا زیاتر تێ بگەین قورئان موعجیزەی ئیسلامەو دەستوری ژیانە و پەڕاوی خوایە بۆ مەردوومەکان تا لەمەیدانی کرداریدا سوودی لێ وەربگرن و بەشداری بکات

لـه هـەموو مەیدانـەکانی ژیانیانـدا ، لەوانـەش مەیـدانی ژینگـەیی بـه هـەموو ڕەهەندەکانییەوە ، چونکە قورئانە بەردی بناغەی دادەنێ بۆ بنیات بیر کردنەوەکان و دارشـتنی زاتـی مرۆڤـداو لـه نەخشەکێشانی ڕەفتـارو ڕێکخسـتنی چـالاکی گشـتی مرۆڤایەتی دا ، قورئان ئەو کانیاوەیە مرۆڤی موسلّمان سەرچاوەی لێوە دەگرێ بۆ بنیـات نـان و بـیرو بـاوەڕو بۆچـوونەکانی و تـاوتوێ کـردن و چـینی چـوار چـێوەی ژینگەکەی و دروست کردنی ، پـردی پەیوەنـدی لەگـەڵ سروشـت و کردگارەکەیـدا ، بەجۆرێك ئەو بـەگوێ کردنـەی قورئـان ببێتـە بەندایـەتی بەنـدەکان بـۆ خـودا ، کـه تاکەکانی موسلّمان و کۆمەڵگاکەی جیا بکاتەوە لە تاکەکان و کۆمەڵگاکانی تری غەیرە موسلّمان ، چونکە بەختەوەری و کامەرانی مرۆڤ لەوەدایە مرۆڤ بیرو بڕواو شەریعەت و زانست و فەلسەفەو عیرفانی خۆی لـه قورئـان وەربگرێت ، لـه ڕێگای قورئانـەوە ڕۆشنبیرییەکانی خۆی دابمەزرێنێت ، کە باشترین ڕۆشەنبیرییەو زانست و فەلسەفەو عیرفـانیش تـەنیا میکـانیزمێکن بـۆ خزمـەت کـردن بـه قورئـان و ڕافـه کردنـی نێوەرۆکەکەی .

دوای ئـەوە مرۆڤـی موسـلّمان دوای بینینـی ئـەو ئیعجـازە گـەردوونی و زەمینـی و گەردیلـەیی و ژینگەییانـەی قورئـان زیـاتر لـه (١٤٠٠) سـاڵ لەمەوبـەر پێشـکەش بـه مرۆڤایەتی کردوون و مرۆڤایەتی نوێش دوای چەرخی تەکنەلۆژیاو زانستی پراکتیکی و مانـدووبوونێکی زۆر دەسـتی پـێ گەیشـتوون و سـەلماندوونی و زانسـتەکانی خـۆی لەسەر ئەو پرەنسیپانە دامەزراندووە دڵنیاتر دەبێ ، ئەم قورئانە موعجیزەی خودایە بۆ دەستووری ژیانە ، بۆ ڕێنوماکردنی مرۆڤایەتی هاتووە ، تا مرۆڤایەتی لـه سـایەی ئەودا کێشەکانی خۆی چارەسەر بکات ، لەوانەش کێشە ژینگەییـەکان ، کـه مـرۆڤ لـه داهاتوودا تێی دەکەوێت و ژیانی دەخاتە مەترسییەوە ، بەبێ گەڕانەوەشی بۆ قورئان ناتوانێ بەسەر ئەو کێشەیەدا زاڵ بێت و ئارامی و ساغی بـۆ ژینگەکـەی بگێڕێتـەوەو هاوسەنگی پێ بداتەوە .

گەرنا چۆن مرۆڤێکی نەخوێندەواری وەك (محمد) (ﷺ) پەی بەو هەموو زانستە جۆراو جۆرانە بردووە ، لەسەردەمی نەزانیدا گریمان گەورەترین بلیمەتی سەردەمی خۆشی بووبێت؟ هەتا ئەوانەی بە نەیاری قورئان و غەیرە موسڵمانیش لە زانایان و فەیلەسوفان دانیان بەوە داناوە قورئان موعجیزەیەو عەقڵی بەرزترین زانای لە ئاستدا دێتە خوارەوە .

**چەند نموونەیێك :-**

(١) (جان دیفن بورد) نووسەری کتێبی (الاعتذار الی محمد والقرآن) دەڵێ : (قورئان بە تەواوی لە هەموو کەم و کورییەك دوورە ، پێویستی بەکەمترین ڕاست کردنەوە نییە ، مرۆڤ لەسەرەتاوە تا کۆتایی دەیخوێنێتەوە بێ ئەوەی هەست بە هیچ بێزارییەك بکات .

(٢) گەورە (شاعیری ئەڵمانی گۆتە ) دەنووسێ : ( ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێتەوە سەرەتا هەست بە قورسایی دەکات لە دەستەواژەکانی دا ، بەلاّم زۆر ناڕوات هەست بەسەرنج ڕاکێشان دەکات بەرەو قورئان ، پاشان بە خۆنەویستی بەرەو جوانی سەرنج ڕاکێشی کەمەند کێشی دەکات) !

ساڵانێ بوو کەشیشەکان ئێمەیان لە حاڵی بوون لە ڕاستی یەکانی قورئانی موقەددەس دوور خستبۆوە ، هەروەها لە مەزنی پێغەمبەر (محمد) ﷺ ، بەلاّم هەتا هەنگاومان هەڵهێنا بۆ سەر ڕێگای تێگەیشتنی زانستی پەردەی نەزانی و دەمارگیری لەبەر چاومان هەڵماڵرا ، داهاتوو ئەو کتێبە بێ وێنەیە سەرنجی جیهان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و دەبێ بە تەوەری هزری مرۆڤایەتی).

(٣) (ویل دیورانت) خاوەنی (قصة الحضارة) و (قصة الفلسفة) دەنووسێ : (قورئان سەر بڵندی و دادگەری و تەقوای لەدەروونی بڕوادارلندا ڕوواند ، وێنەی ئەوە لە هیچ بەشێکی جیهاندا نییە).

(٤) بیر تیژی فەرەنسی (جول لابوم) لە کتێبی (تفصیل الایات)دا دەنووسێ : (زانست لەسەر دەستی موسڵمانان بلاّوبۆوە لە جیهاندا ، موسڵمانان زانستەکانیان لە

قورئان وەرگرت ، کە دەریای زانستی یە ، چەندان رووباری لیّ هەڵبەستراو بەرەو جیهان راکشان) .

(٥) خۆرهەلاّتناسی بەریتانی (دینورت) دەڵێ : ( پێویستە دان بەوە دابنێین زانستە سروشتیەکان و گەردوونی و فەلسەفی و بیرکارییەکان ، کە ئەورووپای گرتەوە ، ئەوانە بە گشتی لە بەرەکەت و فەرەکانی زانستەکانی قورئانەوەن ، ئێمە قەرزداری موسڵمانانین ، بەڵکو ئەورووپا لەو روانگەوە بەشێکە لە وڵاتانی ئیسلام).

(٦) دکتۆرە (لورا واكسیا واطلیری) مامۆستا لەزانكۆی نابولی لە كتێبی (تقدم الاسلام السریع)دا دەڵێ : ( ئێمە لەم كتێبەدا چەندان خەزێنە دەبینین لە زانستەكان لە سەرووی ئاستی گەورەترین زیرەك و فەیلەسوف و پیاوی سیاسی و یاساییەوەیە ، بۆیە ناشێ قورئان كردەی دەستی مرۆڤێكی فێر كراوی مامۆستا بێت[١٨٨]).

بەم شێوەیە قورئان موعجیزەی پێغەمبەرە (ﷺ) لەسەرووی ئاستی هزرەكانی مرۆڤایەتییەوەیەو تا ئێستا هیچ كەسێك نەیتوانیوە خۆی لەقەرەبدات ، یان ئایەتێ بنووسێ شان لە شانی ئایەتە قورئانییە موعجیزەیی یەكان بدات .

قورئان نەمرە ، بۆ هەموو جیهانەو دیواری زەمان و شوێنی بڕیوە ، چۆن خەزێنەكانی بۆ خەڵكی سەردەمی نەزانی هەڵرشتووە بۆ ئێمەشی هەڵرشتووە ، لەبەر بەرز بوونەوەی ئاستی زانستیدا ئەم موعجیزانەش گەورەتر بوون و بازنە جیهانیەكەی فراوانتر بووە ، ئاینەكی جیهانیش دەبێ ، خاوەنی ئەو بەڵگەنامە جیهانی یە نەمرەیە بێت ، تاوەكو بەو موعجیزانە ململانێی هزری هاوچەرخ بكات و بەڵگەی پێغەمبەرایەتی (ﷺ) بەجیهان بسەلمێنن ، بۆ ئەوەی دونیای نقوم لە شەوەزەنگی نەزانی جارەكی تر لە تاریكی یەوە بەرەو روناكی ببات و كۆتایی بەو بێ

---

[١٨٨] الامثل في تفسير كتاب الله المنزل / العلامة الفقية الشيخ ناصر مكارم الشيرازي / ج١/ ل:١٠٧-١٠٨.

سەرو بەرییەکانی مرۆڤی نەزانی بێنێت ، کە دوای لادان لە ئایین تێ ی کەوتووە ، چارەسەریشی گەڕانەوەیە بۆ دین ، کە ئیسلامەو مۆرکی ئاینەکانە ، ناچاریشە بۆ ئەو گەڕانەوەیە.

(کریسی موریسون) لە کتێبی (العلم یدعوا للایمان)دا دەڵێ : (بەبێ ئایینی شارستانی لات دەبێ ، ڕێکی دەگۆڕێ بە شڵە ژاوی ، هەموو جڵەوێ لەدەست دەدات و خراپە دەسەڵات بەسەر جیهاندا دەگرێت ، بۆیە پێویستە بڕوا بە بوونی خودا بێنین).

بە قورئان دەتوانین جارەکی تر هاوسەنگی بۆ زەوی بگێڕینەوەو کێشە ژینگەییەکان چارەسەر بکەین و ئەمن و ئاسایش بۆ مەردووم بگێڕینەوەو ئاشتەوایی لە نێوان مرۆڤ و ژینگەدا دروست بکەینەوە و لە جیهاندا کۆتایی بە شەڕو خراپە بێنین .

شایەنی باسکردنە لەکاتی کۆتایی هێنان بەم بابەتە لە (٢٠١٠/٦/٧) دا لە گوندی چیوە ئاگرێکی فراوان ئەم ناوچەیەی گرتەوەو ئاگر لە دارستانی چیاکانی بەربوو ، ئاگرەکە لە کونە فلوسەوە هات ، خەڵکی گوند سەرەتا خۆی لێ بێ خەم کرد ، بەدرەنگەوە هەواڵ بە پۆلیسی دارستان گەیشت ، دوای ئەوەی هاتن ئەوانیش لەگەڵ هەندێ لەخەڵکی گونددا بەشدارییان کرد لە ئاگر بڕەکەدا ، دوای ئەوەی ئاگرەکەیان کوژاندەوە ئێوارە گەڕانەوە ، بەڵام سەر لەنوێ ئاگرەکە سەری هەڵدایەوەو فراوانتر پەرەی سەندو زیانێکی ژینگەیی گەورەی لەو گوندەو دەوروبەریدا ، دارو درەخت و زیندەوەرێکی زۆری لەناوبرد ، تا ئەو کاتەی ئەم بابەتە دەنووسم هەر بەردەوامە ، بەڵام بەداخەوە پۆلیسەکان جل و بەرگی تایبەتی ئاگر کواژندنەوە یان نەپۆشی بوو ، هیچ ئامێرێکی ئاگر کوژاندنەوەیان پێ نەبوو ، کەچی زیاتر لەمەش کوردستان وەکو وڵاتانی تری جیهان ، پێویستی بە فڕۆکەی تایبەتی بۆ کوژاندنەوەی ئاگری دارستانەکان و پاراستنی ژینگەی کوردستان هەیە ، من لە نزیکەوە لەگەڵ

ئەفسەرەکەیان قسەم کردو ئەم تێبینییانەمان باسکرد ، وتی : ئەم داواکارییانەمان پێشنیار کردووە بە دەزگای بەرپرسەوان گوتویانە فرۆکەی تایبەتی ئەوەمان نیە .

باسمان کرد پێویستە حکومەت سووتەمەنی دابین بکات ، تا خەڵکی دار نەبڕن ، پاشان باسمان کرد کە پێویستە پۆلیسی دارستانەکان ئەرکەکانی چڕو پڕ تر بکات و زیاتر قۆڵ هەڵماڵی بۆ پاراستنی دارستانەکان و گیاندارانی کێوی و لێ پرسینەوەی توند بکەن لەگەڵ ئەوانەی بەدەستی ئەنقەست ئاگر دەخەنەوەو زیانی ژینگەیی و ئابووری لە کوردستان دەدەن .

بەڕاستی ئەو ڕۆژە گوندی (چیوە) دوکەڵ دایگرتبوو ، سەر چیاکانی و ئاسمانی ئەو ناوچەیە هەورو تەمێکی ڕەش دایپۆشی ، دیمەنی جوانی ئەو ناوچەیەی بە تەواوی ناشرین کرد ، کە یەکێکە لەناوچە جوان و فێنکەکانی کوردستان ، بێگومان کوردستان بەهەشتی خوایە لە زەویدا ، جێگای باب و باپیرانی کورد بووە لە دێرینەوە ، شوێنی ئادەم و نوح و ابراهیم و یونس و دەیان پێغەمبەر بووە ، هەر لەو دەڤەرەدا لافاوی نوح هات و گۆڕانێکی گەورەی ژینگەیی دروست بوو (سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێت)، دوای ئەوەی خەڵکەکەی ڕوو لە ئاین وەردەگێڕن و دەست دەکەن لە کوفرو خراپەکاری ، هەر لەو دەڤەرەشدا یونس پێغەمبەر (ﷺ) هات و خەڵکی لەسەر دەستی ئەو تۆبەیان کرد ، دەستبەرداری کوفرو خراپەکاری بوون ، لەجیاتی سزادان خوای گەورە لێی بوردن و بەزەیی و گوشادی بەسەردا باراندن قورئان فەرموویەتی : (فلولا كانت قرية ...يونس) (يونس ٩٨) .

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی بە گەلی (نوح علیە السلام) قَالَ تَعَالَى: أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ

ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾ ﴾

**ئێمەش چارەنووسمان لەبەردەستی خۆماندایە ، ئایا لە کوردستاندا چارەنووسی گەلی نوح (علیه السلام) هەڵبژێرین یان چارەنووسی گەلی یونس (علیه السلام) ؟!**

**(وصلى الله على سيدنا محمد سيد الانبياء والمرسلين واله الطاهرين واصحابه الى يوم الدين)**

**چیوەی سەرو/خۆشناوەتی**

**٢٠١٠/٦/٨**

## سەرچاوەكان


١. القرآن الكريم.
٢. تفسير الطبري / ابن جرير الطبري.
٣. تفسير الكبير / للرازي.
٤. الجواهر في تفسير القرآن الكريم – جواهر الطنطاوي .
٥. در المنثور / جلال الدين السيوطي.
٦. الامثل في تفسير كتاب الله المنزل / مكارم الشيرازي.
٧. مفردات الراغب.
٨. معجم البحرين / للطريحي.
٩. لسان العرب / ابن منظور.
١٠. كەمالنامە / كمال جلال غريب / سلێمانی ٢٠٠٢.
١١. علم الارض / الك سمث / ت فارس لطفي الخوري / بغداد / ١٩٨٧.
١٢. الانسان والبيئة ، ام هولى / ت: عصام عبداللطيف / بغداد / ١٩٧٩.
١٣. التربية و البيئة/ د.عادل مشعان ربيع ، د.هادي شعبان / دار عالم الثقافة / ٢٠٠٧.
١٤. طبيعة الانسان / د.اشلي مونتاكو / ت: د.احمد حسن الرحيم.
١٥. بناء الكون ومصير الانسان / هشام طالب / دار المعرفة.
١٦. جيولوجيا البيئة / ادوارد كيلر / ت: غسان محمد البستي /١٩٨٢ جامعة الصلاح الدين / ط٣.
١٧. مباديء علم البيئة/بريج كوبال/ت:د.ريزان محمد صالح/ ١٩٩/جامعة صلاح الدين.
١٨. الدليل في تثقيف الصحي / د.منصف المرزوقي / بغداد /١٩٨٦.
١٩. العلم يدعوا للايمان / كريسي موريسون/ ت: محمد صالح الفلكي.
٢٠. الطب الوقائي في الاسلام / د.عمر محمد عبدالله / بغداد /١٩٩٠.
٢١. آيات الاعجاز العلمي / عبدالرحمن سعد صبي الدين ، دار المعرفة/٢٠٠٨.
٢٢. علوم الارض والبيئة للهواة / خير شاهين / دار المسيرة /ط١/٢٠٠٥.

٢٣. الله يتجلي في عصر العلم / جون كلوفر مونسا / ت: محمد جمال الدين فندا.
٢٤. الموسوعة الكونية الكبرى / د.ماهر احمد الصوفي / المكتبه العصريه.
٢٥. الموسوعة العلمية في اعجاز القرآن الكريم والسنة النبوية المطهرة / د.هاني مرعي .
٢٦. الموسوعة الذهبية /د.احمد مصطفى المتولي ، دار ابن الجوزي / القاهرة.
٢٧. السماء في القرآن الكريم / د.زغلول النجار / دار المعرفة.
٢٨. الارض في القرآن الكريم / د.زغلول النجار / دار المعرفة.
٢٩. الحيوان في القرآن الكريم / د.زغلول النجار / دار المعرفة.
٣٠. مدخل الى دراسة المجاز العلمي / د. زغلول النجار / دار المعرفة.
٣١. الشفاء في القرآن الكريم / د.محمد الهادي / نوبليس.
٣٢. آيات الله في الافاق / د.محمد راتب النابلسي / دار المكتبي.
٣٣. العالم في مطلع قرن ٢١ / العميد الدكتور سامي ريحانا / نابلوس / ط١ /٢٠٠٩.
٣٤. كنوز العلم / وليم فرجارا / ت: السيد رمضان هدارة / بغداد /١٩٨٧.
٣٥. موجز تاريخ الكون / هاني رزق / دار الفكر.
٣٦. الزلازل والبراكين/٥ د.ايمن الاسكندراني / مكتبة ابن سينا.
٣٧. على حافة العالم الاثيري / د.ارثر فندلاي / ت:فهمي ابو الخير.
٣٨. في صحة المجتمع / د.عبدالحسين بيرم / بغداد /١٩٨٠.
٣٩. آثار العصرالجليدي البلاستوسيني في كردستان/هـ.ا. رايت/ ت: فؤاد حمة خورشيد.
٤٠. التوازن في الاسلام / محمد علي الشخيري.
٤١. اسراف وتبذيرتبا هي سرماية ها/ د.ناصر رفيعي محمدي.
٤٢. النسبية بين نيوتن وانشتاين / د.طالب ناهي الخفاجي.
٤٣. دليلك الى اقليم كردستان/ سردار محمد عبدالرحمن/هوشيار محمدامين خوشناو .
٤٤. قضايا الفقه والفكر المعاصر/ د.وهبة الزحيلي.
٤٥. موسوعة العلم الفلك / عماد مجاهد/ بيروت / ٢٠٠٢ / ط١.
٤٦. أخطاء التمدن في التغذية / د.امين رويحة/ بيروت – لبنان.
٤٧. الكرد و كردستان / ارشاك سافراستيان/ ت: د.احمد محمود الخليل.

# ناوەرۆک

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |